# مانگی شەوی چواردە

ڕوونکردنەوەی

## ﴿قَصِيدَةَ الْبُرْدَةَ﴾

ناسراو بە

## ﴿بُرْدَةُ الْمَدِيح﴾

لِلإمام مُحَمَّد الْبُوصِيرِي


دانانی

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی



چاپی یەکەم

ربیع الثانی-(١٤٣٤)ی کۆچی

ڕەشەمێ-(٢٧١٣)ی کوردی

شباط-(٢٠١٣)ی زایینی

# مانگی شەوی چواردە

## ڕوونکردنەوەی

# ﴿ قَصِیدَةُ الْبُرْدَةِ ﴾

## ناسراو بە

# ﴿ بُرْدَةُ الْمَدِیحِ ﴾

لِلإمام مُحَمَّد الْبُوصِیرِي


داناني

**عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی**



**چاپی یەکەم**

ربیع الثانی-(١٤٣٤)ی کۆچی

ڕەشەمێ-(٢٧١٣)ی کوردی

شباط-(٢٠١٣)ی زایینی

ژمارەی سپاردنی (٢٣٤) ساڵی (٢٠١٣) لە بەڕێوەبەرایەتیگشتی کتێبخانە گشتیەکان، دراوەتێ

**ناوی کتاب:** مانگی شەوی چواردە * ڕوونکردنەوەی (قَصِيدَة الْبُرْدَة).
**بابەت:** ستایشی پێغەمبەرﷺ.
**دانەر:** عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی.
**نۆبەتی چاپ:** یەکەم.
**بەرواری چاپ:** (١٤٣٤)کۆچی-(٢٧١٣)کوردی-(٢٠١٣)زایینی.
**تیراژ:** (٥٠٠٠) دانە.
**بڵاوکەرەوە:** م: ٠٧٥٠ ٣٤٧١١٩٣
**چاپخانە:** ڕۆژهەڵات، لە هەولێر.

---

****************************************

****************************************

---

## دانــراوەکــانــی تری دانــەر:

١- ڕوونکردنەوەی (متن فتح القريب).
٢- ڕوونکردنەوەی (الأربعين النواويّة).
٣- عەقیدەی ئیسلامی لە سەر ڕارەوی (أهل السنة والجماعة).
٤- هۆنراوەی (ئیمانو ئیسلام).
٥- چەند گوڵێك لە (گوڵزاری ئیسلام).
٦- ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبين) لە پێنج بەرگدا.
٧- ڕوونکردنەوەی (قطر العارض في علم الفرائض).
٨- چۆنیەتی (حەج و عومرە).
٩- مێرگ و گوڵزاری بەهار * ژیانی پێغەمبەری ڕێزدارﷺ.
١٠- ڕوونکردنەوەی ﴿العقيدة الطحاوية﴾.

بسم الله الرحمن الرحيم

# پـێـشـەكـی

اَلْحمْدُ للّه نسْتعينُهُ ونَسْتغْفرُهُ، ونَعُوذُ به منْ شُرُور أَنْفُسنا، مَنْ يهْد اللهُ فلاَ مُضلَّ لَهُ، ومنْ يُضْللْ فلاَ هاديَ لهُ، وَأشْهدُ أن لاَّ إله إلاّاللهُ وَحْدَهُ لاشَريكَ لهُ وَأشْهدُ أَنَّ مُحَمَّداً عبْدُهُ وَرسُولُهُ، اَللّهُمَ صَلّ عَلى مُحمَّد وَعلَى آل مُحَمَّد كَمَا صَلَّيْتَ عَلى إبْراهيمَ وَعَلَى آل إبْراهيم في الْعَالمينَ، إنَّكَ حَميدٌ مَجيدٌ، وسَلّمْ تَسْليماً كَثيراً.

ئەی موسوڵمانی ڕێزدار، شتێكی ئاشكرایە: پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لە هەموو دروستكراوێكی خوا گەورەترە، لە لای خوای گەورەش لە گشت ڕێزدارێك ڕێزدارترە، ئیمانی هیچ ئیماندارێكیش تەواو نابێ، تا پێغەمبەریﷺ خۆشتر دەوێ لە خۆی و دایك و باوكی و گشت خەڵكی تر.

جا كەسێك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا مەدحی كردبێ، كەسێك گەورەی هەموو پێغەمبەران بێ-صلى الله عليهم أجمعين-، هەموو پێغەمبەران -صلى الله عليهم أجمعين- لە ژێر ئاڵای ئەو دابن لە ڕۆژی قیامەت، كەسێك یەكەم كەس بێ دەرگای بەهەشتی بۆ بكرێتەوە، بێگومان بەندەیەكی هەژار ناتوانێ بە تەواوی مەدحی بكا و مافی گەورەیی بداتێ و باسی ڕێزداریی بكا.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوەﷺ– تا ئێستاش– شاعیرانی ئیسلام بەگوێرەی توانینی خۆیان مەدحی پێغەمبەریان ﷺ كردوە و خۆشویستنی پێغەمبەریانﷺ ئاشكرا كردوە، خوا پاداشتی چاكەیان بداتەوە.

جا یەكێك لەو شاعیرانە: ئیمامی (الْبُوصِیرِي)یە، كە لە (قَصِیدَةالْبُرْدَة)=(بُردَةُالْمَدِیح)=(بُرْدَةُالْبُوصیرِي)دا زۆر بە ڕێكوپێكی مەدحی پێغەمبەریﷺ كردوەو هەر شتێكیشی لە مەدحی پێغەمبەرﷺ فەرموبێ، بەڵگەی شەرعیی لە سەرە.

جا لەبەر ئەوەی ئیمامی (الْبُوصِیرِي) ئەم (قَصِیدَة)یەی بە دڵێكی بێگەرد داناوە، بۆیێ لە دونیادا بڵاو بۆتەوەو لە ناو دڵی موسڵماناندا جێی خۆی كردۆتەوەو بە ئاوازی جۆراوجۆر لە بۆنەكاندا دەیخوێننەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كەسانێكی دڵ نەخۆش هەنە: ڕقیان لەم (قَصِیدَة)یە دەبێتەوە، هۆیەكەشی ئەمەیە: یان لە واتەكەی تێنەگەیشتون، یان خۆشویستنی پێغەمبەرﷺ

له دڵیاندا جێگیر نەبوە؟ چونکە پێغەمبەریانﷺ بە تەواوی نەناسیوەو لە خەیاڵی خاودا پاڵیان داوەتەوە.

جا هەر ئەوش بووەتە هۆی ئەوەی: ئەوان ئیمامی (البُوصِيري)ی دانەری ئەم قەسیدەیە، بە (مُشْرِك) دادەنێن، هەم ئەو کەسانەش بە (مُشْرِك) دادەنێن کە ئەم قەسیدەیە دەخوێننەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان شیاوترن پێیان بگوترێ: (مُشْرِك)؟ چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إنّ ممّا أتخوَّفُ علَيْكُمْ رجُلٌ قرأَ الْقُرْآنَ حتَّى إذا رُئيَتْ بَهْجَتُهُ علَيْه، وكانَ رداؤُهُ الْإسْلامَ إعْتراهُ إلَى ما شاءَ اللهُ، فَانْسَلَخَ مِنْهُ وَنَبذَهُ وَراءَ ظَهْرِه، وَسَعَى علَى جارِه بالسَّيْف وَرَماهُ بالشِّرْك. قُلْتُ-أيْ الرّاوِي-: يا نَبِيَّ الله، أيُّهُما أوْلَى بالشِّرْك، الْمَرْمِيُّ أمِ الرّامِيُّ؟ قالَﷺ: بَلِ الرّامِيُّ﴾ حديث صحيح رواه ابن حبان وأبويعلى بإسناد جيد، وذكره الإمام ابن كثير في تفسير سورة الأعراف، الآية: ١٧٥، بەڕاستی یەکێك لەو شتانەی دەترسێم بێتە سەرتان: پیاوێکە قورئانی خوێندبێ، تا ئەو کاتەی جوانیی قورئانی بە سەردا دەدیترێ‌و ئیسلام دە بێتە پۆشاكو جوانبوونی، چاکەی ئیسلامی بە سەردا دێ تا خوا حەز دەکا، جا پیاوەکە لە ئیسلام دێتە دەرەوەو فڕێی دەداتە پشتەوەی و ڕا ئەکاتە سەر دراوسێی خۆی بە شمشێر و بە (شِرْك) جنێوی دەداتێ= پێی دەڵێ: تۆ (مُشْرِك)ی! (ڕاوی) دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ کامەیان شیاوترە بە (شِرْك) جنێوی بدرێتێ= پێی بگوترێ: (مُشْرِك)، جنێودەرەکە، یان جنێوپێدراوەکە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵکو جنێودەرەکە شیاوترە.

جا بۆ ئەوەی منیش بەرەکەتێکی پێغەمبەرمﷺ پێبگا و بە شەفاعەتی وی شاد ببم لە ڕۆژی قیامەت، هەم بۆ ئەوەی گەلی کوردیش لە واتەی (قَصِيدَة)کە تێبگا و شارەزای ڕێزداریو گەورەیی پێغەمبەرﷺ ببێ، ناوی خوام لێهێنا و دەستم کرد بە ڕوونکردنەوەی (قَصِيدَةالبُرْدَة)ی ئیمامی (البُوصِيري)، بە شێوەیەکی کورتی وەها: کە خوێندەواری سەرەتاییش لە مەبەستەکەی تێبگا، بۆیێ ناوم لە ڕوونکردنەوەکەم نا:

## ﴿مانگی شەوی چواردە، ڕوونکردنەوەی قەسیدەی (البُرْدَة)﴾

جا لە بەر ئەوەی جاران ئەم (قَصِيدَة البُرْدَة)یە لە (اَلأزْهَر)دا دەخوێندرا، بۆیێ تکا لە ماموٚستایانی ڕێزدار دەکەم: ئەم ڕوونکردنەوەیە بە قوتابیان بڵێن؟ تاکو زانستی (عَقِيدَة)= بیروباوەڕ و ڕۆشنبیرییان زیاتر ببێ.

جا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم (قَصِيدَةالبُرْدَة)یە سودم لەم سەرچاوانە وەرگرت:

١- (عصيدة الشهدة ، شرح قصيدة البُرْدَة) للعلامة عمر الخرپوتى.

٢- (شرح قصيدَة البُرْدَة) للشيخ زاده.

٣- (الزبدة فى شرح البُرْدَة) للشيخ خالد الأزهرى.

٤- (شرح البُرْدَة) للامام الباجورى.

٥- (الشرح الفريد فى بردة النَّبِيِّ الحَبيب) للشيخ محمد عيد الحسينى.

٦- (الشرح المتوسط على البُرْدَة) للشيخ ابن مقلاش الوهرانى.

٧- (النفحات الشاذلية شرح البُرْدَة البُوصيرية) للشيخ حسن الحمزاوى.

٨- (العمدة في شرح البُرْدَة) للسيد ابن عجيبة الحسينى.

٩- (بردة البُوصيري بين عُقود النَّظم وحُلل التَّحليل) تأليف طارق الرفاعى.

جا ئەو سەرچاوانەش جارى وا هەيە: لە ڕوونكردنەوەكەيان تێك دەكەنەوە، هەندێ جاريش لێك جياوازن، جا بۆ ئەوەى ڕوونكردنەوەكەم زۆر درێژ نەبێ، من تەنها ڕوونكردنەوەى يەكێكيان هەڵدەبژێرم، مەگەر شوێنەكە پێويستى بە زياتر لە ڕوونكردنەوەيەك هەبێ، ئەو كاتە زياترەكەش دەنووسم و باسەكە پێك دێنم.

ئيتر لە خواى گەورە دەپاڕێمەوە: يارمەتيم بدا بۆ تەواوكردنى بە شێوەيەكى ڕاست، بمپارێزێ لە هەڵەو لە لادان لە ڕێگەى ڕاست، آمين.

عبدالله عبدالعزيز هەرتەلى

هەولێر – كوردستان

## ﴿ پێناسەى ئيمامى (البُوصيري)و دانانى (قصيدة)كەى ﴾

ئيمامى (البُوصيري) ناوى (محمد) كوڕى (سَعيد) كوڕى (حَماد) كوڕى (مُحْسِن) كوڕى (عبدالله)يە، لە ڕۆژى سێشەممە، سەرەتاى مانگى (شوال)ساڵى (٦٠٨) شەش سەدو هەشتى كۆچى، لە (مصر) لە ناوچەى (دَلاص) لە دايك بووە، لە ساڵى (٦٩٤) شەش سەدو نەوەدو چوارى كۆچى لە (الإسكندرية) وەفاتى كردوەو گۆڕەكەشى هەر لە (الإسكندرية)يە.

ئەم بەڕێزە زانايەكى شەرعزان و شاعير بوو، بە پێشەواى شاعيرانى ئيسلام داندراوەو بە (البُوصيري) بەناوبانگە –(بُوصير) شارۆچكەيەكە لە شارۆچكەكانى (مصر)– جا چەند زانايەكى بەناوبانگيش لە لاى ئيمامى (البُوصيري) خوێندويانە، وەك:

ئيمام (أبو حيان الأندلسي) خاوەنى تەفسيرە بەناوبانگەكەى (البحر المحيط).

هەم ئیمام (ابن سید الناس) خاوەنی (السیرة)=ژیاننامە بەناوبانگەکەی پێغەمبەرﷺ ناسراو بە (عُیون الأثر).

هەم ئیمام (عزالدّین بن جماعة) قازی و زانا بەناوبانگەکەی مەزهەبی (الشافعی) لە (مصر)...چەند زانای تریش.

## ﴿ هۆی دانانی (قصیدة الْبُرْدَة) ﴾

ئیمامی (الْبُوصیري) فەرمویەتی: پێشتر چەند (قَصیدَة)یەکم لە مەدحی پێغەمبەرﷺ دانابون: وەك (الْمُضَريَّة)و (الْهَمْزِيَّة)، ئینجا نەخۆشی (فالج)=ئیفلیجیم تووش بوو و نیوەی جەستەم لە کار کەوت و چارەی نەکرا، جا بۆ چارەی نەخۆشیەکەم بیرم لە دانانی ئەم (قصیدَة)یە کردەوە، جا کە تەواوم کرد، بە خاتری (قَصیدَة)کە لە خوا پاڕامەوە: شیفام بدا.

جا گریام و شەوێك خەوتم، لە خەونمدا پێغەمبەرمﷺ دیت و دەستە پیرۆزەکانی بە سەر جەستەکەمدا هێنا و پەشتەماڵەکەی لێ وەرپێچام، جا یەکسەر لە خەوەکەم بە ئاگا هاتم و هەستم کرد شیفام بۆ هاتووە و توانای هەڵسانم هەیە.

ئیمامی (الْبُوصیري) فەرمویەتی: جا لە سەرەتای رۆژێ‌دا لە ماڵەوەم چومە دەرەوەو لە رێگەدا (الشیخ أبوالرجاء)م گەیشتێ-کە پیاوچاکێکی هەژار بوو – پێی گوتم: ئەو (قَصیدَة)یەی لە کاتی نەخۆشیدا داتناوە بمدەیێ. منیش گوتم: چۆن بەم (قصیدَة)یەت زانیوە؟ گوتی: دوێنێ گوێم لێبوو– واتە: لە خەونمدا– لە لای پێغەمبەرﷺ (قَصیدَة)کە دەخوێندراوەو پێغەمبەریشﷺ خۆی بەم لاو بەو لادا دەهەژاند. ئیمامی (الْبُوصیري) فەرمویەتی: جا منیش (قَصیدَة)کەم دایێ و ئەویش ڕووداوەکەی باس کرد و خەونەکە لە ناو خەڵکی‌دا بڵاو بۆوەو چەند کەسانێکی تر (قَصیدَة)کەیان بۆ شیفا هاتن بە کار دەهێنا.

## ﴿ بایەخ پێدانی (قَصیدَة الْبُرْدَة) ﴾

**بزانە:** ئیمامی (الْبُوصیري) ناوی لە (قَصیدَة)کەی نابوو: (الْكَواكِبُ الدُّرِّيَّة فِي مَدْحِ خَيْرِ الْبَرِيَّة)ﷺ. بەڵام لە ناو خەڵکی‌دا بە ناوی (قَصِيدَةُ الْبُرْدَة)و (بُرْدَةُ الْمَدِيح)و (بُرْدَةُ الْبُوصِيرِي) بڵاو بۆتەوە، چونکە لە خەونەکەدا پێغەمبەرﷺ (بُرْدَة)= پەشتەماڵەکەی خۆی لێ وەرپێچاوە، هەروەك باسمان کرد.

جا (قَصیدَة الْبُرْدَة) بە جۆرێکی وەها لە دونیادا بڵاو بۆتەوە: وەرگێڕدراوەتە سەر زمانەکانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا و ئیفریقی، وەك: (کوردی)و (فارسی)و

(إنگليزى)و (فرنسى)و (إسپانى)و (ألمانى)و (ڕوسى)و (صينى)و (أُردى)و (بربرى)و چەند زمانێكى تر.

هەروەها زۆر لە زانایانی ئاينيش (شَرْح)ى (قَصيدَةالبُرْدَة)یان كردووەو زۆريش كردويانە بە پێنج خشتەكى و بە حەفت خشتەكى، بە جۆرێكى وەها: ژمارەى (شَرْح)ەكانى گەیشتۆتە (١٢٠) سەدو بيست (شَرْح)، بەڵام من تەنها نۆ (شَرْح)م كردونەتە سەرچاوەى ئەم ڕوونكردنەوەيە.

هەروەها ژمارەى پێنج خشتيەكانى گەیشتۆتە (٧٠) حەفتا، هەم ژمارەى حەفت خشتيەكانى گەیشتۆتە (١٢) دوانزە، هەروەك (طارق الرفاعي) ئەوها ڕوونى كردۆتەوە، خوا پاداشتى چاكەى بداتەوە.

* * *

## ﴿ ناسنامەيەكى كورتى پێغەمبەرﷺ ﴾

١- **نەژادى پێغەمبەرﷺ**: ﴿(مُحمَد)ﷺ كوڕى (عَبْدالله) كوڕى (عَبْدالْمُطَلب) كوڕى (هاشم)...تا دەگاتە (إسْماعيل) پێغەمبەرﷺ كوڕى (إبْراهيم) پێغەمبەرﷺ﴾.

٢- **دايكى پێغەمبەرﷺ**: (آمنَة) كيژى (وَهْب)ى (الزُّهْري).

٣- **داپيرەكانى پێغەمبەرﷺ**: **دايكى باوكى**: ناوى (فاطمَة)يە.

**دايكى دايكى**: ناوى (برَّة)يە.

٤- **لەدايكبوونى پێغەمبەرﷺ**: ڕۆژى دووشەممەى (١٢) دوانزەى مانگى (رَبيع الأوَّل) ساڵى (فيل) بەرامبەر (٢٠) بيستى مانگى (نيسان) ساڵى (٥٧١) پێنجسەد حەفتاو يەكى زايينى لە شارى (مَكّة)دا لە دايك بوو.

٥- **بەخێوكردنى پێغەمبەرﷺ**: پێغەمبەرﷺ هەر لە زگى دايكىدا بوو باوكى وەفاتى كرد، تەمەنى بووە شەش ساڵ دايكى وەفاتى كرد، تەمەنى بووە هەشت ساڵ باپيرى وەفاتى كرد، جا (أُبوطالب)ى مامى بەخێوى كرد، ئينجا لە تەمەنى (٢٥) بيستوپێنج ساڵىدا بۆ يەكەم جار ژنى هێنا: كە ناوى (خَديجَة)ى كيژى (خُوَيْلد) بوو.

٦- **بوونى بە پێغەمبەرﷺ**: كە تەمەنى بووە چل ساڵ، لە ڕۆژى دووشەممەى (١٧) حەڤدەى مانگى ڕەمەزان، بەرامبەر (١) يەكى (شُباط)ى ساڵى (٦١٠) شەشسەدو دەى زايينى، لە ئەشكەوتى (حراء)ى شارى (مَكّة)، لە لاى خوا قورئانى بە (وَحْي) بۆ هاتو بووە پێغەمبەرﷺ، واتە: يەكەم جار–لە قورئانى پيرۆز– سەرەتاى سورەتى ﴿إقْرأْ باسْم رَبِّك...﴾ تا ﴿ما لَمْ يَعْلَمْ﴾، بە (وَحْي) لە لاى خواوە

بۆی هات، ئینجا بە ماوەی (٢٣) بیستو سێ ساڵان هەموو قورئانی بۆ هات.

**٧- (الإسراء والمعْراج)=شەوڕۆیی پێکردنی و سەرکەوتنی بۆ ئاسمانەکان:**

لە شەوی هەیی ی (٢٧) بیستو حەفتی مانگی (رَجَب) ساڵی دوانزەی پێغەمبەرایەتی، لە بەشێکی شەویدا، پێغەمبەرﷺ بە گیان و بە جەستەوە بە سواری بوڕاق چووە (ألْمَسْجِدالأقْصی) لە (فَلَسْطِین)، جا لەوێش بەرز کراوە بۆ هەر حەفت ئاسمانەکانو لە هەمان شەودا گەڕاوە بۆ (مکّة)ی پیرۆز.

**٨- کۆچکردنی بۆ (مدینة):** پێغەمبەرﷺ سێزدە ساڵان لە (مکّة)دا پێغەمبەرایەتی کرد، ئینجا لە (٢) دووی مانگی (ربیع الأوّل) ساڵی سێزدەی پێغەمبەرایەتی، بەرامبەر (٢٠) بیستی (أیلول) ساڵی (٦٢٢) شەشسەدو بیستو دووی زایینی لە (مکّة) کۆچی کرد بۆ (مَدینة)، جا لە ڕۆژی دووشەممەی (١٢) دوانزەی (رَبیع الأوّل) ساڵی (١)یەکەمی کۆچی، بەرامبەر بە (٣٠) سی (أیلول)ی ساڵی (٦٢٢) شەشسەدو بیستو دووی زایینی گەیشتە (مدینَة)ی پیرۆز.

**٩- وەفاتکردنی پێغەمبەرﷺ:** جا (١٠) دە ساڵیش لە (مَدینة) پێغەمبەرایەتیی کرد، ئینجا لە ڕۆژی دووشەممەی (١٢) دوانزەی (رَبیع الأوّل) ساڵی (١١) یازدەی کۆچی، بەرامبەر (٨) هەشتی (حزیران) ساڵی (٦٣٣) شەشسەدو سی و سێی زایینی لە شاری (مَدینَة) وەفاتی کرد، جا هەر لە (مدینَة) لە ماڵەکەی خۆی لە ژوورەکەی حەزرەتی (عائشَة)دا بە خاك سپێردرا، ئێستا ژوورەکەی گۆڕی پێغەمبەرﷺ کەوتۆتە ناو مزگەوتەکەی خۆی لە (مَدینَة)، ئیمام (أبوبکر)و ئیمام (عُمر)ش رضی الله عنهما لەو ژوورەدا نێژراون، نێوان ئەو ژوورەو نێوان مینبەرەکەی پێغەمبەرﷺ، پێی دەگوترێ: (الرَّوْضَة) مێرگی بەهەشت.

**١٠-تەمەنی پێغەمبەرﷺ:** گوتمان: کە تەمەنی بووە چل ساڵ، بووتە پێغەمبەرﷺ، ئینجا (٢٣) بیستو سێ ساڵان پێغەمبەرایەتیی کرد: سێزدە ساڵ لە (مکّة)، دە ساڵیش لە (مدینَة)، جا کە وەفاتی کرد تەمەنی (٦٣) شەستو سێ ساڵ بووﷺ.

**١١- هاوسەرەکانی پێغەمبەرﷺ:** کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، نۆ ژنی لە پاش بەجێمان: حەزرەتی (سَوْدَة)، حەزرەتی (عائشَة)، حەزرەتی (حَفْصَة)، حەزرەتی (أُمّ سَلَمَة)، حەزرەتی (زَیْنَب)، حەزرەتی (جُوَیْرِیَة)، حەزرەتی (أُمّ حَبیبَة)، حەزرەتی (صَفیَّة)، حەزرەتی (مَیْمُونَة)رضی الله عنهن.

هەروەها دوو ژنی تریشی هەبون، بەڵام ئەوان لە ژیانی خۆیدا وەفاتیان کرد:

حـەزرەتی (خَدیجَـة الْكُبْـرَى)و حـەزرەتی (زَيْنَـب بِنْـت خُزَيْمَـة) رضـي الله عنهمـا. هەروەها حەزرەتی (رَيْحانَة)و حەزرەتی (مارِيَة الْقِبْطِيَّة)ش-رضي الله عنهما-كەنیزەی بون، جا ئەم (مارِيَة)یە دایکی (إِبْراهيم)ی کوڕی پێغەمبەرەﷺ.

١٢- **منداڵەکانی پێغەمبەرﷺ** : سێ کوڕی هەبون: (الْقاسِم)و (عبدالله)، ئـەم دووانـە لـە تەمـەنی منـداڵیدا لـە (مَكَّـة) وەفاتیـان کـرد، هـەروەها (إِبْـراهيم)ش لـە تەمـەنی منداڵیدا لە (مَدِينَة) وەفاتی کرد.

هەم چوار کیژی هەبون (رُقَيَّة، زَيْنَب، أُمُّ كَلْثُـوم، فاطِمَـة)رضي الله عنهن ئەوانەش-جگـە لـە حـەزرەتی (فاطِمَـة)- لـە سـەردەمی پێغەمبـەرداﷺ لـە (مَدِينَـة) وەفاتیـان کـرد، حەزرەتی (فاطِمَة)ش شەش مانگ دوای وەفاتی باوکی، لە (مَدِينَة) وەفاتی کرد، جگە لـە (إِبْـراهيم) هـەموو منداڵـەکانی لـە حـەزرەتی (خَدیجَـة) بـون، بـەڵام (إِبْـراهيم) لـە حەزرەتی (مارِيَةالْقِبْطِيَّة) بوو، هەروەك باسمان کردﷺ.

١٣- **شـیردەرەکانی پێغەمبـەرﷺ** :بـە بـەردەوامی و بـە تـەواوی: حـەزرەتی (حَلِيمَـة السَعْدِيَّة)-رضي الله عنها- شیری داوەتێ، مـاوەی سـێ ڕۆژانـیش دایکیخـۆی شـیری داوەتـێ، هـەروەها (ثُوَيْبَـة)و (عاتِكَـة)ش-پـێش حـەزرەتی (حَلِيمَـة السَّـعْدِيَّة)-چـەند ڕۆژێـك شیریان داوەتێ.

١٤- **خوشـكو برایـەکانی پێغەمبـەرﷺ** : لـە نـەژاددا خوشـكو بـرای نـەبون، بـەڵام لە شیردا: برا شـیریەکەی نـاوی (عبـدالله)یـە، خوشـکە شـیریەکانی ناویـان (شَـيْماء)و (أَنيسَة)یە، کە هەرسێکیان منداڵی (حَلِيمَة السَّعْدِيَّة)نە، مێردی (حَلِيمَة السَعْدِيَّة) نـاوی (الحـارِث) بـوو، کـە باوکـە شـیریی پێغەمبـەرەﷺ، ئەوانـە هـەموویان موسـوڵمان بونﷺ، هەروەها لە لایەن (ثُوَيْبَة)ش: (مَسْرُوح)ی کـوڕی (ثُوَيْبَـة)و ئیمـام (حَمْـزَة)ی مامی خۆی برای شیری بونﷺ.

١٥- **مامەکانی پێغەمبەرﷺ** : دوانـزە مـامی هـەبون: (اَلْحـارِث، قُـثَم، الزُّبَيْـر، حَجْـل، ضِرار، اَلْمُقوَّم، أَبُولَهَب، الْعَبّاس، حَمْزَة، أَبُوطالِب، الْغَيْداق، عَبْـدُ الْكَعْبَـة). جـا لـە وانـە تەنها ئیمام (الْعَبّاس)و ئیمام (حَمْزَة)رضي الله عنهما موسوڵمان بون.

١٦- **خاڵەکانی پێغەمبەرﷺ** : یەکەم: (عُمَيْر) کـوڕی (وَهْـب). دووەم: (عَبْـدُ يَغُـوث) کوڕی (وَهْب). سێیەم: (الأَسْود) کوڕی (وَهْب).

١٧-**پورەکانی پێغەمبەرﷺ** : **خوشکەکانیباوکی**: (أُمُّ حَکیم، عاتِكَـة، بَـرَّة، أَرْوَى،

أُمَيْمَة، صَفِيَّة). جا لەوانە تەنها حەزرەتی (صَفِيَّة) موسوڵمان بووە رضي الله عنها.

**خوشکی دایکی:** (فُرَيْعَة بِنْت وَهْب).

**١٨- ژمارەی هەموو (صَحابَة)کانﷺ:** کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، ژمارەی (صَحابَة)کان–ئافرەتو پیاو–(١٢٤٠٠٠) سەدو بیستو چوار هەزار (صَحابَة) بونﷺ، وەك ژمارەی پێغەمبەرانی خوا عليهم الصلاة والسلام.

**١٩- ژمارەی (صَحابَة)کانی حەدیسگێڕەوەﷺ:** کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، (١١٤٠٠٠) سەدو چواردە هەزار (صَحابَة)ی حەدیسگێڕەوە لە دوای بەجێمانﷺ، گشتیان گوێیان لە پێغەمبەرﷺ بووەو حەدیسەکانیان گێڕاونەوە، هەروەك ئیمام (ابن الصَّلاح) لە (مقدمة علوم الحديث)دا فەرمویەتی.

* * *

## ﴿ سەلەوات لێدان لە سەر پێغەمبەرﷺ ﴾

لە بەر ئەوەی لە دوای گشت (بَيْت)ێکی ئەم (قَصِيدَة)یە، سەلەواتەکەی (مَوْلايَ صَلِّ وَسَلِّمْ دائماً أَبَداً)ی داهاتوو دەگوترێتەوە، بۆیێ پێشەکی باسێکی کورتی سەلەوات لێدان لە سەر پێغەمبەرﷺ دەنووسم:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾الأحزاب: ٥٦، بەراستی خودا و (مَلائِكَة)ی خوا سەلەوات لە سەر پێغەمبەرﷺ لێدەدەن، ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، سەلەوات لە سەر پێغەمبەرﷺ لێبدەنو سەلامی لێبکەن.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿رَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ﴾ حديث حسن رواه الترمذي، زەلیل بێ ئەو کەسەی لە لای وی باسم دەکرێ=گوێی لە ناوی من دەبێو سەلەواتم لە سەر لێنەدا.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿الْبَخِيلُ الَّذِى مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ﴾ حديثٌ صحيحٌ رواه الترمذي، بەخیل=ڕەزیل ئەو کەسەیە لە لای وی باسم دەکرێ=گوێی لە ناوی من دەبێو سەلەواتم لە سەر لێنەدا.

**جا بزانە:** لە ئایەتەکەدا چۆنیەتیو کاتو شوێنی سەلەوات دیاری نەکراوە، کەوابوو: لە هەر کاتێكو لە هەر شوێنێکدا–بە دەنگی نهێنی، یان بە دەنگی ئاشکرا– بە هەر ڕستەیەك مرۆڤ سەلەوات لێبدا، خێری سەلەواتەکەی دەگاتێو لەو زەمکردنەش ڕزگاری دەبێ، هەروەك زانایانی ئیسلام لە دوای ناوهێنانی پێغەمبەرﷺ نووسیویانە:

(صلَّى الله عَلَيْه وَسَلَّمَ). كەواتە: سەلەواتەكەی (مَوْلاي صلِّ وَسَلِّم)ی داهاتووش، هەمان بڕیاری بۆ دەدرێ.

بەڵام ئەم سەلەواتە -كە لە دوای تەحیاتی نوێژ دەگوترێ- لە هەموویان خێرترە: ﴿اللَّهُمَّ صلِّ على مُحمَّد وعلى آل مُحمَّد كما صَلَّيْتَ على إبْراهيمَ وَآل إبْراهيمَ، وَبارِكْ على مُحمَّد وَعلى آل مُحمَّد كما بارَكْتَ على إبْراهيمَ وَآل إبْراهيمَ -في الْعالَمينَ- إنَّـكَ حميدٌ مَجيدٌ﴾ رواه الإمام الشافعي والبخاري ومسلم، واللفظ للشافعي إلاّ (في العالَمين) فلمسلم.

## ﴿ خێری سەلەوات لێدان لە سەر پێغەمبەرﷺ ﴾

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صلاةً صَلَّى اللهُ عَلَيْه بها عَشْــراً﴾ رواه مسلم وأصحاب السنن، هەر كەسێك سەلەواتێكم لە سەر لێبدا، خوای گەورە بەو سەلەواتە دە سەلەواتی لە سەر لێدەدا، واتە: دە ڕەحمەتی بۆ سەر دەنێرێ.

هەروەها ﴿عَنْ أُبَيٍّ رضي الله عنه قُلْتُ: يا رسُولَ الله إنِّي أُكْثِرُ الصَّلاةَ عَلَيْكَ فَكَمْ أَجْعَلُ لَكَ مِـنْ صلاتي؟ فقال: مَا شِئْتَ. قُلْتُ: الرُّبعَ؟ قالﷺ: مَا شِئْتَ فإنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْــرٌ لَــكَ. قُلْتُ: النِّصْفَ؟ قالﷺ: ما شِئْتَ فإنْ زِدْتَ فهُوَ خَيْرٌ لَكَ. قُلْتُ: فالثُّلُثَيْنِ قالَﷺ: مَـا شِئْتَ فَإنْ زِدْتَ فهُوَ خَيْرٌ لكَ. قُلْتُ: أَجْعَلُ لَكَ صلاتي كُلَّها. قالﷺ: إذًا تُكْفَى هَمَّكَ وَيُغْفَرُ لَكَ ذَنْبُكَ﴾ حديثٌ صحيحٌ رواه الإمام أحمد والترمذي، حەزرەتی (أُبَيّ) رضي الله عنه فەرمویەتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا من زۆر سەلەوات لە سەر تۆ لێدەدەم، ئایا چەند لە كاتەكانی زیكر و دوعایەكانم دابنێم بۆ سەلەوات لە سەر تۆ؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: چەندی بەخۆت حەز دەكەی. گوتم: چوارێكی كاتەكانم دابنێم؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: چەندی بەخۆت حەز دەكەی، جا ئەگەر زیادی بكەی ئەوە بۆ تۆ باشترە. گوتم: نیوەی كاتەكانم دابنێم؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: چەندی بەخۆت حەز دەكەی، جا ئەگەر زیادی بكەی ئەوە بۆ تۆ باشترە. گوتم: دوو سێیەكی كاتەكانم دابنێم؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: چەندی بەخۆت حەز دەكەی، جا ئەگەر زیادی بكەی ئەوە بۆ تۆ باشترە. گوتم: هەموو كاتەكانی زیكر و دوعایەكانم دادەنێم بۆ سەلەوات لە سەر تۆ. پێغەمبەرﷺ فەرموی: جا كە وابێ: كاروباری دونیاو قیامەتت دەدرێتێو بۆت جێبەجێ دەبێو لە گوناهت دبوردرێ.

هەروەها سوننەتە: لە شەو و ڕۆژی هەینیدا زۆر سەلەوات لە سەر پێغەمبەرﷺ لێبدا، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إنَّ منْ أفْضَلِ أَيّامكُمْ يوْمَ الْجُمُعَة...فأَكْثِرُوا عَلَــيَّ منَ الصَّلاة فيه فإنَّ صَلاتَكُمْ مَعْرُوضةٌ عَلَيَّ. قالُوا: وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلاتُنا عَلَيْــكَ وَقَــدْ

أَرِمْتَ؟ فَقَالَﷺ: إنّ اللهَ حَرَّمَ على الأَرْضِ أَجْسادَ الأَنْبِيـــاءِ﴾رواه أبوداود والنسائي وغيرُهما بأسانيد صحيحة، له هەموو ڕۆژەکانتان گەورەتر: ڕۆژی (جُمُعَة)يە، کەوابوو: لە ڕۆژی (جُمُعَة)دا زۆر سەڵەواتم لە سەر لێبدەن، چونکە لە (جُمُعَة)دا- سەڵەواتەکانتان دەهێندرێتە بەرچاوم لە ناو گۆڕەکەمدا گوێم لێدەبێ. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ چۆن سەڵەواتەکانی ئێمە دەهێندرێتە بەرچاوت؟ خۆ لاشەی جەنابت لە گۆڕەکەتدا ڕزیوە! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوای گەورە لە زەمینی قەدەغە کردوە: لاشەی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام بڕزێنێ.

## ﴿ سەڵەوات لێدان: لە سبەینان و ئێواران و لە دوای نوێژەکان ﴾

١-پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿مَنْ صَلَّى عَلَيَّ حِينَ يُصْبِحُ عَشْراً، وَحِينَ يُمْسي عَشْراً، أَدْرَكَتْهُ شَفاعَتي يَوْمَ الْقِيامَة﴾رواه الطبراني بإسناد جيد، هەر کەسێك کە دەگاتە کاتی سبەینە دە سەڵەواتم لە سەر لێبدا و کە دەگاتە کاتی ئێوارە دە سەڵەواتم لە سەر لێبدا، ئەو کەسە شەفاعەتی منی دەگاتێ لە ڕۆژی قیامەت.

٢-﴿عَنْ فُضالَةَ: دَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى فَقالَ: اَللّهُمَّ اغْفِرْلي وَارْحَمْني، فَقالَ رَسُولُ اللهِﷺ: عَجِلْتَ أَيُّهاالْمُصَلّي؟ إذا صَلَّيْتَ فَقَعَدْتَ. فَاحْمَدِاللهَ بِما هُوَ أَهْلُهُ وَصَلِّ عَلَيَّ ثُمَّ ادْعُــهُ﴾ رواه اصحاب السنن بسندصحيح، پیاوێك هاتە مزگەوت و نوێژی کرد و دوعای کرد و گوتی: خوایە لێم خۆش ببەو ڕەحم پێ بکە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی نوێژکەر پەلەت کرد، هەر کاتێك نوێژت کرد جا دانیشتی، سوپاسی خوا بکە بەو سوپاسەی شایانی گەورەیی خوایە-وەك (اَلْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعالَمِين)-و سەڵەوات لە سەر من لێدە-وەك (وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أجمعين)- ئینجا دوعا بکە.

**ئینجا بزانە:** بە تەنها یەك سەڵەوات لە پێش دوعادا فەرمانی ئەو حەدیسە بەجێ دەهێندرێ، بەڵام ئەگەر زیاتر بێ، خێری زۆرترە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَوْلَى النّاسِ بي يَوْمَ الْقِيامَة أَكْثَرُهُمْ عَلَيَّ صَلاةً﴾ رواه ابن حبان والترمذي وقال: حديث حسن، نزیکترین کەس لە من لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کەسەیە: کە زۆرتر سەڵەواتم لە سەر لێبدا. کەوابو: بە بەڵگەی ئەم دوو حەدیسە، ئەو دە سەڵەواتەی ئێستا لە دوای نوێژەکان لێدەدرێن کارێکی باشە.

ئینجا لە کۆتایی دوعاکردنیشدا: هەم سوپاسی خوا و هەم سەڵەواتیش سوننەتن، هەروەك ئیمامی (النّواوي) لە (الأذكار)دا فەرموویەتی.

* * *

## ﴿ اَلْفَصْلُ الأوَّلُ: فِى الْغَزَلِ وَشَكْوَى الْغَرام ﴾

اَلْحَمْدُ للّه مُنْشِى الْخَلْقِ مِنْ عَدَمِ * ثُمَّ الصَّلاةُ عَلَى الْمُخْتارِ فِى الْقِدَمِ

مَوْلاىَ صَلِّ وَسَلِّمْ دائماً أَبَداً * عَلَى حَبِيبِكَ خَيْرِ الْخَلْقِ كُلِّهِمِ

## ﴿ اَلْفَصْلُ الأوَّلُ: فِى الْغَزَلِ وَشَكْوَى الْغَرام ﴾

### ﴿ بەشى يەكەم: لە باسى پێداهەڵگوتن و سكاڵاى خۆشەويستى ﴾

(اَلْحَمْدُ لِلّه) سوپاس و ستايش بۆ ئەو خوايەى (مُنْشِى الْخَلْقِ) پەيداكەرى ئەم خەڵكەيە (مِنْ عَدَمِ) لە نەبوونەوە (ثُمَّ الصَّلاةُ) ئينجا درود و ڕەحمەتى خوا (عَلَى الْمُخْتارِ) بڕژێتە سەر پێغەمبەرى بژاردە لە ناو پێغەمبەران و-صلى الله عليهم اجمعين-لە ناو خەڵكى تريشدا، پێغەمبەرﷺ فەرمويەتى: ﴿إنَّ اللهَ اصْطَفى كَنانَةَ مِنْ وَلَدِ إسْماعيل، وَاصْطَفى قُرَيْشاً مِنْ كنانَةَ، وَاصْطَفى مِنْ قُرَيْشٍ بَنِى هاشِمٍ، وَاصْطَفانى مِنْ بنى هاشِمٍ﴾ رواه مسلم والترمذي، خواى گەورە لە نەتەوەكانى (إسْماعِيل)پێغەمبەرﷺ (كِنانَة)ى هەڵبژارد، لە (كِنانَة)ش (قُرَيْش)ى هەڵبژارد، لە (قُرَيْش)ش (بَنِى هاشِم) هەڵبژاردن، لە (بَنِى هاشِم)ش منى هەڵبژارد.

(فِى الْقِدَمِ) لە پێشتردا، واتە: لە دێرینەوە پێغەمبەرێكى بژاردەيە، هەروەك پێغەمبەرﷺ بەخۆى فەرمويەتى: ﴿كُنْتُ نَبِيّاً وَآدَمُ بَيْنَ الرُّوحِ وَالْجَسَدِ﴾حديث صحيح رواه الإمام أحمد والبيهقي، من لە لاى خوا پێغەمبەر بوم، هێشتا باب (آدَم)ﷺ گيانى نەهاتبووە ناو لاشەكەى.

(مَوْلاىَ) ئەى خوداى من (صَلِّ وَسَلِّمْ) ڕەحمەت و سەلام بنێرە-(دائِماً أَبَداً) بە بەردەوامى هەتاهەتايى-(عَلَى حَبِيبِكَ) بۆ سەر پێغەمبەرە خۆشەويستەكەتﷺ، پێغەمبەرﷺ فەرمويەتى: ﴿إنَّ اللهَ اتَّخَذَنِى خَليلاً كَما اتَّخَذَ إبْراهِيمَ خَلِيلاً﴾رواه مسلم، خواى گەورە منى كردۆتە دۆستى خۆى، هەروەكو (إبْراهِيم) پێغەمبەرىﷺ كردۆتە دۆستى خۆى. واتە: دۆستايەتى بەرزترين پلەى خۆشويستنە.

(خَيْرِ الْخَلْقِ) ئەو پێغەمبەرەى چاكترينى هەموو خەڵكە (كُلِّهِمِ) بە تێكڕايى، پێغەمبەرﷺ فەرمويەتى: ﴿إنَّ اللهَ خَلَقَ الْخَلْقَ فَجَعَلَنِى فِى خَيْرِ خَلْقِهِ، وَجَعَلَهُمْ فِرْقَتَيْنِ فَجَعَلَنِى فِى خَيْرِ فِرْقَة، وَخَلَقَ الْقَبائِلَ فَجَعَلَنِى فِى خَيْرِ قَبِيلَةٍ، وَجَعَلَهُمْ بُيُوتاً فَجَعَلَنِى فِى خَيْرِهِمْ بَيْتاً، فَأَنَا خَيْرُكُمْ بَيْتاً وَخَيْرُكُمْ نَفْساً﴾حديث حسن أخرجه الإمام أحمد والترمذي والبيهقي، خواى گەورە بوونەوەرى دروست كرد، جا منى خستە ناو چاكترينى

دروستکراوی خۆی، خوای گەورە دروستکراویخۆی کردە دوو چین، جا منی خستە ناو چاکترین چین، خوای گەورە بەرەبابەکانی دروست کردن، جا منی خستە ناو چاکترین بەرەباب، خوای گەورە بەرەبابەکانی کردنە بنەماڵە، جا منی خستە ناو چاکترین بنەماڵە، کەوابوو: من لە هەمووتان چاکترم لە ڕووی بنەماڵەو لە ڕووی کەسایەتیەوە.

**جا بزانە:** هەر چەند سەرچاوەکان فەرموویانە: ئەو دوو (بَیْت)ەیڕابردوو، لە (قَصِیدَةَ الْبُرْدَة) ناژمێردرێن. بەلاّم بۆیێ من نووسینمەوە، چونکە لە هەندێ نوسخەی (بُرْدَة)دا هاتون، بۆ نموونە:

**یەکەم:** ئەو (بُرْدَة)یەی لەگەڵ (دَلائِلُ الخیرات)دا لە (بیروت – لبنان) چاپ کراوە لە (المؤسسة الإسلامیة للدّراسات والطباعة).

**دووەم:** لە (تَخْمِیس)= پێنج خشتەکیەکەی (السید إبراهیم حقّي الحسیني الموصلي)دا بەم جۆرە:

بِسْمِ الْإلَهِ مُفِیضِ الْجُودِ وَالْکَرَمِ * بَدْئِی بِمَدْحِي وَتَخْمِیسِي وَمُخْتَتَمِ

اَلْحَمْدُ لِلَّهِ ذِی الْآلاءِ وَالنِّعَمِ * اَلْحَمْدُ لِلَّهِ مُنْشِی الْخَلْقِ مِنْ عَدَمِ

ثُمَّ الصَّلاةُ عَلَى الْمُخْتارِ فِي الْقِدَمِ

مَوْلايَ صَلِّ عَلَى مَنْ أَظْهَرَ الرَّشَدا * مَحَمَّدٍ الْمُصْطَفَى لِلْعالَمِینَ هَدا

مَوْلايَ سَلِّمْ عَلَیْهِ مَا الصَّباحُ بَدا * مَوْلايَ صَلِّ وَسَلِّمْ دائِماً أَبَدا

عَلَى حَبِیبِكَ خَیْرِ الْخَلْقِ کُلِّهِمِ

**جا بزانە:** هەر کاتێك (قَصِیدَةَ الْبُرْدَة) بخوێندرێتەوە، پێویستە لە دوای گشت (بَیْت)ێکی (قَصِیدَة)کە ئەم سەلەواتەی (مَوْلايَ صَلِّ وَسَلِّمْ دائِماً أَبَداً * عَلَى حَبِیبِكَ خَیْرِ الْخَلْقِ کُلِّهِمِ) بخوێندرێتەوە، چونکە کە ئیمامی (الْبُوصِیرِي) لە خەونەکەیدا ئەم (قَصِیدَة)یەی بۆ پێغەمبەرﷺ دەخوێندەوەو گەیشتە (بَیْت)ی (فَمَبْلَغُ الْعِلْمِ فِیهِ أَنَّهُ بَشَرٌ)، پارچەکەیتری بۆ نەهاتو وەستا، جا پێغەمبەرﷺ بۆی تەواو کرد و فەرمووی: (وَأَنَّهُ خَیْرُ خَلْقِ اللهِ کُلِّهِمِ).

جا ئیمامی (الْبُوصِیرِي)ش ئەم پارچەیەی تێکەڵی سەلەوتەکەی کرد و لە کۆتایی گشت (بَیْت)ێکدا دووبارەی دەکردەوە.

أَمِنْ تَذَكُّرِ جِيرانٍ بِذِي سَلَمِ (١) مَزَجْتَ دَمْعاً جَرَى مِنْ مُقْلَةٍ بِدَمِ
أَمْ هَبَّتِ الرِّيحُ مِنْ تِلْقاءِ كاظِمَةٍ (٢) وَأَوْمَضَ الْبَرْقُ فِي الظَّلْماءِ مِنْ إِضَمِ

---

ئینجا ئیمامی (البُوصِيرِي) دەست بە پێداهەڵگوتن دەكا و باسی خۆشویستنی پێغەمبەرﷺ دەكا، بەڵام ناوی ناهێنێ، بەڵكو ناوی شوێنەوارەكانی پێغەمبەرﷺ دێنێو بەخۆی لەخۆی دەپرسێ: ئایا ئەو شوێنەوارانەی پێغەمبەرﷺ بوینە هۆی ئەو گریانو داماویو ڕەنگ زەردیەی توشت بووە؟ بەشێوەیەكی وەها: وەڵامەكەش لە پرسیارەكە دەفامێتەوەو دەفەرموێ:

(أَمِنْ تَذَكُّرِ) ئایا بە هۆی وەبیرهاتنەوەت (جِيرانٍ) ئەو دراوسێیانەی كە (بِذِي سَلَمِ) لە شوێنی درەختی (سَلَم)دا بون:

مەبەستی بە دراوسێكان: پێغەمبەرﷺو (صَحابَة)نەرضي الله عنهم، (ذی سَلَمِ)ش: دۆڵێكە لە نێوان (مَكَّة)و (مَدِينَة) لە نزیك (قُدَيد)، بە درەختی (سَلَم) بەناوبانگە، هەر جارێك پێغەمبەرﷺ لە (مَدِينَة)وە دەڕۆیشتە (مَكَّة)، لەگەڵ (صَحابَة)كانی لە وێ دادەبەزیو لە بن درەختی (سَلَم) دەحەساوە ﴿عَنْ ابن عُمَرَرضي الله عنهما: أَنَّهُ كانَ يَأْتِي شَجَرَةً بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَة فَيَقِيلُ تَحْتَها، وَيُخْبِرُ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ كانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ﴾ رواه البزار، قال الحافظ الهيثمي: ورجاله موثوقون، حەزرەتی (عبدالله)ی كوڕی ئیمامی (عُمَر)رضي الله عنهما دەهاتە لای درەختێك لە نێوان (مَكَّة)و (مَدِينَة)دا، جا لە بن درەختەكە دەخەوتو ڕایدەگەیاند: پێغەمبەرﷺ ئەوهای دەكرد. واتە: لە بن درەختەكە دەخەوتو دەحەساوە.

(مَزَجْتَ) تێكەڵت كرد (دَمْعاً) ئەو فرمێسكەی (جَرَى مِنْ مُقْلَةٍ) لە گلێنەی چاوت هاتە خوارێ (بِدَمِ) لەگەڵ خوێن؟

كەواتە: وەڵامەكەش ئاشكرا بوو: بە هۆی وەبیرهاتنەوەی دراوسێكانی (ذی سَلَمِ) ئەوەندە گریای: تا تێكەڵی خوێنت كرد ئەو فرمێسكەی لە چاوت دەڕژا خوارێ.

ئینجا كە ئیمامی (البُوصِيرِي) ئاماژەی كرد: هۆی گریانەكەی وەبیرهاتنەوەی دراوسێكانی (ذی سَلَم) بوو. ئەم جارەش ئامازە بۆ دوو هۆكاریتری گریانەكەی دەكاو دەفەرموێ:

(أَمْ هَبَّتِ الرِّيحُ) یان هۆی گریانەكەت ئەو بایە بوو كە هەڵیكرد (مِنْ تِلْقاءِ كاظِمَةٍ) لە لای (كاظِمَة)ی پێغەمبەرﷺ: كە شوێنێكە لە نزیك (مَدِينَة)ی پیرۆز، یان مەبەست (رَوْضَة)ی پێغەمبەرەﷺ: كە دەكەوێتە نێوان گۆڕی پێغەمبەرﷺو مینبەرەكەی.

واته: هەر کاتێك بای (صَبا) لە لای خۆشەویستەوە بێ، ئـەوە بیرکردنـەوەی (عاشـق) دەجولێنیێو تووشی شەیدایی‌و گریانی دەکا.

(وَ) یـان هـۆی گریانەکـەت ئـەوە بـوو: (أَوْمَـضَ الْبَـرْقُ) بروسـك بریسـكەی دا (فِـي الظُّلْماءِ) لە شەوی تاریكدا (مِنْ إِضَمِ) لە لای کێوی (إِضَم): کـە لـە نزیـك (مَدینَـة)ی پیرۆزەو بە زۆری پێغەمبەرﷺ بۆ گەشت کردن دەچووە لای ئـەو کێـوە ﴿عَنْ عائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّها سُئِلَتْ عَنِ الْبَداوَةِ؟ فَقالَتْ: كانَ النَّبِيُّﷺ يَبْدُو إِلَى هــذِهِ الـتِّلاعِ...﴾ الحديث، حديث صحيح رواه أبوداود، لەبارەی دەرچوون بۆ دەرەوەی شار، پرسیار لـە حەزرەتی (عائِشَة) رضي الله عنها کرا؟ ئەویش لـە وەڵامدا فەرمووی: پێغەمبەرﷺ دەچـووە دەرەوە بـۆ لای ئەم بەرزاییانەی ئاویان پێدا دێتە خواری.

ئینجا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) بەخۆی دادگای خۆشەویستی بۆ خۆی دادەنێو لە دادگـادا وەك داننەهێنەر ئامادە دەبێو پرسیار لە خۆی دەکا و دەفەرموێ:

(فَما لِعَيْنَيْكَ) چاوەکانت چیان لێهاتووە؟ واتە: ئەگەر دان ناهێنی: کە گریانەکەت بە هـۆی خۆشەویسـتەکەی (ذی سَـلَم)و (کاظِمَـة)و (إِضَـم)ە، ئـەوە چ شـتێك وای لـە چاوەکانت کردوە: (إِنْ قُلْتَ) ئەگەر پێیان بڵێی: (اُكْفُفَا) واز لە گریـان بێـنن، ئـەوان گوێڕایـەڵت نـابن، بـەڵکو (هَمَتـا) زیـاتر فرمێسـك دەڕژێـنن؟ بێگومـان ئـەو هـەموو فرمێسکە زۆرە ئاسەواری وەبیرهاتنەوەی خۆشەویستەکەتە.

(وَ) هەروەها (مـا لِقَلْبِـكَ) چ شـتێك وای لـە دڵەکـەت کـردوە (إِنْ قُلْـتَ) ئەگـەر پـێی بڵـێی: (اِسْتَفِقْ) هەشـیار ببـەوە، ئـەویش گوێڕایـەڵت نـابێ، بـەڵکو (يَهِـمِ) زیـاتر دادەمێنـێو لـە خۆشەویسـتیدا نقـوم دەبـێ؟ بێگومـان ئـەوەش ئاسـەواری وەبیرهاتنەوەی خۆشەویستەکەتە.

بۆیێ زۆربەی (صَحابَة)و (تابِعِين)ﷺ کە پێغەمبەریانﷺ وەبیر دەهاتەوە، ئەوان: یان دەلەرزین، یان ڕەنگیان زەرد دەبوو، یان دەگریان ﴿عَنْ أَنَسٍرضي الله عنه: قالَ أَبُوبَكْرٍ لِعُمَرَ رضي الله عنهما بَعْدَ وَفاةِ رَسُولِ اللهِﷺ: انْطَلِقْ بِنا إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ نَزُورُها كَما كانَ رَسُولُ اللهِﷺ يَزُورُها. فَلَمَّا انْتَهَيا إِلَيْها بَكَتْ، فَقالا لَها: ما يُبْكِيكِ؟ أَمَا تَعْلَمِينَ أَنَّ ما عِنْدَ اللهِ خَيْرٌ لِرَسُولِ اللهِﷺ؟ فَقالَتْ: إِنِّي لا أَبْكِي أَنِّي لا أَعْلَمُ أَنَّ ما عِنْدَ اللهِ خَيْرٌ لِرَسُولِ اللهِﷺ وَلَكِنْ أَبْكِي أَنَّ الْوَحْيَ قَدْ انْقَطَعَ مِنَ السَّماءِ، فَهَيَّجَتْهُما عَلَى الْبُكاءِ فَجَعَلا

يكيان معها ﷺ رواه مسلم، لـه دواى وەفـاتى پێغەمبـەرﷺ، ئيمـام (أبـوبكر) بـە ئيمـام (عُمر)ى رضي الله عنه فەرموو: وەرە بە يەكـەوە بچـينە لاى (أُمّ أيْمَـن) سـەردانى بكـەين، هەروەك پێغەمبەرﷺ لە ژيانىدا سەردانى دەكرد. جـا كـە چـونە لاى، حـەزرەتى (أُمّ أيْمَـن) رضي الله عنها پێغەمبەرىﷺ هاتـەوە بـير و دەسـتى بـە گريـان كـرد، جـا ئـەوانيش فەرموويان: ئەوە بۆ دەگريى؟ ئەدى نازانى ئەوەى لە لاى خودايـە بـۆ پێغەمبـەرﷺ باشترە؟ حەزرەتى (أُمّ أيْمن)ش رضي الله عنها فەرمووى: خۆ من لـە بەر ئەوە ناگريێم كە نازانم ئەوەى لـە لاى خوايە بۆ پێغەمبەرﷺ باشترە، بـەلاّم بـۆيێ دەگـرييێم، چـونكە (وَحْـي) براوەو لـە ئاسمان نايەتە خـوارەوە. جـا بـەم وەبيرهاتنەوەيـە ئەوانيشـى جولاندنـە سـەر گريان، ئيمام (أبوبكر)و ئيمام (عُمر)ش لـەگەلّ حەزرەتى (أُمّ أيْمَـن)داﷺ دەسـتيان بـە گريان كرد.

*حەزرەتى (أُمّ أيْمن) ئەو ئافرەتەيە: كە پێغەمبەرىﷺ لە كاتى منداڵىدا لـە بـاوەش دەكرد، پێغەمبەريشﷺ وەك دايكى خۆى رێزى لێدەنا.*

ئينجـا كـە ئيمـامى (البُوصـيري) لـە دادگـاى خۆشەويسـتىدا نـەيتوانى وەلاّمـى پرسـيارەكەىرابـردوو بداتـەوەو بـێدەنـگ بـوو، وەك دادوەرى دادگايەكـە ڕايگەيانـد: داننەهێنانەت بە خۆشەويستىدا بێسودەو فەرمووى:

(**أيحْسبُ الصَّبُّ**) ئايـا (عاشـق) وەهـا تێئـەگا: (**أنَّ الْحُبَّ مُنْكَتِمٌ**) خۆشەويسـتى پەنهان دەبێو دەشاردرێتەوە (**ما بيْنَ مُنْسجمٍ**) لـە نێـوان ئـەو فرمێسـكەى بـە گـوڕ دەڕژێ (**منْهُ**) لە چاوەكانى وى، هەم (**ومُضْطرمٍ**) لە نێوان دلّى داگيرسـاو بـە ئـاگرى خۆشەويسـتى؟ بێگومـان: ئـەو جـۆرە كەسـەى چـاوى بـە فرمێسـكەو دلّـى شـەيداى خۆشەويستەكەيەتى، ئەگـەر دان بـە خـۆشـەويسـتىدا نەهـێنىٚ، ئـەوە بـە هـەلّـەدا چووەو پىٚى بـاوەڕ ناكرىٚ.

كەوابوو: بە داننەهێنان دەردى وى دەرمان نابىٚ، بـەلّكو دەرمـانى دەردى وى لـە لاى خۆشەويستەكەيەتى ئەگەر لە دونياش بە خزمـەتى شـاد نـەبوبىٚ، ئـەوە لـە قيامەتـدا دەبێتە هاوڕێى وى، هەروەك حەزرەتى (أنس)ﷺ دەگێڕێتەوە: پياوێك پرسيارى لە پێغەمبەرﷺ كرد: كەينىٚ (قيامَة) دىٚ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووى: چ كردەوەيـەكت بـۆ ڕۆژى (قيامَة) ئامادە كردوە؟ پياوەكە گوتى: هيچم ئامادە نەكردوە، بەلاّم خوا و

پێغەمبەری خواﷺ خۆش دەوێن. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿أنْتَ مَعَ مَنْ أحْبَبْتَ﴾ رواه البخاري ومسلم، تۆ لە قیامەتدا لەگەڵ ئەو کەسە دەبی کە لە دونیادا خۆشت ویستووە.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصیري) لە دادگای خۆشەویستیدا بەخۆی رایگەیاند: داننەهێنانەکەی هەڵەیەو بێسوودە. ئەم جارە وەك دادوەری دادگایەکە بەڵگەی لە سەر ئەو راستییە هێناوەو فەرمووی:

(**لوْلا الْهوى**) ئەگەر بە هۆی خۆشویستنی خۆشەویستەکەت نەبوایە، ئەوە (**لَمْ تُرِقْ دَمْعاً**) فرمێسکت نە دەرژاند (**علَى طَلَلٍ**) لە سەر کاولە خانووەکانی وێرانبووی خۆشەویستەکەت.

واتە: ئەو خانووانەی لە (مَكّة)ی پیرۆزدا بە هۆی کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ وەك وێرانبوویان لێهات. یان مەبەستی: شاری (مَكّة)ی پیرۆزە؟ چونکە ئەویش بە هۆی کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ وەك وێرانبووی لێهاتو کەوتە دەست کافرەکان، تا رزگار کرا و بووە (دارُالإسْلام)، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لا أُقْسِمُ بِهذا الْبلدِ * وَأنْتَ حِلٌّ بِهذاالْبلدِ﴾ البلد: ١و٢، سوێند دەخۆم بەم شارەی (مَكّة)، لەو حاڵەتەی تۆ-ئەی پێغەمبەرﷺ- لەم شارەدا نیشتەجێی.

واتە: بۆیێ (مَكّة) رێزدارەو شیاوی سوێند پێخواردنە، چونکە پێغەمبەرﷺ تێیدا نیشتەجێیە، هەروەك لە (تفسیرالبیضاوي)و چەند تەفسیرێکیتردا ئەوها راڤەکراوە.

واتە: هەرچەند شاری (مَكّة) بە هۆی (كَعْبَة)=(بَیْت الله)و چەند هۆیەکیتر رێزدار بووە، بەڵام بە (إجْماع)ی زانایانی ئیسلام: پێغەمبەرﷺ لە (كَعْبَة)=(بَیْت الله) رێزدارترە، هەروەك لە روونکردنەوەی (یا أکْرم الْخلْق)دا بەڵگەی بۆ دێنین، إن شاء الله تعالی.

(و) هەروەها ئەگەر بە هۆی خۆشویستنی خۆشەویستەکەت نەبوایە (**لا أرِقْتَ**) لە شەوێدا خەو لە چاوەکانت نە دەرەویەوە (**لِذكْرِ الْبان**) بە هۆی وەبیرهاتنەوەی درەختەکەی (الْبان): کە درەختێکی بۆنخۆشەو لە نزیك (مَكّة)ی پیرۆزە، پێغەمبەرﷺ لە بنی دادەنیشتو قسەی لەگەڵ (صَحابَة)کانﷺ دەکرد.

(و) هەروەها خەو لە چاوەکانت نەدەرەویەوە بە هۆی (**الْعلَم**) وەبیرهاتنەوەی کێوە درێژەکەی خۆشەویستەکەت کە کێوی (حراء)، یان (ثَوْر)، یان (أبُوقُبَیْس)ە، کە

فكَيْفَ تُنْكِرُ حُبّاً بَعْدَما شَهِدتْ (٦) بِهِ عَلَيْكَ عُدُولُ الدَمْعِ والسَّقَمِ
وأَثْبَتَ الْوَجْدُ خَطَّيْ عَبْرَةٍ وضَنَى (٧) مِثْلَ الْبَهَارِ عَلى خَدَّيْكَ والْعَنَمِ

هەرسێکیان لە (مَكَّة)ی پیرۆزن، یان کێوی (اُحُد)ە لە (مَدينَة)ی پیرۆز، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿اُحُدٌ جبلٌ يُحبُنا ونُحبُّهُ﴾ رواه البخاري ومسلم، (أُحُد) کێوێکە ئێمەی خۆش دەوێ‌و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصيري) لە دادگای خۆشەویستی‌دا هەر سوور بوو لە سەر داننەهێنان بە خۆشەویستی‌دا، وەك دادوەری دادگا لەخۆی توند کرد و لۆمەی خۆی کرد لە سەر سووربوون‌و نکۆڵی کردن، جا ئەم جارە دادوەر هیچ مۆڵەتێکی‌تری نەدایێ‌و بڕیاری دادگای بە سەردا سەپاند و فەرمووی:

(**فكَيْفَ**) چۆن ئەم جارە (**تُنْكِرُ حُبّاً**) ئینکاری ئەو خۆشەویستی‌یە بەهێزە دەکەی (**بَعْدَما شَهِدتْ**) پاش ئەوەی شاهیدی‌ی‌دا (**به**) بەو خۆشەویستی‌یە (**عَلَيْكَ**) لە سەر تۆ شاهیدی‌ی دا (**عُدُولُ**) شاهیدە دادپەروەرەکانی (**الدَّمْع**) فرمێسك‌و هەم (**والسَّقَم**) شاهیدە دادپەروەرەکانی نەخۆشی‌ی بەردەوام.

واتە: دوو شاهیدی دادپەروەر-کە لە فرمێسکی چاوەکانت‌و لە نەخۆشی‌ی بەردەوامت وەرگیراون- شاهیدن لە سەر تۆ: کە تۆ عاشقی، مەرجی شاهیدەکانیش هاتۆتەجێ، کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وأشْهِدُوا ذَوِيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾الطلاق:٢، دوو کەسی دادپەروەر لە خۆتان بکەنە شاهید.

کەوابوو: تۆ-وەك داوالێکراو- ئەگەر سوێندیش بخوێ، داننەهێنانەکەت سودی نیەو بەو دوو شاهیدانە سوێندەکەت ڕەد دەکرێتەوەو بڕیاری دادگا بە سەرتدا دەسەپێندرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿الْبَيِّنَةُ على الْمُدَّعي والْيَمينُ على مَنْ أنْكَرَ﴾ حديث حسن رواه البيهقي، هێنانی شاهێد لە سەر داواکارە-جا ئەگەر داواکار شاهیدی نەهێنا. ئەو کاتە- سوێند لە سەر ئەو لێکراوەیە کە دان ناهێنێ.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصيري) بە دوو شاهیدی دادپەروەر بڕیاری خۆشەویستی‌ی لە سەر درا، بڕیارەکەشی لە دادگادا تۆمار کرا، دادوەر پێی ڕاگەیاند: جگە لەم دوو شاهیدانەش، بەڵگەی‌تریش هەنە: کە تۆ عاشقی‌و ناتوانی نکوڵی بکەی، بەڵگەکانیش ئەمەنە:

(**واثْبَتَ الْوَجْدُ**) ئەو غەمباریەی تۆ بە هۆی خۆشەویستی، جێگیری کرد (**خَطَّيْ**

**عَبْرَةٍ)** دوو هێڵی فرمێسك (و) هەروەها جێگیری كرد **(ضَنى)** ئاسەواری لاوازیو بێهێزی كە زەردی ڕووەكانتە، جا ڕەنگە زەردەكەت **(مثْل الْبهار)** وەك كڵوكە زەردەكەی (الْبهار)ە، كە لە وەرزی بەهاردا پەیدا دەبێ، هەم دوو هێڵەكەی فرمێسكیش **(على خدَّيْك)** لە سەر هەر دوو كوڵمەكانتە (و) ڕەنگی هێڵەكانیش: وەك **(الْعنم)** لكە سوّرەكانی درەختی (الْعَنم)ن. واتە: بێگومان لاوازیو ڕەنگ زەردیو فرمێسكی چاوەكان، هەمووی نیشانەی خۆشەویستین.

ئیمامی (الثعلبي)و ئیمامی (الواحدي) گێڕاویەتیانەوە: ﴿حەزرەتی (ثـوْبان)ی خزمەتكاری پێغەمبەرﷺ، زۆری پێغەمبەرﷺ خۆش دەویا. جا ڕۆژێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ غەمباری لە ڕووەكانی دیار بوو، ڕەنگی گۆڕا بوو، جەستەی لاواز بوبوو، جا پێغەمبەرﷺ لێی پرسی: ﴿یا ثوْبانْ ما غیّر لوْنكْ؟﴾ ئەی (ثـوْبان) چ شتێك ڕەنگی گۆڕیوی؟ حەزرەتی (ثـوْبان)یش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ، من هیچ زیانو هیچ نازارێكم نیە، بەلام هەر كاتێك نەتبینم زۆر دڵتەنگ دەبم تا دەتبینم، ئینجا بیرم لە قیامەت كردەوەو دەترسم لەوێ نەتبینم؟ چونكە تۆ لەگەڵ پێغەمبەران لە بەهشتە بەرزەكاندا دەبی، منیش ئەگەر بچمە بەهەشت، لە خوارەوە دەبم، ئەگەر نەچمە بەهەشت، ئەوە هەرگیز ناتبینم؟ جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: [ومنْ یُطع اللهَ والرَّسُول فأُولئك مع الّذین أنْعم اللهُ علیْهمْ من النّبیِّین والصّدِّیقین والشُّهداء والصّالحین وحسُن أُولئك رفیقًا] النساء: ٦٩، هەر كەسێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرﷺ بێ: فەرمانیان بەجێ بێنێ و خۆی لە قەدەغەكراوەكانیان بپارێزی، ئەوانە لە بەهەشتدا لەگەڵ ئەو كەسانەدا دەبن كە خوا نیعمەتی داونێ و پلەیان بەرزە: وەك پێغەمبەرانو ڕاستگۆیان و شەهیدەكانو پیاوچاكان، ئای ئەوانە بۆ هاوڕێیەتی چەند جوانن!﴾.

ئینجا ئیمامی (الْبوصیري) لە دادگادا هیچ دەسەڵاتی نەما و نەیتوانی بدوێ، چونكە وەك شاهیدەكەی حەزرەتی (یوسُف) پێغەمبەرﷺ ﴿وشهد شـاهدٌ مـنْ أهْلهـا﴾ شاهیدێك لە خزمو كەسی خۆی شاهیدیی دا.

واتە: نە فرمێسكو نە لاوازی هیچیان بێگانە نەبون، بۆیێ– لە دوای ئەو هەموو بینەو بەردەیە – بە ناچاری دانی بە دەردی خۆشەویستیدا هێنا و فەرمووی:

نعمْ سرى طَيْفُ مَنْ أَهْوَى فأرَّقَني (٨) والْحُبُّ يَعْترِضُ اللَّذَّاتِ بِالْأَلَمِ
يا لائمي في الْهَوَى الْعُذْرِيِّ مَعْذرَةً (٩) منّي إلَيْكَ ولَوْ أَنْصَفْتَ لَمْ تَلُمِ

(نعمْ) بەڵێ، ڕاست دەکەی ئەی دادوەری دادپەروەری دادگای خۆشەویستی، دەردی من دەردی خۆشەویستی‌یە، هۆی وەبیرهاتنەوەی خۆشەویستەکەشم ئەوە بوو: (سرى) شەوڕۆیی کردە لای من (طَيْفُ مَنْ) خەیاڵو یادی ئەو کەسەی کە (أَهْوَى) من خۆشم دەوێ، واتە: لە خەونمدا یادی خۆشەویستەکەم کردەوەو خەیاڵی وی هاتە لام (فأَرَّقَني) جا ئەو خەیاڵە خەوی لێ ڕەواندمەوە.

واتە: بە هۆی ئەو خەیاڵە خۆشە لە خەو ڕاپەڕیم، جا کە زانیم ئەوە خەیاڵەو ڕاستی نیە، غەمباری هێرشی بۆ هێنامەوەو خەوم نەهاتەوە.

جا لێرەدا ئیمامی (الْبُوصيرِي) وشەی (سَرَى)ی بە کار هێناوە، تاکو شەوڕۆیی پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ وەبیر بێتەوە، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِى أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى﴾الإسراء: ١، پاکو بێ عەیبی بۆ ئەو خوایەی شەوڕۆیی کرد بە بەندەی خۆی- (مُحَمَّد)ﷺ- لە بەشێکی شەوێدا لە (الْمَسْجِدِالْحَرَامِ)وە بۆ (الْمَسْجِدِالْأَقْصَى).

جا ئیمامی (الْبُوصيرِي) پاساو بۆ ڕەوینەوەی خەوەکەی دێنێو دەفەرموێ: (والْحُبُّ) خۆشەویستی تەبیعەتی ئەوهایە (يَعْتَرِضُ اللَّذَّاتِ) خۆشیەکان لەناو دەبا (بِالْأَلَمِ) بە ئازاری خۆشەویستی. واتە: ئەو خۆشیانەی لە خەونمدا دیتم، هیچیان نەمان بە هۆی خەو ڕەوینەوەم لە داخی نەگەیشتنم بە خۆشەویستەکەم.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصيرِي) دانی بە خۆشەویستی‌دا هێنا، هەستی کرد لۆمەکارێك لۆمەی دەکا، جا ئەویش گلەیی لە لۆمەکارەکە دەکا و دەفەرموێ:

(يَا لائِمي) هۆ لۆمەکاری من (فِي الْهَوَى الْعُذْرِيِّ) بە هۆی ئەو خۆشەویستیەی وەك خۆشەویستی (بَنِي عُذْرَة)یە. (بَنِي عُذْرَة): هۆزێکە لە (يَمَن)، زۆر بە توندی توشی (عشق) دەبنو زۆرینەیان بە دەردی خۆشەویستی دەمرن.

(مَعْذِرَةً) عوزر دێنمەوە (منِّي) لە لای خۆمەوە (إِلَيْكَ) بۆ لای تۆ، عوزرەکەم قبوڵ بکە، چونکە خۆشەویستیەکەم لە دەستەڵاتی خۆمدا نیە، کە وابوو: (وَلَوْ أَنْصَفْتَ) ئەگەر دادپەروەریو ویژدانت هەبوایە (لَمْ تَلُم) لۆمەت نەدەکردم، چونکە نابێ مرۆڤ لە سەر شتێك لۆمەی بکرێ: کە لە دەسەڵاتی خۆی‌دا نەبێ.

کەوابوو: ئافرەتەکانی سورەتی (یُوسُف)ش ﷺ ناهەق بون کە لۆمەی (زُلَیخَة)یان کرد: لە سەر خۆشویستنی حەزرەتی (یُوسُف) پێغەمبەر ﷺ؟ چونکە کە ئەوان چاویان بە حەزرەتی (یُوسُف) پێغەمبەر ﷺ کەوت، بە تەنها دیتنێك ئاگایان لەخۆیان نەما و دەستی خۆیان بڕی، جا (زُلَیْخَةَ)ش دابەزیە سەریان و گلەیی لێکردن و گوتی: ﴿فَذَلِكُنَّ الَّذى لُمْتُنَّنى فِيه وَلَقَدْ رَاوَدْتُهُ عَنْ نَفْسِه فَاسْتَعْصَــم﴾ یوسف:٣٢، ئەوەیان ئەو لاوەیە: کە ئێوە بە هۆی وی لۆمەتان کردم، من پەلاماری ئەویم دا، بەڵام ئەو خۆی لە من پاراست و بێ شەرعیی قبوڵ نەکرد.

واتە: (زُلَیْخَة) بە هۆی خۆشویستنی حەزرەتی (یُوسُف) پێغەمبەر ﷺ دەسەڵاتی بە سەر خۆیدا نەبو، بۆیێ خۆی بۆ نەگیرا و پەلاماری دا، جا بێ شەرمانە ڕاستیەکەی ئاشکرا کرد و دانی بە تاوانی خۆیدا هێنا.

بەڵام ئاگادار بە: خۆشویستنی (زُلَیْخَة) حەز لێکردنی دونیاییە، خۆشویستنی ئیمامی (البُوصِیري)ش بە گەورە دانان و ڕێزلێنانی ئاینییە.

ئینجا ئیمامی (البُوصِیري) تکای بەزەیی پێداهاتن لە لۆمەکارەکەی دەکا، تاکو عوزرەکەی قبوڵ بکا، جا دوعای بۆ دەکا و دەفەرموێ:

(عَدَتْكَ حالِيَ) حاڵی منت لێ تێبپەڕێ –ئەی لۆمەکار–، واتە: دەردی منت نەگاتێ، چونکە دەردی من دەردێکی گرانە.

جا وەك لۆمەکارەکە لێی بپرسێ: حاڵی تۆ چ حاڵێکە؟ ئەویش وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: (لا سِرِّی بِمُسْتَتِرٍ) نهێنیی من شاراوەو داپۆشراو نیە (عَنِ الْوُشاةِ) لە دووزمانەکان. دووزمان: ئەو کەسەیە –بە درۆ– قسە لە نێوان خۆشەویستەکاندا دێنێ و دەبا، تاکو نێوانیان تێك بدا.

(وَ) هەروەها (لا دائِی) دەردی من ئەو جۆرە دەردە نیە، کە (بِمُنْحَسِمٍ) ببڕێو کۆتایی بێ، بەڵکو دەردی من دەردی خۆشەویستییەو چارەی ناکرێ.

مەبەستی ئەوەیە: دڵدار خۆشەویستیەکەی لە لای دووزمانەکان ئاشکرا ناکا و دەیشارێتەوە، نەوەك دووزمانەکان نێوانی ئەوی و خۆشەویستەکەی تێك بدەن، جا ئەگەر دەردەکەی درێژەی بداتێ، ئەو کاتە لە لای دووزمانەکان و لە لای خەڵکی تریش دەردەکەوی و ئاشکرا دەبێ و نهێنیەکەی بڵاو دەبێتەوە، چونکە عادەت ئەوهایە:

محَضْتَنِي النُّصحَ لَكِنْ لَسْتُ أَسْمَعُهُ (١١) إنَّ الْمُحبَّ عَنِ الْعُذَّالِ فِي صَمَمِ
إنِّي اتَّهَمْتُ نَصِيحَ الشَّيْبِ فِي عَذَلٍ (١٢) وَالشَّيْبُ أَبْعَدُ فِي نُصْحٍ عَنِ التُّهَمِ

---

ئەگەر مرۆڤ ڕەوشتێكی هەبێ، ئەگەر ئاشرایشی نەكا، خەڵك هەر دەیزانێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إنَّ للّه ملائكةً في الأرْضِ تَنْطقُ عَلى ألسنة بني آدم بما في الْمرْءِ منَ الْخيْرِ والشرِّ﴾رواه البيهقي في شعب الايمان بإسناد حسن، خوای گەورە هەندێك (ملائِكَة)ی لە زەویدا هەنە لە سەر زوبانی ئادەمیزادان دەدوێن بەو ڕەفتارەی لە مرۆڤدا هەیە: لە چاكەو لە خراپە.

ئینجا كە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) تكای بەزەیی پێداهاتنی لە لۆمەكارەكە كرد، وەك لۆمەكارەكەش بەزەیی پێدا هاتبێو پێی گوتبێ: لۆمەكردنی من ئامۆژگاری بوو بۆ تۆ، تاكو واز لە خۆشویستنەكەت بێنیو بحەسێیەوەو چیتر لەو دەردەدا نەمێنیەوە.

جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي)ش وەڵامی دەداتەوەو دەفەرمووێ:

(**مَحَّضْتَنِي النُّصْحَ**) ڕاست دەكەی بە بێگەردی ئامۆژگاریت كردم: تاكو واز لە خۆشەویستی بێنم (**لَكِنْ**) بەڵام (**لَسْتُ أَسْمَعُهُ**) من گوێم لە ئامۆژگاریەكەت نیە.

واتە: ئامۆژگاریەكەت وەرناگرم؟ چونكە خۆشەویستەكەی من حەزرەتی (مُحَمَّد الْمُصْطَفَى)یەﷺ، جا ئەگەر هەموو خەڵكیش لۆمەم بكا، هەر گوێ نادەمێ؟ چونكە (**إنَّ الْمُحِبَّ**) بەڕاستی خۆشویست بە هۆی خۆشویستنی خۆشەویستەكەی (**عَنِ الْعُذَّالِ**) لەبارەی ئامۆژگاریو لۆمەی لۆمەكاران (**فِي صَمَمٍ**) لە كەڕیدایەو گوێ ناداتە قسەی لۆمەكاران، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿حُبُّكَ الشَّيْءَ يُعْمِي وَيُصِمُّ﴾رواه ابوداود بسند حسن، خۆشویستنت شتێك، كوێرت دەكا لە دیتنی خراپەكانیو كەڕت دەكا لە ئامۆژگاریو لۆمەی گشت لۆمەكارێك.

ئینجا كە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) بە لۆمەكارەكەی گوت: گوێم لە ئامۆژگاریەكەت نیەو وەریناگرم. وەك لۆمەكارەكەش گلەیی لێبكاو لێی بپرسێ: چۆن گومانت لە ئامۆژگاریەكەم هەیەو تۆمەتبارم دەكەی؟ خۆ ئامۆژگاریەكەم بۆ بەرژەوەندی تۆیە!

جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي)ش وەڵامی دەداتەوەو پێی دەڵێ: تەنها تۆ بە تۆمەتبار دانانێم، بەڵكو (**إِنِّي اتَّهَمْتُ**) من تۆمەتبارم كردوە (**نَصِيحَ الشَّيْبِ**) مووە سپیەكەی ئامۆژگاریكارم (**فِي عَذَلٍ**) لە ئامۆژگاری خۆمدا.

واتە: گومانم لە ئامۆژگاری گشت ئامۆژكارێك هەیە، بە جۆرێكی وەها: مووە

فَإنَّ أَمَّارَتِى بِالسُّـــوءِ مَا اتَّعَظَتْ (١٣) مِنْ جَهْلِهَا بِنَذِيرِ الشَّـــيْبِ وَالْهَـــرَمِ

سپیەکەشم تۆمەتبار دەکەم، لە کاتێکدا (وَالشَّيْبُ) مووی سپی (أَبْعَدُ) لە هەموو شتێك دورترە (فِى نُصْحٍ) لەبارەی ئامۆژگاریکردن (عَنِ التُّهَمِ) لە گشت تۆمەتێك.

واتە: چونکە مووی سپی ڕاست دەکا: کە ئامۆژگاریم دەکا و دەڵێ: من نیشانەی مردنم، کەوابوو: خۆت ئامادە بکەو بارگەکەت بپێچەوە، چونکە کاتی بارکردن هاتووەو دەگەڕێیەوە لای خودا، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُمْ مَا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَنْ تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ﴾ فاطر: ٣٧﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: يَعْنِى الشَّيْبُ﴾ رواه البخاري في الرقائق والقرطبي وابن كثير في تفسيريهما، ئایا ئەوەندە تەمەنمان نەدابووە ئێوە: لە ماوەی ئەو تەمەنەدا بترسێ و پەند وەربگرێ ئەو کەسەی دەیەوێ بیر بکاتەوەو بترسێ، هەم ترسێنەریش هاتە لاتان. واتە: ئەو ترسێنەرە مووی سپی‌یە.

﴿ اَلْـفَـصْلُ الثَّانى : فى التَّحـذير مـنْ هَـوَى الـنَفْس ﴾

﴿ بەشی دووەم: باسی ئاگادارکردنەوەو ترساندن لە هەوەسی (نَفْس) ﴾

ئینجا ئیمامی (الْبُوصيرِي) بەخۆیدا دێتەوەو (نَفْس)ی خۆی بە تاوانبار دادەنێ؟ چونکە لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا ئامۆژگاری مووی سپی‌ی قبوڵ نەکرد و تۆمەتباریشی کرد، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئایەتی‌ڕابردوودا خوای گەورە مووی سپی‌ی بە ترسێنەری مردن داناوە، جا پەشیمانی‌خۆی ئاشکرا دەکا و دەفەرموێ:

(فَإِنَّ أَمَّارَتِى) بەڕاستی (نَفْس)ی فەرمانکارم، کە زۆر فەرمانم پێدەکا (بِالسُّوءِ) بە خراپەکردن (مَا اتَّعَظَتْ) پەند و ئامۆژگاری‌ی وەرنەگرت (مِنْ جَهْلِهَا) بە هۆی نەزانینی خۆی (بِنَذِيرِ الشَّيْبِ) بە ترسێنەری مووی سپی‌و هەم (وَالْهَرَمِ) بە ترسێنەری پیری.

واتە: مووی سپی‌و پیری—هەردووکیان— نیشانەی مردنن، کەوابوو: پێویستە مرۆڤ لەو تەمەنەدا پەند وەربگرێو خۆی بۆ مردن ئامادە بکا، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ﴿أَعْمارُ أُمَّتِى مابَيْنَ السِّتِّينَ إلَى السَّبْعِينَ وَأَقَلُّهُمْ مَنْ يَجُوزُ ذَلِكَ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، بە ئەغلەبی تەمەنەکانی ئومەتم لە نێوان شەست تا حەفتا ساڵدایە، کەمترەکەیان لە حەفتا ساڵ تێدەپەڕێ.

جا ئەگەر مرۆڤ لەو تەمەنەدا بەخۆیدا نێتەوەو تۆبە نەکا، ئەوە مرۆڤێکی خراپەو

گوێڕایەڵی (نَفْس)ی فەرمانکارە بە خراپە. **جا بزانە:** (نفس) سێ جۆری هەنە:

**یەکەم:** (النَّفْسُ الْأَمَّارَة)، (نَفْس)ی فەرمانکار، ئەو (نَفْس)ەی فەرمان بە خراپە دەکاو نایەتە سەر ڕێگەی ڕاست. ئەمەیان بەهێزترین دوژمنی مرۆڤە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾يوسف:٥٣، بەڕاستی (نَفْس)- واتە: (نَفْس)ی خراپ- زۆر فەرمان بە خراپە دەکا.

**دووەم:** (النَّفْسُ اللَّوَّامَة)، (نَفْس)ی لۆمەکار، ئەو (نَفْس)ەی ئەگەر تاوانێکی کرد، پەشیمان دەبێتەوەو لۆمەی خۆی دەکا و تکای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکا. ئەمەیان مامناوەنجی‌یە. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾ القيامه:٢، سوێند ئەخۆم بە (النَّفْسِ اللَّوَّامَة) لۆمەکار.

**سێیەم:** (النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّة)، (نَفْس)ی دڵنیا، ئەو (نَفْس)ەی لە سەر ڕێگەی ڕاستەو خۆی لە گوناه دەپارێزێو لەگەڵ (اَلنَّفْسُ الْأَمَّارَة) لە ململانەدایە، جا ئەمەیان لە پلەی هەرە بەرزدایە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ * ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً﴾الفجر:٢٧ و ٢٨، هۆ (نَفْس)ی دڵنیا، بگەڕێوە لای خوای خۆت، تۆ ڕازی‌ی بە نیعمەتی خوا، لێڕازی‌بووی لە لایەن خوا.

ئینجا هەروەك ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا (نَفْس)ی خۆی تاوانبار کرد و گلەیی لێکرد، چونکە ئامۆژگاری مووی سپی‌ی قبوڵ نەکرد، ئەم جارەش (نَفْس)ی خۆی بە تاوانبار دادەنێ؟ چونکە گوێڕایەڵی فەرمانکاری چاکە نابێو دەفەرموێ:

(**وَلا أَعَدَّتْ**) هەروەها (نَفْس)ی فەرمانکارم ئامادەی نەکرد (**مِنَ الْفِعْلِ الْجَمِيلِ**) لە کردەوەی جوانو چاك: وەك (**قِرَى**) زیافەتو میوانداری بۆ (**ضَيْفٍ**) ئەو میوانە ڕێزدارەی (**أَلَمَّ**) دابەزیوە (**بِرَأْسِي**) لە سەری خۆمدا، واتە: میوانەکە مووی سپی‌یەو لە سەری خۆمدا پەیدا بووە (**غَيْرَ مُحْتَشِمٍ**) لە حاڵەتێکدا میوانەکە هیچ شەرمی لێناکرێو ڕێزی لێناندرێ.

جا لێرەدا مەبەستی بە زیافەتو میوانداری: کردەوەی چاکەیە، چونکە مووی سپی میوانی دوا تەمەنە، کەوابوو: پێویستە لە کۆتایی تەمەندا مرۆڤ زۆر بایەخ بە کردەوەی چاكو جوان بدا و شەرم لە مووە سپیەکەی بکا و خۆی لە خراپە دوور بخاتەوە، جا ئەگەر کەسێك بە کردەوەی چاك ڕێز لەو میوانە بەڕێزە نەنێو شەرمی

لێنەكا و هەر لە سەر خراپە بەردەوام بێ، ئەوە لە لای خوای گەورە هیچ عوزرێكی لێ قبولْ ناكرێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿أعْذر اللهُ إلى امْرئ أخّرَ أجَلَـهُ حَتّى بَلّغَهُ سِتّين سنةً﴾رواه البخاري، خوای گەورە هیچ عوزرێكی نەهیشتۆتەوە بۆ ئەو كەسەی نەیمراندوەو تەمەنی درێژ كردوە، تا گەیاندویەتیە شەست ساڵ.

جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی ڕابردوودا ئەوەی ڕوون كردەوە: مووی سپی میوانێكی ڕێزدارەو پێویستە شەرمی لێ بكرێو ڕێزی لێ بندرێ. بەڵام كە دیتی ڕەفتاری خەڵك بە پێچەوانەیەو مرۆڤی پیریش شەرم لە مووی سپی ناكا، بە ناچاری خەفەتباری خۆی ئاشكرا دەكا و دەفەرموێ:

(لَوْ كُنْتُ أعْلَمُ) ئەگەر من پێشتر دەمزانی (أنّي ما أُوَقِّرُهُ) كە بەڕاستی من ڕێز لە میوانەكەم نانێم: بە كردەوەی چاك، هەم شەرمی لێناكەمو واز لە خراپە ناهێنم، ئەوە (كَتَمْتُ) هەر لە زووەوە دەمشاردەوەو پەنهانم دەكرد (سِرّاً) ئەو نهێنیەی (بَدا) ئاشكرا بوو (لِي) بۆ من (مِنْهُ) لە مووی سپی. واتە: ئەو نهێنیەم دەشاردەوە (بِالْكَتَمِ) بەو ڕەنگەی تێكەڵی خەنە دەكرێو مووی سپیی پێ ڕەنگ دەكرێ.

مەبەستی بە نهێنیەكەی مووی سپی: ترساندنیەتی بە نزیكبوونەوەی مردن، واتە: كردەوەی خراپ لە لایەن مرۆڤی پیر، ناشیرینترە لە خراپەی مرۆڤی گەنج، جا ئەگەر دەمزانی لە ترسی مووی سپی تۆبە لە ڕابردووم ناكەمو لە شەرمی مووی سپی واز لە خراپە ناهێنم، ئەوە ڕەنگی مووەكانم بە ڕەنگی كەتەم دەگۆڕی، تاكو مووی سپیم پەنهان ببێو پیریم لێ دیار نەبێ.

جا بۆیێ ئیمامی (الْبُوصِيرِي) وشەی (الْكَتَم)ی هەڵبژارد، چونكە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إنَّ أحْسَنَ ما غُيِّرَ بِهِ هَذا الشَّيْبُ الْحِنّاءُ وَالْكَتَمُ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، جوانترین ڕەنگ كە ئەو مووە سپیەی پێ بگۆڕدرێ: خەنەو كەتەمە. چونكە كە ئەو دووانە تێكەڵ كران دەبنە ڕەنگی قاوەیی.

ئینجا وەك كەسێك پرسیار لە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) بكا: بۆچی (نَفْس)ی فەرمانكارت ئامۆژگاری مووی سپیی قبولْ نەكرد و ڕێزی لەو میوانە شكۆمەندە نەنا؟ ئەویش وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

(نَفْس)ی فەرمانكارم–وەك وڵاغی شەموسی سەركێشە– گوێڕایەڵم نابێ، كەوابوو:

مَنْ لي بِرَدِّ جِماحٍ مِنْ غَـوايَتِها (١٦) كَما يُرَدُّ جِماحُ الْخَيْلِ بِاللُّجُمِ
فَلا تَرُمْ بِالْمَعاصي كَسْرَ شَهْوَتِها (١٧) إنَّ الطَّعامَ يُقَوِّي شَهْوَةَ النَّهِمِ

---

مَنْ لي) كێ دەبێتە زامینی من کەفالەتم بۆ بکا (بِرَدّ جِماحٍ) بۆ گەڕاندنەوەی نفس)ە سەرکێشەکەم (مِنْ غوايتها) لە گومڕایی‌و تاوانکاریەکەی، واتە: بە پەند و ئامۆژگاری، (نَفْس)ە سەرکێشەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست (كَما يُرَدُّ) هەروەك دەگەڕێندرێتەوە (جِماحُ الْخَيْلِ) ئەسپەکانی سەرکێش (بِاللُّجُمِ) بە لغاوەکانیان.

بێگومان هەموو دەردێك دەرمانی هەیە، دەرمانی گوناهیش تۆبەیە، کەوابوو: پێویستە مرۆڤ (نَفْس)ی خۆی پاك‌و بێگەرد بکا: بە تۆبە و بە هاوڕێیەتی پیاوی چاك‌و لەخواترس، چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ﴾التوبە:١١٩، هۆ ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، لە کردار و لە گوفتاردا لە خوا بترسن‌و لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن.

جا بە هاوڕێیەتی پیاوچاکان مرۆڤ بەرە بەرە لە خراپە دور دەکەوێتەوەو (نَفْس)ی پاك دەبێتەوەو لە خوا نزیك دەبێتەوە، بۆیێ خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا﴾الشمس:٩، بەڕاستی بەختەوەر و سەرفراز بوو ئەو کەسەی (نَفْس)ی خۆی لە چڵکی تاوان پاك کردۆتەوە.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا پرسیاری کرد: کێ (نَفْس)ی سەرکێشم بۆ دەگەڕێنێتەوە سەر ڕێی ڕاست؟ وەك بیری لەوە کردبێتەوە: کەسێکی لێنەزان ڕێنموونیی بکا و بڵێ: بە زۆر لێکردن (نَفْس)ی خۆت لە گوناهکردن قەدەغە مەکە، چونکە لە ئەنجامدا قەدەغەکە دەشکێنێ‌و دێتەوە سەر گوناهکردن، کەوابوو: (نَفْس)ی خۆت ئێزن بدە: تاکو بە حەزکردنی‌خۆی گوناه بکا، ئینجا کە لە گوناهکردن تێر بوو، ئەو کاتە بەخۆی واز لە گوناهکردن دێنێ! جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) ئەو ڕێنموونیەی بە هەڵەیەکی ناشیرن دانا و فەرمووی:

(فَلا تَرُمْ) ئومێد مەکەو چاوەڕوان مەکە (بِالْمَعاصي) بە یارمەتی گوناهەکان (كَسْرَ شَهْوَتِها) تامەزرۆیی (نَفْس)ت بشکێنی، چونکە ئەگەر (نَفْس) لە گوناهکردن ڕابهێندرێ، ئەو کاتە زیاتر حەز لە گوناهکردن دەکا و گوناه لە دوای گوناه دەکا و وەڕەز نابێ تا دڵی مرۆڤ بە ژەنگی گوناه ڕەش دەبێ، هەروەك (إنَّ الطَّعامَ) بەڕاستی خواردەمەنیی خۆش‌و بە لەزەت (يُقَوِّي) بەهێز دەکا (شَهْوَةَ النَّهِمِ)

تامەزرۆیی مرۆڤی نەوسنی زۆر خۆر. بەڵام ئەگەر خواردنەکەی لێ لاببەی، ئەو کاتە هیچی دەست ناکەوێو لە خواردنی زیاتر بێئومێد دەبێ.

هەر وەهاش: ئەگەر (نَفْس) لە گوناهکردن قەدەغە بکرێ، ئەویش بێئومێد دەبێو دەگەڕێتەوە سەر خواپەرستیو دڵی مرۆڤ ڕۆشن دەبێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إِنَّ الْعَبْدَ إذا أذْنَب ذَنْباً كانَتْ نُكْتَةٌ سَوْداءُ في قَلْبِه، فَإِنْ تـابَ وَنَـزَعَ وَاسْتَغْفَرَ مِنْها صُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ زادَ زادَتْ حَتَّى يَعْلُوَ قَلْبَهُ، فَذلكَ الرَّيْنُ الَّذى ذَكَـرَهُ اللهُ تَعالى: (كَلاَّ بَلْ رانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَّا كانُوا يَكْسِبُونَ)المطففين:١٤﴾حديث صحيح رواه الإمام أحمد والترمذي، بەڕاستی هەر کاتێك بەندە گوناهێکی کرد، پەڵەیەکی ڕەش لە دڵیدا دروست دەبێ، جا ئەگەر لە گوناهەکە تۆبەی کرد: وازی لێهێنا و تکای لێخۆشبوونی گوناهەکەی لە خوا کرد، ئەوە دڵی لووسو ڕۆشن دەکرێتەوە، وە ئەگەر زیاتر گوناه بکا، پەڵەکەش زیاد دەکا، تا بە سەر دڵیدا زاڵ دەبێو دایدەپۆشێ، جا ئەوە ئەو دڵڕەشبوونەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: (قسەی کافرەکان دەرهەق قورئان ڕاست نیە، بەڵکو ئەو کردەوەی ئەوان دەیکەن ژەنگی گوناهی هێناوەتە سەر دڵەکانی ئەوانو داپۆشیوە).

ئینجا کە ئیمامی (البُوصِيرِي) لە (بَيْت)ێکڕابردوودا فەرمووی: (نَفْس) لە گوناهکردن وەڕەز نابێ، هەروەك مرۆڤی نەوسن لە خواردن تێر نابێ. ئەم جارەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: (نَفْس)ی مرۆڤ لە دەست خۆیدایەو دەتوانێ لە گوناهکردن قەدەغەی بکا و دەفەرموێ:

(**وَالنَّفْسُ**) ئارەزووی مرۆڤ (**كَالطِّفْلِ**) وەك منداڵە (**إنْ تُهْمِلْهُ**) ئەگەر واز لە منداڵ بێنیو فەرامۆشی بکەی، ئەو کاتە (**شَبَّ**) منداڵەکە گەورە دەبێو سووڕ دەبێ (**عَلَى حُبِّ الرَّضاعِ**) لە سەر خۆشویستنی شیرخواردن، واتە: بە گەورەییش حەز لە شیرخواردن دەکا، ئەوەش-وەك گوناهکردن- بە پێچەوانەی دانانی خوایە، کە دەفەرموێ: ﴿وَالْوَالِداتُ يُرْضِعْنَ أَوْلادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَـاعَةَ﴾ البقرە: ٢٣٣، دەبێ دوو ساڵی تەواو دایکان شیر بدەنە منداڵەکانیان، ئەو فەرمانە بۆ ئەو کەسەیە کە بیەوێ شیردانەکە تەواو بکا.

بەڵام (**وَإِنْ تَفْطِمْهُ**) ئەگەر منداڵەکە لە شیرخواردن بپچڕێنی، ئەو کاتە (**يَنْفَطِمِ**) هەتا

مەتـی لـه شـیرخواردن دەپچڕێو ناگەڕێتـەوە سـەر شـیرخواردنو بەرەبـەرە بـەرەو
ـمەتاری مرۆڤایەتی سەردەکەوێ.

ـتە: (نَفْس)ش وەك منداڵە: ئەگەر فەرامۆشی بکەی بە ئـارەزووی خـۆی گونـاه بکـا،
ـەوە لە گوناهکردن ڕادێ، بەڵام ئەگەر لە گوناهکردن قەدەغەی بکەی، ئـەو کاتـە بـە
ـسـەری‌دا زاڵ دەبـیو ئـەویش ئـارەزووی گونـاهکردنی نامێنـێو ناگەڕێتـەوە سـەر
گوناهکردنو بەرە بەرە بەرەو پلەی بەختەوەری سەردەکەوێ، جا ئەمەیان ئەو تۆبـە
نەسوحەیە کە خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ياأَيُّهاالَّذين آمَنُوا تُوبُوا إلَى اللهِ تَوْبَةً نَصُـوحاً﴾
التحريم:٨، هۆ ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، بۆ لای خوا تۆبە لە گوناهەکانتـان بکـەن بـە
تۆبەیەکی نەسوح. واتە: هەتاهەتایی نەگەڕێنەوە سەر گوناهکردن.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصيري) لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا، فەرمووی: (نَفْس) وەك منداڵ وایە
بەڕوەردە قبوڵ دەکا و لە گوناهکردن قەدەغـە دەکـرێ. ئـەم جـارەش لـە چۆنیەتی
بەڕوەردەکردنەکەی‌دا دەفەرموێ:

**فاصْرِفْ**) قەدەغە بکە (نَفْس)ی‌خۆت (**هَواها**) لە ئارەزووی خۆی (**وحَاذِرْ**) بترسـەو
ئاگادار بە (**أَنْ تُوَلِّيَـهُ**) لەوەی (نَفْس)ی خۆت بکەیە کاربەدەستو سەرداری خۆتو بە
ئارەزووی (نَفْس) ڕەفتار بکەی، چونکە خوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿ولا تَتَّبِعِ الْهَـوَى
فيُضلَّكَ عَنْ سبيلِ اللهِ﴾ ص:٢٦، شوێن هەواو ئـارەزووی (نَفْـس) مەکـەوە، نـەوەك لـە
ڕێگەی خوا لاتبدا و گومڕات بکا.

(**إنَّ الْهوى**) بەڕاستی ئارەزووی (نَفْس) ستەمکارێکی ئەوهایە: (**ماتَولَّی**) ئەگەر ببێتە
کاربەدەستی مرۆڤ، ئەوە (**يُصْمِ**) یـان مرۆڤەکە دەکـوژێ (**أوْ يَصِمِ**) یـان عەیبـداری
دەکا و پلەی مرۆڤایەتی‌ی دادەبەزێنێ، پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ﴿الْكَيِّسُ مَنْ دانَ
نَفْسَهُ وعَمِلَ لِما بَعْدَ الْموْتِ. والْعاجِزُ مَـنْ أتْبَـعَ نفْسَـهُ هواهـا وتَمَنَّـى عَلَـى اللهِ
الأَمانيِّ﴾حديث صحيح رواه الإمام أحمد والترمذي، مرۆڤی عاقڵو لێزان ئەو کەسەیە: لێپێچانەوە
لەگەڵ (نَفْس)ی خۆی بکا و بە سەر (نَفْس)ی خۆی‌دا زاڵ ببـێو کـردەوەی چـاك بـۆ
دوای مردن بکا، مرۆڤی گێلو تەمبەڵیش ئەو کەسەیە: (نَفْس)ی خۆی فەرامۆش بکا و
وەشوێن ئارەزووەکەی بێخی و خۆزگەی لێبووردنیش لە خوا بکا.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصيري) لە (بَيْت)ی ڕابردوودا فەرمووی: (نَفْس)ی خۆت قەدەغە

بکە لە ئارەزووی خۆی. لەوانەیە کەسێك وا تێبگا: ئەگەر (نَفس) ئارەزووی خواپەرستیش بکا، هەر قەدەغە بکرێ؟ جا ئیمامی (البُوصِيرِي) ئەو حاڵەتەش ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(وراعِها) چاودێری (نَفْس)ی خۆت بە و ئاگات لێ بێ (وَهِي) لەو حاڵەتەی (نَفْس)ەکەت (فِي الْأَعْمال) لە کردەوەی چاكو خواپەرستی سوننەتدا (سائِمَةٌ) دەلەوەڕێ.

واتە: کە (نَفْس)ەکەت وازی لە خراپە هێنا و دەستی بە خواپەرستی واجبو سوننەت کرد، ئەو حاڵەتەش حاڵەتێکی ترسناکە، کەوابوو: (وَإِنْ هِي) ئەگەر (نَفْس)ی خۆت (اسْتَحْلَتِ الْمَرْعَى) لەوەڕگەی خواپەرستنو کردەوەی سوننەتی لە لا شیرین بوو، بە جۆرێکی وەها: زۆر بایەخی بە کردەوە سوننەتەکان دەدا، تاکو خەڵك بە چاکە باسی بکا و ناوبانگی بڵاو ببێتەوە، ئەو کاتە (فَلا تُسِم) مەیلەوەڕێنە.

واتە:—جگە لە واجبەکان— لە کردەوەکانی‌تر قەدەغەی بکە، چونکە ئەو جۆرە کردەوەیەی بۆ خوا نیە، بەڵکو بۆ (ریاء)=نیشاندانی خواپەرستی دەیکا، ئەمەش بە (الشرْكُ الْأصْغَر)= هاوبەشدانانی بچوك بۆ خوا، دادەندرێو خوا قبوڵی ناکا، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إنَّ أخْوف ما أخافُ عليْكُمْ الشِّرْكُ ٱلْأصْغَرُ. قالُوا: وَما الشِّرْكُ ٱلْأصْغرُ يارسُول الله؟ قالَ: الرِّياءُ، يَقوْلُ اللهُ عزوجلَ إذا جزى النّاس بأعْمالهِمْ: إذْهَبُوا إلى الّذين كُنْتُمْ تُراؤُونَ في الدُّنْيا فانْظُرُوا هلْ تَجدُون عنْدَهُمْ جَزاءً؟﴾حديث صحيح رواه الإمام احمد و الطبراني، بەڕاستی ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر لێی دەترسم بێتە سەرتان: (الشِّرْكُ الأَصْغَر)= هاوبەشدانانی بچوکە بۆ خوا. گوتیان: هاوبەش دانانی بچوك چی‌یە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (ریاء)= نیشاندانی خواپەرستی‌یە، لە ڕۆژی قیامەت کاتێ خوای گەورە پاداشتی کردەوەکان دەداتە خەڵك، دەفەرموێ: بڕۆنە لای ئەو کەسانەی لە دونیادا کردەوەکانتان نیشانی ئەوان دەدا، تەماشا بکەن: ئایا هیچ پاداشتێکتان لە لای ئەوان دەست دەکەوێ؟.

جا تکایە: ئەم باسە بە وردی لە (إحْياء علُومُ الدّين) لە باسی (ریاء)دا بخوێنەوە، چونکە باسێکی زۆر مەترسیدارە، والله أعلم.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا فەرمووی: لە ترسی (ریاء)

كَمْ حَسَّنَتْ لَذَّةً لِلْمَرْءِ قَاتِلَةً (٢١) مِنْ حَيْثُ لَمْ يَدْرِ أَنَّ السُّمَّ فِي الدَّسَمِ
وَاخْشَ الدَّسَائِسَ مِنْ جُوعٍ وَمِنْ شَبَعٍ (٢٢) فَرُبَّ مَخْمَصَةٍ شَرٌّ مِنَ التُّخَمِ

نفس)ی خۆت لە کردەوەی سوننەت قەدەغە بکە. لەوانەیە کەسێك پێی سەیر بێ‌و بڵێ: چۆن ڕەوایە خواپەرستی قەدەغە بکرێ؟! جا ئیمامی (البُوصيرِي) لە وەڵامدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: نابێ مرۆڤ متمانە بە (نَفْس)ی خۆی بکا، چونکە (نَفْس) فێڵبازەو مرۆڤ لە ناو دەبا، بەڵگەش ئەمەیە:

(كَمْ حَسَّنَتْ) زۆر جار (نَفْس)ی مرۆڤ ڕازاندویەتیەوەو بە جوانی داناوە (لَذَّةً) تامو چێژێك: کە (لِلْمَرْءِ قاتِلَةً) تامو چێژەکە بکوژی مرۆڤە: وەك تامو چێژی (ريـاء)= نیشاندانی خواپەرستیو لەخۆڕازیبوونو خۆ بەزلزانین (مِنْ حَيْثُ) لەو ڕووەوە مرۆڤ دەکوژێ: کە (لَمْ يَدْرِ) مرۆڤەکە نەیزانیوە (أَنَّ السُّمَّ) ژەهری کوشندە (فِي الدَّسَمِ) لە ناو خواردنی چەوردایە.

واتە: تامو چێژی (رياء)=نیشاندانی خواپەرستیو لەخۆڕازیبوون ژەهرێکی کوشندەیە، تێکەڵی خواپەرستی دەبێو خواپەرستنەکەش تێك دەداو مرۆڤیش بەهیلاك دەدا، کەوابوو: پێویستە مرۆڤ ئاگای لە خۆی بێو خواپەرستنەکەی بە بێ گەردی خوا بێ، تاکو بەختەوەر ببێو ڕەنجەڕۆ نەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا * وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾الشمس:٩و١٠، بەڕاستی بەختەوەر و سەرفراز بوو ئەو کەسەی (نَفْس)ی خۆی بە خواپەرستی پاك کردۆتەوە لە چڵکی گوناهەکان، سەرشۆڕ و بێهیوا بوو ئەو کەسەی (نَفْس)ی خۆی لە ناو گوناهەکاندا پەنهان کردووەو خۆی بەهیلاك داوە.

جا کە ئیمامی (البُوصيرِي) فەرمووی: چاودێری (نَفْس)ی خۆت بە لە حاڵەتی خواپەرستندا. ئەم جارەش لە خراپەی (نَفْس) ئاگادارمان دەکاتەوە: لە حاڵەتی تێریو برسیەتیدا و دەفەرموێ:

(واخْشَ الدَّسائِس) بترسە لەو فێڵانەی (نَفْس) پەنهانیان دەکا (مِنْ جُوعٍ) لە برسیەتیو (ومِنْ شَبَعٍ) لە تێریەتی، چونکە مرۆڤ بە هۆی برسیەتی: بێهێز دەبێو وەڕەز دەبێو توندوتیژ دەبێو ڕەوشتی تێك دەچێو تووشی داڵغەی پڕوپوچ دەبێ، هەروەها بە هۆی تێری: دڵی تاریك دەبێو لەخوا بێئاگا دەبێو بۆ خواپەرستیش تەمبەڵ دەبێ، کەوابوو: پێویستە مرۆڤ لە تێریو لە برسیەتیدا مامناوەنجی بێو لە

سنور دەرنەچیٚ، هەروەك خوای گەورە دەفـەرمویٚ: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا تُسْـــرِفُوا﴾ الأعراف: ٣١، بخۆنو بخۆنەوە، زیادەڕۆی مەکەن.

جا لەوانەیە کەسیٚك بلیٚ: برسیەتی سودی هەیەو وەك تیٚری زیانی نیە؟ لـە وەلاٚمـدا فەرمووی:

(**فَرُبَّ مَخْمَصَةٍ**) هەندیٚ جار برسیەتی‌ی بەهیٚز (**شَرٌّ**) خراپترە (**مِنَ التُّخَمِ**) لـەو زۆر تیٚربوونـەی گـەدە تیٚـك دەدا، چـونکە برسـیەتی دەبیٚتـە هـۆی بـیٚ هیٚـز بـوون لـە خواپەرستی‌دا، بۆیێ پیٚغەمبەرﷺ دوعای دەکرد و دەیفەرموو: ﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ﴾رواه أبوداود والنسائي بسند صالح، خودایە خۆم دەپاریٚزم بە تۆ لە برسیەتی، چونکە برسیەتی پاڵکەوتوویٚکی خراپە، کە لـەگەڵ مرۆڤ پاڵ دەداتەوە.

ئینجا کـە ئیمـامی (البُوصِـيرِي) لـە (بَيْـت)ی‌ڕابـردوودا فـەرمانی کـرد: کردەوەکانمـان بە بیٚ گەردی بۆ خوا بیٚو (رياء)ی تیٚدا نەبیٚ، ئەم جارە هانمان دەدا بۆ تۆبـەکردنو دەفەرمویٚ:

(**وَاسْتَفْرِغِ الدَّمْعَ**) هەموو فرمیٚسکی تۆبەکردن بڕژیٚنە دەرەوە (**مِنْ عَيْنٍ**) لەو چاوەی کـە (**قَدْ امْتَلأتْ**) پـڕ بـووە (**مِنَ الْمَحـارِمِ**) لـە کـردەوە حەڕامـەکان: وەك (نَظَـر)= تەماشاکردنی نامەحرەم، واتە: تەماشاکردنی نامەحرەم بـۆ پیـاو و بـۆ ئـافرەت –بـیٚ جیاوازی– حەڕامە، پیٚغەمبەرﷺ لە حەدیسی (قُدْسِي)دا فەرمویـەتی: ﴿النَّظْرَةُ سَهْمٌ مَسْمُومٌ مِنْ سِهامِ إِبْلِيسَ﴾رواه الطبراني والحاكم بإسناد صحيح، تەماشاکردنی نامەحرەم تیریٚکـی ژەهراوی‌یە لە تیرەکانی شەیتان. واتە: بە تیشـکی شـەیتان لـە چـاوی تەماشـاکەرەکە دەدا و کار لە ئایینو لە ئابڕووی دەکا:

عـارە بـۆ عـاقـڵ لە بـەر بـیٚ کـەڵـکی * تەماشـای شەرم و ناموسی خەڵکی
خـــوا ئـــەمـری داوە بـە پیـاو و ژنـان * کەسـیان نەڕوانن بۆ لـەشی ئەویان
هـــەرگـیـز مەڕوانـە لە بۆ نامەحـرەم * حـەسرەتە بۆ دڵ دینیش ئەکا کەم
چـەند کەسی شیٚت کـرد مەڕاقی (نَظَر)* چەندی (مُبْتَلَی) بە دەردی جـگەر
بۆیێ فـــەرمـوویە حـەزرەتی ڕەئیسﷺ * (نَـظَــر) تیریٚکە لـە تیری (إبْلِيس)

لە (بەهارو گوڵزار)و (إقبالنامە)ی مامۆستا (عبدالكريم المدرس) گوڵبژیٚر کراوە.

ئینجا کە لە گوناهەکانت پەشیمان بویەوەو لە ترسی خوا گریای، بە تەنها گریان واز

مەهێنە، بەڵكو تۆبەكەت ڕابگرەو (والْزَمْ) بەردەوام بە (حِمْيَةَ النَّدَم) لە سەر پاراستنی پەشیمانی لە هەموو گوناهێكی گەورەو بچوك، چونكە مەرجەكانی تۆبەی بەڕاستی ئەمەیە:

واز لە گوناهەكە بێنیّ، پەشیمان ببێتەوە لە كردنی گوناهەكە، بڕیار بدا لەمەودوا نەگەڕێتەوە سەر گوناهەكە، ئەگەر گوناهەكە مافی ئادەمیزاد بوو، مافەكەی بداتەوە.

جا هەر كاتێك تۆبەكەی ئەو مەرجانەی لێهاتنەجیّو بە فرمێسكی پەشیمانی چاوەكانی پاك كردنەوە، ئەو كاتە خوای گەورە -لە گەورەیی خۆی- تۆبەی قبولّ دەكا و سزای نادا، هەروەك پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: ﴿لايَلجُ النَارَ رجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللهِ حَتَى يَعُودَ اللَّبَنُ فِي الضَّرْعِ﴾رواه الترمذى بسند حسن، ناچێتە ناو ئاگری دۆزەخ ئەو كەسەی لە ترسی خوا گریاوە، تا شیر دەگەڕێتەوە ناو گوان.

ئینجا كە مرۆڤ تۆبەیەكی بێگەردی كرد، (نَفْس)و شەیتان بۆی دێنە مەیدان، تاكو تۆبەی پیّ بشكێننو بیگەڕێننەوە سەر گوناهكاری، بۆیێ ئیمامی (الْبُوصِيري) ئامۆژگاری دەكا و دەفەرمویّ:

(وَخالِفِ النَّفْسَ) دژایەتی (نَفْس)ی خۆت بكەو بە قسەی مەكە، چونكە فەرمانی خراپەت پیّدەكا، كەواتە: بەردەوام بە لە سەر تۆبەو لەخواترسان، خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى * فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ النازعات: ٤٠و٤١، ئەو كەسەی لە وەستانی بەردەست خوای گەورە -لە ڕۆژی قیامەت- دەترسیّو (نَفْس)ی خۆی قەدەغە دەكا لە هەوا و هەوەسی حەرام، بەڕاستی بەهەشت هەوارگەو شوێنی حاوانەوەی ئەوە لە ڕۆژی دواییدا.

(وَ) هەروەها (الشَّيْطانَ) بە قسەی شەیتانیش مەكە، چونكە لە سەردەمی باب(آدَم)وەﷺ تا دونیا وێران دەبیّ، شەیتان دوژمنێكی درۆزنو فێڵبازە، خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا﴾فاطر:٦، ئەی خەڵكینە، شەیتان دوژمنێكی بەردەوامی ئێوەیە، كەوابوو: ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێنو دژایەتیی بكەن.

(وَاعْصِهِما) گوێڕایەڵی (نَفْس)و شەیتان مەبە: لە هیچ فەرمانێكو لە هیچ قەدەغەكردنێك (وَإنْ هُما) ئەگەر (نَفْس)و شەیتان (مَحَّضاكَ النُّصْحَ) بە بێگەردیش

ئامۆژگارییـان بـۆ تـۆ کـرد (فَـاتَّهِمِ) تـۆ هـەر تۆمـەتباریان بکـەو ئامۆژگاریەکـەیان لێ وەرمەگرە، چونکە هیچ کاتێك دوژمن بەرژەوەندی تۆی ناوێ.

بـۆیێ پێشـینەکان گوتویانـە: (لايغُـرَنَّكُمْ شَمْسُ الشّتاء وَوَعْدُ النِّساءِ ونَصيحَةُ الْأَعْداء وَمُصاحبَةُ الْأُمَراءِ) فریوتـان نـەدا: ڕۆژی زسـتان، گفتـی ئافرەتـان، ئامۆژگاری دوژمنان، هاوڕێیەتی سەرکردەکان.

ئینجا کـە ئیمامی (الْبُوصيري) لـە (بَيْت)ێڕابـردوودا فـەرمووی: (نَفْس)و شـەیتان تۆمەتبار بکەو ئامۆژگارییان لێ وەرمەگرە. ئەم جارە فەرموودەکەیڕابردووی بەهێزتر دەکا و دەفەرموێ:

(وَلاتُطِعْ) گوێڕایـەڵ مەبـە (مِنْهُما) لـە لایـەنی (نَفْس)و شـەیتان، واتـە (خَصْماً) گوێڕایەڵی کێشەچیەکەیان مەبـە و هـەم (وَلا حَكَماً) گوێڕایـەڵی ناوبژیکارەکەشیان مەبە، چونکە (نَفْس)و شەیتان –وەك دوو جووتە گورگی برسی– هێرش دێننـە سـەر عەقڵی مرۆڤ بۆ ئەوەی توشی خراپەی بکەن؟ چونکە عەقڵ فـەرمان بـە چـاکە دەکـا، ئینجا جارێك (نَفْس) کێشـەی لەگـەڵ دەکـا و شـەیتان دەبێتـە ناوبـژیکار، جـارێکیش شەیتان کێشەی لەگەڵ دەکا و (نَفْس) دەبێتە ناوبژیکار، جا لـە هـەردوو حاڵەتـدا تـۆ دژایەتی هەردووکیان بکەو گوێڕایەڵیان مەبە، چونکە (فَأَنْتَ تَعْرِفُ) تۆ دەزانی (كَيْدَ الْخَصْمِ) فێڵی کێشەچیو هەم (وَالْحَكَمِ) فێڵی ناوبژیکار.

بۆ وێنـە: شەیتان، یـان (نَفْس) کێشـە لەگـەڵ عـەقڵی مـرۆڤ دەکـا و داوای لێ دەکـا: گوناهێك بکا، یان چاکەیەك نەکا، جا عەقڵ بە قسـەی ناکـا و کێشـەکەیان دێننـە لای شەیتان، یان لای (نَفْس)، جا بێگومان: (نَفْس)و شـەیتان دۆسـتی یـەکترینو دوژمنـی مرۆڤن، کەوابوو: هەر کامیان ببێتە دادوەر، ئەوە بڕیار لە دژی مرۆڤ، بۆ بەرژەوەنـدی خۆی دەدا و پێت دەڵێ: خۆ ئەگەر گوناهەکەش بکەی هیچت لێنایێو دەرگـەی تۆبـە کراوەیەو خودا (غَفُور)و (رَحِيم)ە. ئا بەم جۆرە هەردووکیان فێڵت لێ دەکەن.

تەماشا بکە: شەیتان چۆن فێڵی لە باب (آدم)وﷺ دایکە (حَوّاء) کـرد و سـوێندی بـە درۆی بـۆ خـواردنو لـە بەهەشـت دەریکردنـە دەرەوە، خوایگـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُما لَمِنَ النّاصحِينَ * فَدَلَّيهُمَا بِغُرُورٍ﴾الاعراف: ٢١و٢٢، شەیتان سـوێندی بـۆ (آدَم)و (حَـوّاء) خـوارد و گـوتی: مـن بـۆ ئێـوە ئامۆژ کـارم، جـا بـەم سـوێندە

ـــتغفرُ اللهَ منْ قوْلٍ بلا عَـــملٍ (٢٦) لَقدْ نَسَـــبْتُ به نَسْلاً لذى عُـــقُمٍ

مرْتُكَ الْخَـــيْرَ لَكنْ مَا ائْتمرْتُ به (٢٧) وَمَا اسْتَقَمْتُ فَما قَوْلي لَكَ اسْتَقمِ

---

هەردووكیانی فریودانو توشی خواردنی درەختەكەی كردنو لە بەهەشت دەركران.

ۆیێ خوای گەورە ئامۆژگاریمان دەكا و دەفـەرمویٚ: ﴿يَا بَنِي آدَمَ لا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ﴾الاعراف:٢٧، هـۆ نەتـەوەی (آدم) ئاگـاداری خۆتـان بـن: شەیتان فریوتان نـەدا، وەك بـاوكو دایكـی ئێـوە–(آدَم)و (حَـوّاء)ی– فریـودانو لـە بەهەشت دەری كردنە دەرەوە.

ئینجا كە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) ئەو ئامۆژگاریانەیڕابردووی كردن، لەوە ترسا: بـەخۆی ڕەفتار بەو ئامۆژگاریانە نەكا، بۆیێ دەفەرمویٚ:

(أَسْتَغْفِرُ اللهَ) تكای لێخۆشبوون لە خوا دەكەم (مِنْ قَوْلٍ) لـە گۆتەیـەكی وەهـا: كـە (بِلاعَمَلٍ) كـرداری لەگەڵـدا نـەبێ، چـونكە گۆتــەی بـێكـردار تاوانـە، خـوای گـەورە دەفەرمویٚ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لا تَفْعَلُونَ كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لا تَفْعَلُونَ﴾الصف: ٢و٣، هۆ ئەو كەسانەی باوەڕتان بە خواو پێغەمبەرﷺ هێناوە، بۆچـی بە زوبانتان قسەیەك دەكەنو بە كرداریش نایكەن، ئـەوە ڕق لێبـوونێكی گەورەیـە لـە لای خوا: كە قسەیەك بكەنو بە كردار نەیكەن.

جا ئەگەر ئامۆژگاری بە چاكە بكـەمو بـەخۆم پیـاوی چاك نـەبم، وەك ئەوەیـە (لَقَدْ نَسَبْتُ) بێگومان خستبێتمە پاڵ (بِهِ) بەو گۆتەیەم (نَسْلاً) نـەژادێك (لِذِي عُقُمٍ) بـۆ نەزۆكێك، واتـە: ئەگـەر ئامۆژگـاری بـە چـاكە بكـەمو بـەخۆم چـاكەم نـەبێ، ئـەوە وا ئەگەیەنێ كە بە درۆ چاكەم دابێتە پاڵ خۆم، وەك ئەوەی بە درۆ منداڵێك بدەمە پـاڵ مرۆڤێكی نەزۆكو بڵێم: ئـەم منداڵـە لـە نـەژادی ئـەو نەزۆكەیـە. بێگومـان: نـەزۆكیش منداڵی نیە.

ئینجا ئیمامی(الْبُوصِيرِي) بۆ بەهێزكردنو ڕوونكردنەوەی (بَيْت)یڕابردوو دەفـەرمویٚ: (أَمَرْتُكَ الْخَيْرَ) فەرمانی چاكەم بـە تـۆ كـرد (لَكِنْ) بـەڵام (مَا ائْتَمَرْتُ بِهِ) بـەخۆم چاكەم نەكرد، بێگومان ئـەوەش ڕەفتـارێكی خراپـەو ڕەوشـتی جولەكەكانـە، چـونكە خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنْسَوْنَ أَنْفُسَكُمْ﴾البقرة:٤٤، ئایا ئێـوە– ئەی جولـەكەكان– فەرمانی چاكە بە خـەڵك دەكـەنو خۆتـان لـەبیر دەكـەنو چـاكە ناكەن؟ بێگومان ئەوە كارێكی ناشیرینە.

(و) هـەروەها (مَـا اسْتَقَمْتُ) بـەخۆم ڕاسـتەڕێو بـەردەوام نـەبوم لـە سـەر چـاكە، فەرمانی خوام بەجێ نەهێنا، كـە دەفـەرموێ: ﴿فاستَقمْ كمـا أُمـرْت ومـنْ تـابَ مَعَكَ﴾هود:١١٢، ئەی پێغەمبەرﷺ بەردەوام ڕاستەڕێ بمێنەوە لە سەر ئەو ئایینە، وەك لـە لایەن خواوە فەرمانت پێكراوە، خۆتو ئـەو كەسـانەی تۆبـەیان كـردوەو لەگـەڵ تـۆ ئیمانیان هێناوە.

جا ئەگەر بەخۆم بەردەوام نەبم، ئەو كاتە (فَما قوْلي) سودی چیيە گۆتەی من (لَكَ) بـۆ تـۆ، كـە پێـت بڵـێم: (اسْتَقمْ) تـۆ ڕاسـتەڕێو بـەردەوام بمێنـەوە لـە سـەر كـردار و گوفتـاری چـاك؟ بێگومـان ئـەو ئامۆژگاریـە سـودی نیـەو هـیچ بەرهـەمێكی نابـێو خاوەنەكەشی بە دۆزەخ سزا دەدرێ، پێغەمبەرﷺ فەرمويەتی: ﴿يُؤتَى بالرَّجُلِ يَـوْمَ الْقيامَة فَيُلْقَى في النَّار فَتَنْدَلقُ أقْتابُ بَطْنه فَيَدُورُ بها كَما يَدُورُ الْحمارُ بالرَّحَى، فَيَجْتَمعُ إلَيْه أَهْلُ النّار فَيَقُولُونَ: يا فُلانُ مَالَكَ؟ أَلَمْ تَكُنْ تَأْمُرُ بالْمَعْرُوف وَتَنْهَى عَـنِ الْمُنْكَـرِ؟ فَيَقُولُ: بَلَى قَدْ كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوف وَلا آتيه وَأَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ وَآتيه﴾رواه البخاری ومسلم، لە ڕۆژی قیامەت پیاو دەهێنـدرێو فڕێ دەدرێتە ناو ئاگر، جا ڕیخۆڵەكانی لە زگی دێنـە دەرەوەو بە دەورەیاندا دەسوڕێ، وەك كەر بە دەورەی ئاشـدا دەسـوڕێ، جـا خـەڵكی دۆزەخ لە لای كۆ دەبنەوەو دەڵێن: فلانەكەس ئەوە چیتە؟ ئەدی تۆ فەرمانت بـە چـاكە نەدەكرد و خراپەت قەدەغە نەدەكرد؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، فەرمانم بـە چـاكە دەكـرد و بەخۆم چاكەكەم نەدەكرد، خراپەم قەدەغە دەكرد و بەخۆم خراپەكەم دەكرد.

جا ئەم حەدیسە هەڕەشەیە بۆ ئەو وتارخوێنانـەی گۆتـەیان هەیـەو كردەوەیـان نیـە، أعاذنا الله تعالى.

ئینجا ئیمامی (البُوصيرِي) ئاخ و پەشیمانی خۆی ئاشـكرا دەكـا، چـونكە لـە تەمـەنی ڕابردوویدا زۆر چاكەی نەكردونو دەفەرموێ:

(وَلا تَزَوَّدْتُ) زاد و زەخیرم ئامـادە نـەكردوە (قَبْلَ الْمَوْتِ) لـە پـێش مـردنم، واتـە: پێش وەرێكەوتنم بـۆ سـەفەری ڕۆژی قیامـەت (نَافلَةً) لـە زاد و زەخـیرەی كـردەوە سوننەتەكان، چونكە سوننەتەكان: هەروەك پلەی مرۆڤ لە بەهەشتدا بەرز دەكەنەوە، ناتەواوی واجبەكانیشـی لـە قیامەتـدا بـۆ پـڕ دەكەنـەوە، پێغەمبـەرﷺ فەرمويـەتی: خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێتە (مَلائكَة)ی خـۆی: ﴿أُنْظُرُوا فـي صَـلاة

عَبْدِي أَتَمَّهَا أَمْ نَقَصَهَا؟ فَإِنْ كَانَتْ تَامَّةً كُتِبَتْ لَهُ تَامَّةً، وَإِنْ كَانَ انْتَقَصَ مِنْهَا شَيْئًا، قَالَ: انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ؟ فَإِنْ كَانَ لَهُ تَطَوُّعٌ، قَالَ: أَتِمُّوا لِعَبْدِي فَرِيضَتَهُ مِنْ تَطَوُّعِهِ. ثُمَّ الزَّكَاةُ مِثْلُ ذَلِكَ. ثُمَّ تُؤْخَذُ الْأَعْمَالُ عَلَى حَسَبِ ذَلِكَ﴾رواه أبوداود بسند حسن، تەماشای ناو نوێژی بەندەی من بکەن: ئایا نوێژەکەی بە تەواوی کردوە، یان بە ناتەواوی؟ جا ئەگەر نوێژەکەی تەواو بوو، ئەوە بە تەواوی بۆی دەنووسرێ، وە ئەگەر شتێکی لە نوێژەکەی ناتەواو کردبوو، خوای گەورە دەفەرموێ: تەماشا بکەن ئایا بەندەی من سوننەتی هەنە؟ جا ئەگەر سوننەتی هەبن، خوای گەورە دەفەرموێ: ناتەواوی نوێژە واجبەکە بۆ بەندەی من لە نوێژە سوننەتەکەی تەواو بکەن. ئینجا زەکاتیش وەکو نوێژە، ئینجا کردەوەکانیتریش هەر بەو گوێرەیە وەردەگیرێن.

مەبەست بە (فِي صَلاةِ عَبْدِي): ناتەواوی ناو نوێژەکەیە کە نەیزانیوە، چونکە ئەگەر مەبەست خودی نوێژە نەکراوەکە بوایە، ئەوە دەیفەرموو: (إِلَى صَلاةِ عَبْدِي).

(**وَلَمْ أُصَلِّ سِوَى فَرْضٍ**) جگە لە نوێژە واجبەکان نوێژی سوننەتم زۆر نەکردون و هەم (وَلَمْ أَصُمْ) ڕۆژووی سوننەتیشم زۆر نەگرتون. بێگومان: ئەوەش دەبێتە هۆی دابەزینی پلەی مرۆڤ و دواکەوتنی لە کاروانی پیاوچاکان.

کەوابوو: ئەگەر موسولمان بیەوێ ببێتە دۆستی خوا و لە خوا نزیک ببێتەوە، پێویستە –لەگەڵ واجبەکاندا– سوننەتەکانیش بکا، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ﴿إِنَّ اللهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُهُ عَلَيْهِ، وَلَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ...﴾الحديث رواه البخاري، خوای گەورە فەرمویەتی: هەرکەسێك دوژمنایەتی دۆستێکی من بکا، ئەوە بەڕاستی ئاگادارم کردوە: من جەنگی لەگەڵ دەکەم، بەندەی من بە هیچ شتێکی خۆشەویستر لە لای من لە من نزیك نابێتەوە، وەك بە کردنی ئەو کردارەی لە سەرم واجب کردوە لێم نزیك دەبێتەوە، بەندەی من واز ناهێنێ‌و بەردەوام بە کردنی سوننەتەکان خۆی لە من نزیك دەکاتەوە، تا خۆشم دەوێ.

## ﴿ اَلْفَصْلُ الثَّالِثُ: فِي مَدْحِ النَّبِيِّ ﷺ ﴾

### ﴿ بەشی سێیەم: لە باسی ستایشی پێغەمبەر ﷺ ﴾

ئەم باسە مەبەستی ئەم قەسیدەیە، بەڵام ئیمامی (الْبُوصِيرِي) خۆی بە شیاوی ئەوە

ظَلَمْتُ سُنَّةَ مَنْ أَحْيَا الظَّلامَ إلى (٢٩) أَن اشْتَكَتْ قَدَماهُ الضُّـرَّ مِنْ وَرَمٍ
وَشَدَّ مِنْ سَغَب أَحْشاءَهُ وَطَوى (٣٠) تَحْتَ الْحجارَة كَشْحاً مُتْرَفَ الْأَدَمِ

دانەنا: کە مەدحی ئەو پێغەمبەرە گەورەو ڕێزدارە بکاﷺ تا (نَفْس)ی خۆی شکاند و دانی بە تاوانەکانی خۆی‌دا هێنا و تکای لێخۆشبوونی لە خوا کرد، ئینجا هاتە بەر دەرگەی پێغەمبەرﷺو خۆی بە کەمتەرخەم دانا و فەرمووی:

(**ظَلَمْتُ**) ستەمم کرد و وازم هێنا لە (**سُنَّةَ مَنْ**) ڕێبازی ئەو پێغەمبەرەیﷺ کە (**أَحْيَا الظَّلام**) شەوی تاریکی زیندوو کردەوە بە نوێژکردن، واتە: پێغەمبەرﷺ شەوێ نەدەخەوت‌و هەر شەونوێژی دەکرد، جا پێغەمبەرﷺ لە شەونوێژەکەی‌دا ئەوەندە لەپێوە ڕادەوەستا و قورئانی دەخوێند (**إِلَى أَنْ اشْتَكَتْ قَدَماهُ**) تا هەردوو پێیەکانی سکالایان کرد (**الضُّرّ**) لەو ئازارەی توشیان دەبوو (**مِنْ وَرَمٍ**) بە هۆی هەڵاوسان‌و ئەستووربوونیان ﴿عَنِ الْمُغيرَةِ رضي الله عنه: قامَ النَّبيُّ ﷺ حَتَّى تَوَرَّمَتْ قَدَماهُ، فَقيلَ لَهُ: غَفَرَ اللهُ لكَ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وما تَأَخَّرَ؟ قال: أَفلا أَكُونُ عَبْداً شَـكُوراً﴾رواه البخاري ومسلم، پێغەمبەرﷺ ئەوەندە لە شەونوێژدا لەپێوە ڕادەوەستا، تا هەردوو پێیەکانی هەڵاوسان، جا پێی گوترا: خوای گەورە لە ڕابردوو و داهاتووی گوناهت خۆش بووە، بۆچی ئەوەندە خۆ ماندوو دەکەی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایا نەبمە بەندەیەکی سوپاسکار بۆ خوای گەورە؟!.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصيري) باسی خواپەرستنی پێغەمبەری کردﷺ، ئەم جارەش باسی دونیانەویستیی پێغەمبەرﷺ دەکا و دەفەرموێ:

(وَ)هەروەها ستەمم کرد لە ڕێبازی ئەو پێغەمبەرەیﷺ کە (**شَدَّ**) پێچا بوی (**مِنْ سَغَبٍ**) بە هۆی برسیەتی (**أَحْشاءَهُ**) هەناوەکانی خۆی ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: جِئْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَوْماً فوَجدْتُهُ جالساً مع أَصْحابه وَقَدْ عصبَ بَطْنَهُ بعِصابَة. فَقُلْتُ: لِـمَ عَصَـبَ رَسُولُ اللهِ بَطْنَهُ؟ فَقالُوا مِنَ الْجوُعِ...﴾الحديث، رواه مسلم، ڕۆژێك چومە خزمەت پێغەمبەرﷺ، دیتم لەگەڵ (صَحابَة)کانی دانیشتووەو زگی خۆی بە پەڕۆکێك پێچابوو، منیش گوتم: بۆچی پێغەمبەرﷺ زگی خۆی پێچاوە؟ گوتیان: بە هۆی برسیەتی.

(وَ)هەروەها ستەمم کرد لە ڕێبازی ئەو پێغەمبەرەیﷺ کە (**طَوى**) وێکی هێنابۆوە (**تَحْتَ الْحجارَة**) لە بن بەردەکاندا (**كَشْحاً**) کەلەکەیەکی وەها: کە (**مُتْرَفَ الْأَدَم**) پیستەکەی نەرمو ناسکە ﴿عَنْ جابرٍ رضي الله عنه –في حَديث حَفْرِ الْخَنْدَقِ–: عَرَضَتْ كُدْيَـةٌ

وَراوَدَتْهُ الْجِبالُ الشُّمُّ مِنْ ذَهَبٍ (٣١) عَنْ نَفْسِهِ فَأَراها أَيَّما شَمَمِ
وَأَكَّدَتْ زُهْدَهُ فيها ضَرُورَتُهُ (٣٢) إِنَّ الضَّرُورَةَ لا تَعْدُو عَلَى الْعِصَمِ

---

شديدةٌ، فقالَ ﷺ: أَنا نازلٌ. ثُمَّ قامَ ﷺ وبطْنُهُ مَعْصُوبٌ بحجرٍ، ولَبِثْنا ثلاثةَ أيّامٍ لانَذُوقُ ذَواقاً...﴾الحديث، رواه البخاري ومسلم، له هەڵکەندنی (خَنْدَق)دا پارچە بەردێکی تونـدی رەق هاتە پێشمان، جا پێغەمبەر ﷺ بەخۆی دابەزیە ناو (خَنْدَق)، لـە بەر برسیەتی بەردی لە سەر زگی خۆی بەستبوو، ماوەی سێ ڕۆژان هیچمان تام نەکردبوو.

ئینجا لەوانەیە کەسێك وا تێبگـا: ئەو برسیەتیەی پێغەمبەر ﷺ بەهۆی هەژاریو نەبوونی بوبێ، نەك بە هۆی دونیانەویستی، جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) ئەو تێگەیشتنە هەڵەیە ڕەد دەکاتەوەو دەفەرمووێ:

(**وراوَدَتْهُ**) خواستی پێغەمبەری ﷺ کرد (**الْجِبالُ الشُّمُّ**) چیا بەرزەکانی (مَكَّة)ی پیرۆز، واتە: داوایان لێکرد: (**مِنْ ذَهَبٍ**) کە بۆی ببنە زێڕ (**عَنْ نَفْسِه**) لە بەر خودی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بیەوێ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەو زێڕەی نەویست، بەڵکو (**فَأَراها**) وازهێنانی لە دونیا، نیشانی چیایەکان دا (**أَيَّما شَمَمِ**) وازهێنانێکی وەها بەهێز: کە هیچ کەسێك لە توانایدا نەبێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ﴿عَرَضَ عَلَيَّ رَبِّي لِيَجْعَلَ لِي بَطْحاءَ مَكَّةَ ذَهَباً، فَقُلْتُ: لا، يارَبِّ...﴾الحديث، رواه الإمام أحمد والترمذي وقال: حديث حسن، وفي حديث آخر: ﴿أَتُحِبُّ أَنْ أَجْعَلَ هذه الْجِبالَ ذهباً؟...﴾ رواه الطبراني بسند حسن، والقاضي عياض في الشفا ورواه البيهقي في الدلائل، وابن المنذر وابن منده وأبونعيم في قصة ثعلبة بلفظ آخر، خوای گەورە ئاراستەی کردم تاکو خاك و لمی (مَكَّة) بۆ من بکاتە زێڕ؟ منیش گوتم: نا، خودایە نامەوێ.

لە حەدیسێکیتردا فەرمویەتی: (ئایا پێت خۆشە ئەم کێوانە بـۆ تـۆ بکەمـە زێـڕ؟...)، واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەو زێڕەی نەویست، چونکە دونیانەویست بوو.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) بەڵگەی هێناوە لە سەر دونیانەویستی پێغەمبەر ﷺ، دەگونجێ کەسێکی نەفامو ناتێگەیشتوو بڵێ: پێغەمبەر ﷺ، ئەوەنـدە دەوڵەمەنـد و هەبوویی بوو، بۆیێ کێوەکانی زێڕی نەویستن. جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) ئەوەش ڕەد دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(**وَأَكَّدَتْ**) بەهێزی کردوە (**زُهْدَهُ**) دونیانەویستیو وازهێنانی پێغەمبەر ﷺ (**فِيها**) لـە کێوەکـانی زێـڕ (**ضَرُورَتُهُ**) ناچـاریو پێویسـتـی پێغەمبەر ﷺ. واتـە: بەڵگـەی

دونیانەویستی پێغەمبەرﷺ بەوە بەهێزتر دەبێ: کە پێغەمبەرﷺ ناچاری ڕووی تێدەکرد و پێویستیەکانی ژیانی دەست نەدەکەوتن، ئەوجا کێوەکانی زێڕیشی قبوڵ نەکردن ﴿عَنْ عائشة رضي الله عنها: تُوُفّيَ رسُولُ اللهِﷺ وَدِرْعُهُ مَرْهُونَةٌ عِنْدَ يَهُودِيّ فِي ثَلاثِينَ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ﴾ رواه البخاري ومسلم، پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، لەو حاڵەتەی زرێیەکەی لە لای جولەکەیەك بە بارمتەی سی ڕبە جۆ داندرابوو. واتە: پارەی نەبو، بۆیێ بە قەرز کڕیبوی.

(إِنَّ الضَّرُورَةَ) بەڕاستی ناچاری (لا تَعْدُو) زاڵ نابێ (عَلَى الْعِصَمِ) بە سەر ئەو کەسانەدا: کە خوا لە دونیاویستن پاراستونی. واتە: هەر چەند زۆریش پێویستیان هەبێ، پێویستی وایان لێناکا دونیایان بوێ ﴿عَنْ ابْنِ عُمَر رضي الله عنهما: خُيِّرَ رَسُولُ اللهِﷺ بَيْنَ الدُّنْيا وَالآخِرَةِ، فَاخْتارَ الآخِرَةَ﴾حديث حسن رواه الطبراني والبيهقي، پێغەمبەرﷺ لە لایەن خواوە کرا سەر پشك: لە نێوان دونیا و قیامەت؟ جا پێغەمبەرﷺ قیامەتی هەڵبژارد، واتە: دونیای نەویست.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصيري) فەرمووی: ناچاری زاڵ نابێ بە سەر پێغەمبەرداﷺ و وای لێناکا دونیای بوێ. فەرموودەکەیخۆی بەهێز دەکا و دەفەرموێ:

(وَكَيْفَ) چۆن (تَدْعُو) داوا لە پێغەمبەرﷺ دەکا: (إِلَى الدُّنْيا) کە دڵی بە لای دونیادا بچێ (ضَرُورَةُ مَنْ) ناچاریی ئەو پێغەمبەرەیﷺ (لَوْلاهُ) ئەگەر لە بەر خاتری ئەو پێغەمبەرە نەبوایەﷺ (لَمْ تُخْرَجِ الدُّنْيا مِنَ الْعَدَمِ) دونیا لە نەبوونەوە نەدەهێندرا هەبوون.

واتە: ناچاری وا لە پێغەمبەرﷺ ناکا: دونیای بوێ، چونکە دونیا لە بەر خاتری وی دروست کراوە. هەروەك لە باسی قبوڵکردنی تۆبەی باب (آدم)ﷺ لە حەدیسێکی (صَحيح)دا پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿لَمَّا اقْتَرَفَ آدمُ الْخَطِيئَةَ، قالَ: يا رَبِّ أَسْأَلُكَ بِحَقِّ مُحَمَّدٍ لَمَا غَفَرْتَ لِي. فَقالَ اللهُ: يا آدمُ وَكَيْفَ عَرَفْتَ مُحَمَّداً وَلَمْ أَخْلُقْهُ؟ قالَ: يارَبِّ لأَنَّكَ لَمَّا خَلَقْتَنِي بِيَدِكَ وَنَفَخْتَ فِيَّ مِنْ رُوحِكَ، رَفَعْتُ رَأْسِي فَرَأَيْتُ عَلَى قَوائِمِ الْعَرْشِ مَكْتُوباً: (لاإِلهَ إلاّاللهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ)، فَعَلِمْتُ أَنَّكَ لَمْ تُضِفْ إلَى اسْمِكَ إلاَّ أَحَبَّ الْخَلْقِ إلَيْكَ. فَقالَ اللهُ صَدَقْتَ يا آدمُ إِنَّهُ لأَحَبُّ الْخَلْقِ إلَيَّ. اُدْعُنِي بِحَقِّهِ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ. وَلَوْلا مُحَمَّدٌ ما خَلَقْتُكَ﴾أخرجه الحاكم في المستدرك بإسناد صحيح، والحافظ السيوطي

مر نخصائص النبوية وصححه، وصححه القسطلاني والزرقاني فى المواهب اللدنية، وجاء من طريق آخر بلفظ: «لولا مُحمَّدٌ ما خلقْتُ آدمَ ولاالْجنَّةَ ولاالنَّار» رواه الحاكم بإسناد صحيح، وصححه الإمام البلقيني مر متاواه، ونقله الإمام إبن كثير فى البداية والنهاية، له كاتێكدا باب (آدم)ﷺ به هۆی خواردنی ـه دارەكەی بەهەشت توشی تاوان بوو، له خوا پاڕاوەو گوتی: (خوایه بۆ خاتری محمَّد)ﷺ له گوناهم خۆش ببه). خوای گەورە فەرمووی: (چۆن (مُحَمَّد)ت ـیوە، خۆ هێشتا دروستم نەكردوە؟). باب (آدم)ﷺ فەرمووی: خوایه كه منت دروست كرد و گیانت هێنا ناو لاشەكەم، سەرم بەرزكرد و دیتم: لە سەر ـچەكەكانی (عَرْش) نووسراوە (لاإلـهَ إلاالله مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله)، ئینجا زانیم: هیچ ـوێك لەگەڵ ناوی پیرۆزی خۆت كۆ ناكەیەوە، تەنها ناوی خۆشەویسترین خەڵكی ـۆت نەبێ، ئینجا خوای گەورە فەرمووی: ڕاست دەكەی: (مُحَمَّد)ﷺ خۆشەویسترین خەڵكە بە لامەوە، بە خاتری (مُحَمَّد)ﷺ لێم بپاڕێتەوە، بێگومان ئەوا ـێت خۆش بووم، ئەگەر لە بەر (مُحَمَّد)ﷺ نەبوایە: تۆم دروست نەدەكرد.

ـلە حەدیسێكی تردا فەرمویەتی: [ئەگەر لە بەر (مُحَمَّد)ﷺ نەبوایە: نە (آدَم)و نە بەهەشتو نە دۆزەخم دروست نەدەكردن].

هەم بە وشەی (الدُّنیا) لە حەدیسێكی بێهێزدا هاتووە: «إنَّ رَبَّكَ يقُولُ: لَوْلاكَ-يامُحمَّدُ- ماخَلَقْتُ الدُّنْيا» رواه الديلمي في الفردوس وابن عساكر في تأريخ دمشق، وسنده واهٍ جداً، خوای تۆ دەفەرموێ: ئەگەر لە بەر خاتری تۆ نەبوایە-ئەی مُحَمَّد ﷺ- دونیام دروست نەدەكرد.

لە مەدحی پێغەمبەرﷺ، (عاجز) فەرمویەتی:

**نوری بناغەی عالەمە * بۆ (أنْبیا)یان خاتەمە**

**(آدم) لە بەر وی ئادەمە * (تَحْقِيق) بكەن گوفتاری من**

ئینجا كە ئیمامی (البُوصيري) ئەو هەموو ستایشەی پێغەمبەریﷺ كرد، ئەم جارە بە ئاشكرایی ناوی دێنێو دەفەرموێ:

(مُحَمَّدٌ)ﷺ ئەو پێغەمبەرەی ئەو هەموو سیفەتە باشانەی هەبون، ناوی (مُحَمَّد)ە ﷺ كە پێغەمبەری خوایەو (سَيِّدُ الْكَوْنَيْن) گەورەی هەردوو بوونەوەرە، واتە: دونیا و قیامەتو گشت بوونەوەرێكی ناو دونیا و قیامەتیش، هەم (وَالثَّقَلَيْن)

گەورەی هەردوو گرانکەرەکانی سەر زەمینە: کە ئادەمیزاد و جنۆکەنە، هەم (وَالْفَرِيقَيْنِ) گەورەی هەردوو تیپەکانە: (مِنْ عُرْبٍ) کە عەرەبەکانو (وَمِنْ عَجَمٍ) گەلەکانیتری سەر زەمینن جگە لە عەرەبەکان.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿أَنا سَيِّدُ النّاس يَوْمَ الْقِيامَة﴾رواه البخاري ومسلم، من گەورەی هەموو خەڵکم لە ڕۆژی قیامەتدا.

هەم ﴿عَن أَبي مُوسى الأَشْعَرِيّ رضي الله عنه في قِصّة سَفره ﷺ مع عَمِّه إلى الشّام...فَأَخَذ الرّاهِبُ بِيَدِه ﷺ وَقالَ: هذا سَيِّدُ الْعالَمينَ هذا رَسُولُ رَبِّ الْعالَمينَ...﴾حديث حسن رواه الترمذي والبيهقي، وقال الحاكم: حديث صحيح، کە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ مامیخۆی بە سەفەر چووە (شام)، ڕاهیبەکە دەستی پێغەمبەریﷺ گرتو گوتی: ئەمە گەورەی هەموو عالەمە، ئەمە پێغەمبەری پەروەردگاری عالەمە. واتە: بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام: پێغەمبەرﷺ لە هەموو عالەم= دروستکراوێکی خوا گەورەترە.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصيرِي) بە ئاشکرایی ناوی پێغەمبەری هێناﷺ، ئەم جارە شانازی بەوە دەکا: کە ئێمە ئوممەتی ئەو پێغەمبەرەینو دەفەرموێ:

(نَبِيُّنا) ئەو پێغەمبەرە گەورەو ڕێزدارەی ناوم هێنا، پێغەمبەری ئێمەیەﷺ (الآمِرُ) بە بڕیاری خودا فەرماندەری چاکەیەو (النّاهِي) ڕێگری خراپەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَما آتاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَما نَهاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾الحشر:٧، هەر فەرمانێکی پێغەمبەرﷺ بە ئێوەی کرد، وەریبگرن، هەر شتێکی لێ ی قەدەغەکردن مەیکەن.

(فَلا أَحَدٌ) جا هیچ خەڵکێك نیە (أَبَرَّ) ڕاستگۆتر بێ (فِي قَوْلِ لا) لە گوتنی نا (مِنْهُ) لە پێغەمبەرﷺ، هەم (وَلا نَعَم) هیچ خەڵکێکیش لە پێغەمبەرﷺ ڕاستگۆتر نیە لە گوتنی بەڵێ.

واتە: هیچ خەڵکێك لە پێغەمبەرﷺ ڕاستگۆتر نیە، لەو کاتەی لە قەدەغەکردنی خراپەدا دەفەرموێ: نا، مەیکە. یان لە فەرمان بە چاکەدا دەفەرموێ: بەڵێ، بیکە. چونکە هەردووکی بە بڕیاری خودایە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وما يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى * إِنْ هُوَ إِلاّ وَحْيٌ يُوحَى﴾النجم: ٣و٤، پێغەمبەرﷺ بە هەواو هەوەس— لە کاروباری ئایندا— گوفتار ناکا، بەڵکو گشت گوفتارێکی ئاینی لە لای خوا بە (وَحْي) بۆی هاتووە.

هەروەها لە کاروباری دونیاییشدا پێغەمبەرﷺ لە هەموو خەڵکێك ڕاستگۆترە ﴿عَنْ جابر ﷺ: ما سُئِلَ النَّبيُّ ﷺ عَنْ شيْءٍ قطُّ فقال: لا﴾رواه البخاري ومسلم، پێغەمبەرﷺ هەر شتێکی لێ داوا کرابا، هەرگیز نەیدەفەرموو: نا. واتە: ئەگەر داواکراوەکەی پێ جێبەجێ کرابا، دەیفەرموو: بەڵێ، ئەگەر نا، بێدەنگ دەبوو.

ئینجا ئیمامی (البُوصیرِي) بەڵگە لە سەر گەورەیی پێغەمبەرﷺ دێنێتەوەو دەفەرموێ:

(هُوَ الْحَبِيبُ) ئەو پێغەمبەرەﷺ خۆشەویستی خوایە، کەوابوو: واجبە ئێمەش خۆشمان بوێ‌و شوێنی بکەوین، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللهَ فاتّبِعُوني يُحْبِبْكُمُ اللهُ﴾ آل عمران:٣١، ئەی پێغەمبەرﷺ بەم خەڵکە بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش ئەوێ، وەرن شوێن من بکەون، تا خوای گەورە ئێوەی خۆش بوێ.

(الّذي) ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەیەﷺ: کە (تُرْجَى شَفاعَتُهُ) ئومێدو چاوەڕوانی شەفاعەتی وی دەکرێ: (لِكُلِّ هَوْلٍ) لە بۆکشت مەترسیەك (مِنَ الأَهْوالِ) لە مەترسیەکانی ڕۆژی قیامەت (مُقْتَحَمِ) لەوکاتەی مرۆڤ دەکەوێتە ناو مەترسی.

جا لە بەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ خۆشەویستی خوایە، خوای گەورە دڵی ناشکێنێ‌و لە ڕۆژی قیامەت شەفاعەتەکەی قبول دەکا، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجابَةٌ، فَتَعجَّلَ كُلُّ نَبِيٍّ دَعْوَتَهُ، وَإِنِّي اخْتَبَأْتُ دَعْوَتي شَفَاعَةً لأُمَّتي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَهِيَ نائِلَةٌ -إنْ شاءَ اللهُ- مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتي لا يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئًا﴾رواهُ البُخاري ومُسْلِم، هەر پێغەمبەرێك دوعایەکی قبوڵکراوی هەیەو لە دونیادا دوعاکەیەی خۆی کردوە، منیش دوعایەکەی خۆم هێشتۆتەوە تاکو ببێتە شەفاعەت بۆ ئوممەتم لە ڕۆژی قیامەت، ئەم شەفاعەتەی من-إنْ شاءَ اللهُ- گشت کەسێك لە ئوممەتم ئەگرێتەوە بەو مەرجەی بە ئیمانەوە مردبێ‌و هاوبەشی بۆ خوا دانەنابێ.

إنْ شاءَالله ئەو شەفاعەتە ئێمەش دەگرێتەوە، آمین.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصیرِي) لە (بیْت)ی‌ڕابردوودا فەرمووی: پێغەمبەرﷺ ئەو خۆشەویستەیە چاوەڕوانی شەفاعەتی دەکرێ. ئەم جارە باسی ئەوەمان بۆ دەکا: ئەو کەسانە چاوەڕوانی شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ دەکەن: کە باوەڕیان پێ هێناوەو دەستیان بە ئایینی ئیسلامەوە گرتووە، جا دەفەرموێ:

دَعَا إلَى اللهِ فَالْمُسْتَمْسكُونَ بِه (٣٧) مُسْتَمْسكُونَ بِحَبْلٍ غَيْرِ مُنْفَصِمِ
فَاقَ النَّبِيِّينَ فِي خَلْقٍ وَفِي خُلُقٍ (٣٨) وَلَمْ يُدانُوهُ فِي عِـــلْمٍ وَلاَ كَرَمِ

---

(**دَعَا**) ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەﷺ بانگەوازیی کرد، واتە: جنۆکەو ئادەمیزادی بانگ کردن (**إلَى اللهِ**) بۆ ئایینی خوا: کە ئایینی ئیسلامە، چونکە خوای گەورە فەرمانی پێکردوەو دەفەرموێ: ﴿ادْعُ إلى سبيلِ رَبِّكَ بالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَــنَةِ﴾ النحل:١٢٥، ئەی پێغەمبەرﷺ بانگەوازی بکە بۆ ئایینی خوای خۆت، بە کارلەجێیی و بە پەندی جوان.

کەوابوو: (**فَالْمُسْتَمْسكُونَ بِه**) ئەوانەی دەستیان بە ڕێبازی پێغەمبەرەوەﷺ گرتووە، واتە: بانگەوازیەکەی پێغەمبەریانﷺ قبولّ کردوەو دەستیان بە ئایینی ئیسلامەوە گرتووە، ئەوانە (**مُسْتَمْسِكُونَ بِحَبْلٍ**) دەستیان بە گوریسێکەوە گرتووە، کە (**غَيْرِ مُنْفَصِمٍ**) هەرگیز نابچڕێ، چونکە گوریسەکە زۆر بەهێزەو بە دەست پێوەگرتنی گوریسەکە دەگەنە مەبەستی خۆیان: کە بەختەوەری دونیاو قیامەتە.

مەبەستیش بە گوریسە نەپچڕاوەکە: شەریعەتی ئیسلامە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِــالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لاَانْفِصَامَ لَهَا وَاللهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ البقرة: ٢٥٦، هەر کەسێك کوفر بە (طاغوت) بکا و شوێنی نەکەوێو باوەڕیش بە خوا بێنێو دەست بە ئایینی خواوە بگرێ، ئەوە بەڕاستی دەستی بە دەستپێوەگرێکی پتەو و بەهێزەوە گرتووە، هەرگیز پچڕانی نیە، خوای گەورە بیسەر و زانایە.

**جا بزانە:** (طاغُوت) بە شەیتانو بە گشت سەرکردەیەکی گومڕایی دەگوترێ.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصِيري) لە (بَيْت)ی ڕابردوودا فەرمووی: پێغەمبەرﷺ بانگەوازیی بۆ ئایینی خوا کردوە. بیری لەوە کردەوە: کەسێك بۆی هەیە بڵێ: خۆ هەموو پێغەمبەرانی خواﷺ بانگەوازییان کردوەو ئینکاری ناکرێ. جا ئەویش لە وەلامدا تایبەتیەکانی پێغەمبەرﷺ باس دەکا و دەفەرموێ:

(**فَاقَ النَّبِيِّينَ**) پێغەمبەری گەورەو خۆشەویستمانﷺ پلەی لە هەموو پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام- بەسەرەوەترە (**فِي خَلْقٍ**) لە ڕووی جوانی جەستەیو هەم (**وَفِي خُلُقٍ**) لە ڕووی ڕەوشت جوانی. لەبارەی ڕەوشتە جوانەکەی پێغەمبەرﷺ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾القلم:٤، ئەی (مُحَمَّد)ﷺ بەڕاستی تۆ لە سەر ڕەوشتێکی گەورەی.

هەر لەبارەی جوانی جەستەی پێغەمبەریشﷺ: ﴿عَنِ الْبَرَاءِ رضي الله عنه: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَحْسَنَ النَّاسِ وَجْهاً وَأَحْسَنَهُمْ خُلُقاً﴾رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ لە هەموو مرۆڤێك ڕووی جوانتر بوو، لە هەموو مرۆڤێك ڕەوشتی جوانتر بوو.

جا وشەی (النَّاس) پێغەمبەرانیش-عليهم الصلاة والسلام- دەگرێتەوە، بۆیێ دەفەرموێ: (وَلَمْ يدانُوهُ) پێغەمبەران-صلى الله عليهم اجمعين- هەر چەند هەموویان گەورەو ڕێزدارن، بەلاَم لە پلەی پێغەمبەرﷺ نزیك نابنەوەو نایگەنێ (فِي عِلْمٍ) نە لە زانستو (وَلاَ كَرَمٍ) نە لە بەخشندەیی و نە لە ڕەوشتەکانی‌تریش.

جا ئەوەش دانانی خوایەو خوا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ البقرة: ٢٥٣، ئەو پێغەمبەرانە-صلى الله عليهم اجمعين- هەندێکمان لە هەندێکیان گەورەتر کردون.

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ...﴾الحديث رواه البخاری ومسلم، پێغەمبەر لە هەموو خەڵك بەخشندەتر=سەخی‌تر بوو.

جا ئاگادار بە: باسی زانستی‌پێغەمبەرﷺ، لە باسی(وَمِنْ عُلُومِكَ عِلْمُ اللَّوْحِ وَالْقَلَمِ) ڕوون دەکەینەوە إن شاء الله تعالى.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصيري) لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا فەرمووی: پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام- ناگەنە پلەی پێغەمبەرﷺ لە زانستدا. ئەم جارە ئەوەمان بۆ باس دەکا: کە پێغەمبەران-عليهم الصلاة و السلام- پێویستییان بە زانستی پێغەمبەرﷺ هەیەو دەفەرموێ: (وَكُلُّهُمْ) هەموو پێغەمبەران-عليهم الصلاة و السلام- (مِنْ رَسُولِ اللهِ مُلْتَمِسٌ) لە پێغەمبەری خوا —مُحَمَّدﷺ— تکا دەکەن و وەردەگرن (غَرْفاً) کۆلمێك (مِنَ الْبَحْرِ) لە دەریای زانستی پێغەمبەرﷺ (أَوْ رَشْفاً) یان قومێك (مِنَ الدِّيَمِ) لە بارانە بەردەوامەکەی پێغەمبەرﷺ کە ڕەوشتە جوانەکانی پێغەمبەرەﷺ.

واتە: هەر پێغەمبەرێك-صلى الله عليهم- بە ئەندازەیەك پێویستی بە زانستی پێغەمبەرﷺ هەیە لە ڕۆژی قیامەت، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿يَجِيءُ النَّبِيُّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمَعَهُ الرَّجُلُ، وَيَجِيءُ النَّبِيُّ وَمَعَهُ الرَّجُلاَنِ، وَيَجِيءُ النَّبِيُّ وَمَعَهُ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ، فَيُدْعَى قَوْمُهُ فَيُقَالُ لَهُمْ: أَبَلَّغَكُمْ هَذا؟ فَيَقُولُونَ: لا. فَيُقَالُ لِلنَّبِيِّ: أَبَلَّغْتَهُمْ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ. فَيُقَالُ لَهُ: مَنْ يَشْهَدُ لَكَ؟ فَيَقُولُ: مُحَمَّدٌﷺ وَأُمَّتُهُ. فَيَشْهَدُونَ: أَنَّهُ قَدْ بَلَّغَ. فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا)

البقره:١٤٣﴾ حديث صحيح، رواه الإمام أحمد والنسائي، له رۆژی قیامەت پێغەمبەری وا هەیە: کـە دێتە مەیدانی مەحشەر، تەنها یەك پیاوی لەگەڵدایە، هەیە: تەنها دوو پیاوی لەگەڵدانە. هەیە: زیاتری لەگەڵدانە، جا ئوممەتی پێغەمبەرەکە بانگ دەکرێن و پێیان دەگوترێ: ئایـا ئەم پێغەمبەرە ئایینی خوای بە ئێوە ڕاگەیاند؟ ئەوانیش دەڵێن: نـا. جـا بـە پێغەمبەرەکـە دەگوترێ: ئایا ئایینی خـوات بـە ئوممەتەکـەت ڕاگەیانـد؟ پێغەمبەرەکـەش دەفـەرموێ: بەڵێ. جا پێی دەگوترێ: کێ شـاهیدی بـۆ تـۆ دەدا کـە ڕاتگەیانـدوە؟ پێغەمبەرەکـە دەفەرموێ: (مُحَمَّد)و ئوممەتەکەی شاهێدیم بۆ دەدەن. جا شـاهیدیی بـۆ دەدەن: کـە ئەم پێغەمبەرە ئایینی خوای بە ئوممەتەکەی ڕاگەیاندوە. جا ئەمە مەبەستی ئایەتەکەیە، کـە خوای گەورە لەبارەی ئوممەتی (مُحَمَّـد)ﷺ دەفـەرموێ: (هـەروەك ئێوەمـان کردۆتـە موسوڵمان، ئەوهاش ئێوەمان کردۆتە ئوممەتێکی دادپەروەر، تـا ببنـە شـاهید لـە سـەر ئوممەتەکانیتر، هەم پێغەمبەریشﷺ لە سەر ئێوە ببێتە شاهید.

مەبەست ئەوەیە: پێغەمبەرﷺ زانستیڕابردوو و داهـاتووی لـە لایـە، بۆیێ شـاهیدی دەدا، چونکە ئەگەر کەسێك زانستی بە شتێك نەبێ، ناتوانێ شاهیدی لەبارەی بدا.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)یڕابـردوودا باسـی کـرد: پێغەمبـەران-صلى الله عليهم اجمعين- لە قیامەتدا پێویست بە زانستی پێغەمبەرن ﷺ، ئەم جارەش ئەوەمان بـۆ بـاس دەکا: کە پێغەمبەرﷺ پێشەوای هەموویانەو دەفەرموێ:

**(وَوَاقِفُـونَ)** پێغەمبـــەران-عليهم الصلاة والسلام- هـــەموویان ڕادەوەســـتن **(لَدَيْـهِ)** لـــە لای پێغەمبـــەرﷺ **(عِنْـدَ حَـدِّهِمِ)** لـــە کـــن پلـــەو ســـنووری خۆیـــان **(مِـنْ نُقْطَـةِ الْعِلْـمِ)** سنوورەکەشـیان نوختەیـەکی زانسـتی پێغەمبـەرەﷺ **(أَوْ مِـنْ شَـكْلَةِ الْحِكَـمِ)** یـان سەر و بۆر و ژێرێکی کارلەجێیی پێغەمبەرەﷺ.

جا لە بـەر ئـەوەی خـوای گـەورە زانسـتی پێغەمبـەریﷺ زیـاتر کـردوە لـە زانسـتی پێغەمبەرەکانیتر-عليهم الصلاة و السلام-، بۆیێ لە شەوی (مِعْرَاج) لە (الْمَسْجِدِ الأَقْصَـى)دا هـەر یەکەیان لە سنوری خۆیدا ڕاوەستا و پێغەمبەرﷺ پێشنوێژیی بۆ کـردن، هـەروەك لە قیامەتیش پێغەمبەرﷺ دەبێتـە پێشـەوای ئـەوان و لـە بـن ئـاڵای پێغەمبـەرداﷺ ڕادەوەستن، پێغەمبەرﷺ فەرمویـەتی: ﴿إِذا كانَ يَوْمُ الْقِيامَةِ كُنْـتُ إِمـامَ النَّبِـيِّينَ وَخَطِيبَهُمْ وَصاحِبَ شَفاعَتِهِمْ غَيْرَ فَخْرٍ﴾حديث صحيح رواه الإمام أحمد والترمذي، کـە ڕۆژی

قیـمەت هات، من دەبمـە پێشـەوای پێغەمبـەران، دەبمـە وتـارخوێنی پێغەمبـەران، دەبمـە حاوەنی شەفاعەتی پێغەمبەران، بێ شانازی.

ـە حەدیسێکی‌تـردا پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ﴿أَنَا سَيِّدُ وَلَد آدَمَ يَوْمَ الْقِيامَةِ وَلا فَخْرَ، وبِيدي لِواءُ الْحَمْدِ وَلا فَخْرَ، وَما مِنْ نَبِيٍّ يَوْمَئِذ آدَمَ فَمَنْ سِواهُ الاّ تَحْتَ لِـــوائِي...﴾ رواه لترمذي بسند حسن، من گەورەی نەتەوەی باب (آدَم)م لـە ڕۆژی قیامەتـدا، بـە شـانازی وا نالّیم، ئالاّی سوپاس تەنها لە دەست مندایە، بە شانازی وا نالّیم، هەر پێغەمبـەرێك هەیـە ـە ڕۆژی قیامەتدا—باب (آدَم)و ئەوانی‌تریش-عليهم الصلاة و السلام- گشتی لە بن ئالاّی منن.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) باسی گەورەیی پێغەمبـەریﷺ کرد، ئـەم جـارە باسـی ئەوەمان بۆ دەکا: کە ڕەوشتە جوانەکانیشی هەموویان تەواون‌و دەفەرموێ:

(فهُوَ الَّذِى) پێغەمبەرﷺ ئـەو جـۆرە پێغەمبەرەیـە: کـە (تَمَّ مَعْنـاهُ) واتەکـەی تـەواو بـووەو هـەم (وَصُـورَتُهُ) وێنەکەیشـی تـەواو بـووە، واتـە: ڕەوشـتەکانی پـەنهانی‌و ئاشـکرایی‌و دەروون پـاکی‌و ڕێـك‌و پێکـی جەسـتەیی پێغەمبـەرﷺ گشـتی تـەواوەو ناتەواوی‌ی نیە، چونکە پێغەمبەرﷺ بەخۆی فەرمویەتی: ﴿إِنَّما بُعِثْتُ لِـأُتَمِّمَ مَكـــارِمَ الأَخْلاَقِ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والبيهقي واللفظ لَهُ، من هەر بۆ ئەوە کراومە پێغەمبەر تاکو ڕەوشتە ڕێزدارەکان لە ئیسلامدا تەواو بکەم.

(ثُمَّ) ئینجا سەرەڕای ئەوەی پێغەمبەرﷺ ڕەوشتە بەرزەکانی تـەواون، پلـەو پایـەی زۆر بەرزتریشـی لـە لای خـوا هەیـە: چـونکە (اصْـطَفَاهُ حَبِيبـاً) لـە نـاو هـەموو دروسـتکراوێکی خـۆی هەڵیبـژارد و کردیـە خۆشەویسـتی خـۆی (بـارِئُ النَّسَـمِ) ئـەو خوایەی دروستکاری گیانەکانی گیانلەبەرانە، پێغەمبـەر فەرمویـەتی: ﴿إِنَّ اللهَ اتَّخَذَنِي خَلِيلاً كَما اتَّخَذَ إِبْراهِيمَ خَلِيلاً﴾ رواه مسلم، خوای گەورە منی کردۆتـە دۆسـتی خـۆی، هـەروەکو (إِبْـراهِيم) پێغەمبـەریﷺ کردۆتـە دۆسـتی خـۆی. بێگومـان دۆسـتایەتی بەرزترین پلەی خۆشویستنە.

ئینجا لەوانە کەسێك بڵێ: خۆ پێغەمبەرەکانی‌تریش-عليهم الصلاة و السلام- هـەموویان جەسـتەو ڕەوشتیان جوان‌و تـەواوە. جـا بێگومـان: ئـەوەش گۆتەیـەکی ڕاسـتە، بـەڵام لـە بـەر ئەوەی پێغەمبـەرەکانی‌تـر-عليهم الصلاة و السلام- ناگەنـە پلـەی پێغەمبـەرﷺ، بـۆیێ ئیمـامی (الْبُوصِيرِي) دەفەرموێ:

مُنَزَّهٌ عَنْ شَــرِيكٍ فِى مَحاسِـــنه (٤٢) فَجَوْهَرُ الْحُـسْنِ فيه غَيْرُ مُنْقَـــسِمِ
دَعْ ما ادَّعَتْهُ النَّصارَى فِى نَبِيِّهِمِ (٤٣) وَاحْكُمْ بِما شِئْتَ مَدْحاً فيه وَاحْتَكِمِ

(مُنَزَّهٌ) پێغەمبەرﷺ دوورە (عَنْ شَرِيكٍ) لەوەی کە هاوبەشی هەبێ (فِى مَحاسِنه) لە جوانیەکانی جەستەیی‌و ڕەوشتی، واتە: هەر چەند پێغەمبەرەکانی‌تریش-علیهم الصلاة والسلام- جوانی جەستەیی‌و ڕەوشتییان هەیەو ئەوانیش پێغەمبەرن، بەڵام: نە لە ئەندازەی ئەو جوانیانەو نە لە پلەی پێغەمبەرایەتی ناگەنە پێغەمبەرﷺ، هەروەك لە حەدیسەکەی‌ڕابردوودا (البراء) فەرمووی: ﴿كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَحْسَنَ النّاسِ وَجْهـاً وَأَحْسَنَهُمْ خُلُقاً﴾رواه البخاري ومسلم، پێغەمبەرﷺ لە هەموو مرۆڤێك ڕووی جوانتر بوو و لە هەموو مرۆڤێك ڕەوشتی جوانتر بوو.

کەوابوو: (فَجَوْهَرُ الْحُسْنِ) گەوهەری جوانی‌و پلەی پێغەمبەرایەتی (فِيهِ) لە پێغەمبەرداﷺ (غَيْرُ مُنْقَسِمِ) دابەش نابێ‌و قبوڵی هاوبەشی ناکا، چونکە هەندێك تایبەتی هەنە، خوای گەورە داویەتیە پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەرەکانی‌تر هاوبەشی‌ی ناکەن، وەك: (مِعْراج)و (قورئان)و (ترسانی دوژمن لە دوری مانگێك)و (شەفاعەتە گەورەکەی قیامەت)و (وەستانی پێغەمبەران-علیهم الصلاة والسلام- لە بن ئاڵای ئەودا)و چەند تایبەتمەندیەکی‌تر لە دونیا و لە قیامەتدا کە گشتی حەدیسی (صحیح)ی لەبارە هاتووەو لە بەر درێژی نەمنووسین.

ئینجا کە لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا ئیمامی (البُوصِيري) فەرمووی: پێغەمبەرﷺ لە جوانیەکانی‌دا هاوبەشی نیە. بیری لەوە کردەوە نەزانێك وا تێبگا دروست بێ: لە مەدحکردندا پێغەمبەرﷺ بەرز بکرێتەوە بۆ پلەی خوایەتی-نعوذ بالله-.جا ئەم تێگەیشتنە هەڵەیەی ڕەد کردەوەو فەرمووی:

(دَعْ) واز بێنە بەو گوتەیە مەدحی پێغەمبەرﷺ مەکە: کە (مَا ادَّعَتْهُ النَّصَارَى) گاورەکان= دیانەکان بە ناهەق دەیانگوت (فِى نَبِيِّهِمْ) لە مەدحی حەزرەتی (عیسَى)ی پێغەمبەری خۆیانﷺ کە دەیانگوت: (عیسَى) کوڕی خوایە.

کەوابوو: نابێ لە مەدحی پێغەمبەرداﷺ لە سنور تێپەڕین‌و بەرزی بکەینەوە بۆ پلەی خوایەتی، چونکە مرۆڤ بەوە کافر دەبێ، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿لا تُطْرُونِى كَما أَطْرَتِ النَّصارَى ابْنَ مَرْيَمَ، فَإِنَّما أَنَا عَبْدٌ، فَقُولُوا: عَبْدُاللهِ وَرَسُـولُهُ﴾ رواه البخاري، لە سنووری خۆم گەورەترم مەکەن وەکو گاوروەکان حەزرەتی (عیسی

ـن مرْيَم)یانﷺ له سنوری‌خۆی گەورەتر کرد و گوتیان: کوڕی خوایە. من بەنـدەی حوام، کەوابوو: پێم بلێن: بەندەی خوا و پێغەمبەری خوا.

جا ئەگەر لە مەدحکردندا پێغەمبەرﷺ بەرز نەکەیەوە بۆ پلەی خوایـەتی، ئـەو کاتـە (واحْكُمْ) بڕیار بدە (بما شئْتَ) بە دروسـتی هـەر باسـکردنێکی خـۆت حـەز دەکـەی (مدْحاً) لـە ڕووی مەدحـەوە (فیـه) لـەبارەی پێغەمبـەرﷺ، واتـە: جگـە لـە پلـەی خوایەتی، بە هەر باسکردنێك مەدحی پێغەمبـەرﷺ دەکـەی، ئـەوە دروسـتەو بیکـە، بەڵام (واحْتَكِمِ) لە مەدحکردندا ژیر و کارلەجێ بە، بە قسەی سوكو نەشیاو مـەدحی پێغەمبەرﷺ مەکەو گوتەی نەشیاو مەڵێ.

ئینجا کە لە (بَیْت)ی‌ڕابردوودا ئیمامی(البُوصیري) فەرمووی: لە مەدحی پێغەمبەرﷺ گوتەی دیانەکان مەڵێ، جا هەر چۆنێك حەز دەکەی مەدحی پێغەمبەرﷺ بکـە. ئـەم جارە بۆ بەهێزکردنی فەرموودەکەی، دووبارە دەفەرموێ:

(وانْسُبْ إلـى ذاتـه) لـە مـەدحکردنی پێغەمبـەرداﷺ نیسـبەت بـدە پـاڵ جەسـتەی پێغەمبەرﷺ (ماشئْتَ) هەر مـەدحێکی حـەز دەکـەی (مِنْ شَرَفٍ) لـە پایەبـەرزیو ڕێزداری، چونکە جەستەی پێغەمبـەرﷺ لـە جەسـتەی گشـت مرۆڤێکـی‌تـر جـوانتر و ڕێـكوپێکترە (وَ) هـەروەها (انْسُبْ إلـى قَدْرِه) نیسـبەت بـدە پـاڵ پلـە بەرزەکـەی پێغەمبـەرﷺ (ماشئْتَ) هـەر مـەدحێکی حـەز دەکـەی (مِنْ عِظَمٍ) لـە سـیفەتە گـەورەکان، چـونکە هـیچ مرۆڤێـك لـە سـیفەتە بـەرز و ڕێزدارەکانـدا ناگاتـە پلـەی پێغەمبەرﷺ.

جا بۆ سەلماندنی ئەم فەرموودەیە، ئایەتی ﴿وإنَّـك لعلـى خُلُـقٍ عظـيم﴾القلم:٤، دێنینەوە، واتە: -ئەی پێغەمبەرﷺ- بەڕاستی تۆ لە سەر ڕەوشتێکی گەورەی.

جگە لەمەش: حەزرەتی (ابن عباس)-رضی‌الله عنهما- فەرمویـەتی: (خـوای گـەورە بـە دوو ناوی خۆی ناوی لە پێغەمبەرﷺ ناوە).

ئیمام (الحسین بن الفضل)ش فەرمویەتی: جگە لە پێغەمبەرﷺ خوای گەورە بۆ هیچ پێغەمبەرێکی‌تر دوو ناوی خۆی کۆ نەکردۆتەوە، خوای گەورە دەرهەق پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿بالْمُؤْمنين رَءُوفٌ رحـيمٌ﴾التوبة: ١٢٨، پێغەمبـەرﷺ لەگـەڵ ئیمانـداران بەبەزەیی‌و میهرەبانە.

واتە: ئەو دوو ناوانە هەردووکیان ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورەنـە، هـەروەك خـوای گەورە دەفـەرموێ: ﴿إنَّ اللهَ بالنَّاسِ لَرءُوفٌ رَحيمٌ﴾البقرة:١٤٣، خـوای گـەورە لەگـەڵ خەڵکی بە بەزەیی‌و میهرەبانە. بڕوانە تەفسیرەکانی (زاد المسیر)و (القرطبي).

جـا لەوانەیـە کەسـێك بڵـێ: ئەگـەر لـە مـەدحی پێغەمبـەردا ﷺ گوتـەی دیانـەکان= گاورەکانیش نەڵێی، تۆ ناتوانی لە مەدحی پێغەمبەردا ﷺ بێ‌سنوور مەدحی بکەی؟

جا ئیمامی (البُوصيري) ئەم بۆچوونە ڕەد دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(**فَإنَّ فَضْلَ رَسُولِ الله**) چـونکە گـەورەیی پێغەمبـەر ﷺ، واتـە: جگـە لـە گوتـەی دیانەکان –کە پلەی خوایەتی‌یە– بە هەموو مەدحێکی‌تر مەدحی پێغەمبـەر ﷺ بکـە، چونکە گەورەیی پێغەمبەر ﷺ (**لَيسَ لَهُ حَدٌّ**) سنوورێکی وەهـای نیـە: کـە (**فَيُعْرِبَ عَنْهُ ناطِقٌ**) بەندەیەکی گۆیندە بتـوانێ مەدحەکـەی بـە تـەواوی بڵـێ‌و ئاشـکرای بکـا (**بِفَمٍ**) بە هیچ زوبانێك.

واتە: جگە لە خوای‌گەورە هیچ کەسێك سنووری گەورەیی پێغەمبەر ﷺ نازانێ، بۆیە هیچ مرۆڤێك ناتوانی بە تەواوی مەدحی پێغەمبەر ﷺ بکا.

بەڵێ، چـۆن ئێمـە دەتـوانین گـەورەیی پێغەمبـەر ﷺ سـنووردار بکـەین، لـە کاتێکدا خـوای گـەورە نـاوی ئـەوی لەگـەڵ نـاوی خـۆیدا دەڵـێ، خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿وَرَفَعْنا لَكَ ذِكْرَكَ﴾سورةالشرح:٤، ئەی پێغەمبەر ﷺ ناوهێنانی تۆم بەرزکردۆتەوە.

پێغەمبەر ﷺ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرمویـەتی: ﴿قال اللهُ تعـالى: إذا ذُكِـرْتُ ذُكِرْتَ معـي﴾حدیث صحیح رواه الإمام الطبري وابن جریر وصححه ابنُ حبّان، خـوای گـەورە دەفەرموێ: هەر کاتێك ناوی من بگوترێ، ناوی تۆش–ئەی پێغەمبەر ﷺ–لەگەڵ مـن دەگوترێ.

جـا لـەم بارەیـەوە، شـاعیری پێغەمبـەر ﷺ حـەزرەتی (حسّـان بـن ثابـت) رضي الله عنه فەرمویەتی:

وضَمَّ الإلهُ اسْمَ النَّبيِّ ﷺ إلى اسْمه * إذْ قالَ في الخَمْسِ الْمُؤَذِّنُ: أشْـــهَـــدُ
وشَـــقَّ لهُ منْ اسْـــمه لِيُجـــــلَّهُ * فذُو العَرْشِ مَحْمُودٌ وَهذا مُحَـــمَّدُ ﷺ

خوای گەورە ناوی پێغەمبەری وەگەڵ ناوی خۆی داوە، ئەو کاتەی بانگـدەر لـە هـەر پێنج نوێژەکاندا دەڵێ: (أشْهَدُ أنْ لاَ اِلهَ اِلاَّ اللهُ، أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ).

خوای گەورە–بۆ پێغەمبەرﷺ– ناوێکی لە ناوی خۆی دەرهێناوە، چونکە خودای خاوەن (عَرْش) سوپاسکراوە، پێغەمبەریشﷺ سوپاسکراوە.

واتە: لە ڕۆژی قیامەت پێغەمبەرﷺ سوپاسی دەکرێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿فَيَوْمَئِذٍ يَبْعَثُهُ اللهُ مَقَامًا مَحْمُودًا يَحْمَدُهُ أَهْلُ الْجَمْعِ كُلُّهُمْ﴾رواه البخاري في الزكاة. جا لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە پێغەمبەری خۆی–مُحَمَّدﷺ– ئەباتە شوێنێکی سوپاسکراو کە خەڵکی مەحشەر بە تێکڕایی سوپاسی ئەکەن.

جا کە ئیمامی (البُوصيري) لە (بَيْت)ی ڕابردوودا فەرمووی: گەورەیی پێغەمبەرﷺ سنورێکی وەهای نیە: کەسێك بتوانێ بە تەواوی مەدحی بکا. ئەم جارە باسی ئەوە دەکا: کە (مُعْجِزَة)کان و نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرﷺ ناگەنە گەورەیی پێغەمبەرﷺ، جا دەفەرموێ:

**(لَوْ ناسَبَتْ قَدْرَهُ)** ئەگەر هاوێنە بووانە لەگەڵ گەورەیی پێغەمبەرﷺ **(آياتُهُ)** نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی‌ی کە ئەو (مُعْجِزَة)نە: خوای گەورە لە سەر دەستی وی هێنایە جێ، جگە لە (مِعْراج)و قورئانی پیرۆز **(عِظَماً)** لە گەورەییدا.

واتە: ئەگەر (مُعْجِزَة)کانی پێغەمبەرﷺ –جگە لە (مِعْراج)و قورئانی پیرۆز – لە گەورەییدا وەك گەورەیی پێغەمبەرﷺ بووانە، ئەو کاتە **(أَحْيَا اسْمُهُ)** ناوهێنانی پێغەمبەرﷺ زیندووی دەکردەوە **(حِينَ يُدْعَى)** لەو کاتەی کەسێك بە خاتری وی لە خوای گەورە دەپاڕاوە: تا زیندوو بکاتەوە **(دارِسَ الرِّمَمِ)** ئەو ئێسقانە ڕزیوانەی وردو خاش بوینە.

واتە: خوای گەورە ئەو جۆرە (مُعْجِزَة)ی نەداوەتە پێغەمبەرﷺ: کە ئەگەر (تَوَسُّل) بە ناوی وی بکرێو تکا لە خوا بکرێ، خودا مردووێك زیندوو بکاتەوە.

جا هەرچەند ئەو (مُعْجِزَة)ی نەدراوەتێ، بەڵام خوای گەورە ئەو (كَرامَة)ی داوەتە پیاوچاکانی ئۆممەتی پێغەمبەرﷺ: کە بە دوعاکردن و پاڕانەوەی ئەوان، خوای گەورە مردوو زیندوو بکاتەوە: هەم لە سەردەمی پێغەمبەر وﷺ، هەم لە دوای وەفاتیشی، جا ئەو (كَرامَة)ی ئۆممەتیش دەبێتە (مُعْجِزَة) بۆ پێغەمبەرﷺو دەبێتە نیشانەی ڕاستی ئایینەکەی، هەروەك زانایانی (العقيدة) فەرموویانە.

حەزرەتی (أنَس)ی خزمەتکاری پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە: ﴿لە سەردەمی

پێغەمبەردا ﷺ کوڕی پیرەژنێکی موسوڵمان وەفاتی کرد. جا پیرەژنەکە لە خوا پاڕاوەو گوتی: خودایە، من موسوڵمان بویمەو کۆچم کردوە بۆلای پێغەمبەرەکەت ﷺ، خودایە، ئەم موسیبەتەم لێ بار مەکە. جا یەکسەر کوڕەکەی زیندوو بۆوەو خواردنیشمان لەگەڵی خوارد﴾ ئیمامی (البیهقی) گێراویەتیەوەو ئیمامی (ابن کثیر)ش فەرمویەتی: بإسناد رجاله ثقات، لكن فيه انقطاع.

هەروەها: ﴿لە سەردەمی ئیمامی (عُمر)دا ﷺ پیاوێك لە (یَمَنْ)ـەوە بەرەو (مَدینَة)ی پیرۆز- هات تاکو بچێتە غەزا، جا لە رێگەدا کەرەکەی= گوێدرێژەکەی مرد، جا لە خوا پاڕاوەو گوتی: خودایە من بۆ ئەوە هاتوم لە رێگەی تۆ غەزا بکەم، خودایە لێت دەپاڕێمەوە گوێدرێژەکەم زیندوو بکەوە. جا یەکسەر کەرەکەی زیندوو بۆوە﴾ ئیمامی (البیهقی بإسناد صحیح) گێراویەتیەوە، ئیمام (ابن کثیر)ش -لە (البدایة والنهایة) لە باسی (مُعْجِزَة)کانی پێغەمبەر ﷺ -ئەو دوو (کرامة)ی گێراونەوە.

جا کە ئیمامی (البُوصیري) فەرمووی: گەورەیی پێغەمبەر ﷺ سنوورێکی وەهای نیە ئێمە بیزانین و لە (مُعْجِزَة)کانیشی گەورەترە. لەوانەیە یەکێك وا تێبگا: بە هۆی ئەو گەورەییە پێغەمبەر ﷺ گوێ ناداتە ئوممەتی خۆی و شەریعەتێکی توندو بەهێزیان بەسەردا دەسەپێنێ؟ جا ئەم تێگەیشتنە رەد دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(لَمْ يَمْتَحِنَّا) پێغەمبەر ﷺ ئێمەی تاقی نەکردۆتەوە (بِما) بە داواکردنی ئەنجامدانی شەریعەتێکی وەها: کە (تَعْيَا) بێتوانا ببێ (الْعُقُولُ) تێگەیشتنەکانی ئێمە (بِه) بە هۆی ئەو شەریعەتە، بەڵکو داوای شەریعەتێکی ئاسانی لە ئێمەکردوەو توانای ئەنجامدانیشمان هەیە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ﴿بُعِثْتُ بِالْحَنِيفِيَّةِ السَّمْحَةِ﴾ حديث حسن رواه الإمام أحمد والطبراني، من لە لای خوا نێردراوم بە شەریعەتێکی یەکخواپەرستی و ئاسان.

جا کە پێغەمبەر ﷺ شەریعەتێکی ئاسانی بۆ ئێمە هێناوە (حِرْصاً) لە بەر ئەوەیە بایەخی بە ئێمە داوەو سوورە (عَلَيْنا) لە سەر بەختەوەری و سەرفرازی ئێمە، کەوابوو: (فَلَمْ نَرْتَبْ) ئێمە نەکەوتینە گومان لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، هەم (وَلَمْ نَهِمِ) سەرمان لێ نەشێوا، چونکە ئایینی پێغەمبەر ﷺ ئایینێکی ڕوون و ئاشکرایە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ﴿قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ، لَيْلُها كَنَهارِها﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد وابن ماجه، من ئێوەم هێشتۆتەوە لە سەر شەریعەتێکی

أَعْيَا الْوَرَى فَهْمُ مَعْنَاهُ فَلَيْسَ يُرَى (٤٨) لِلْقُرْبِ وَالْبُعْدِ مِنْهُ غَيْرُ مُنْفَحِمِ
كَالشَّمْسِ تَظْهَرُ لِلْعَيْنَيْنِ مِنْ بُعُدٍ (٤٩) صَغِيرَةً وَتُكِلُّ الطَّرْفَ مِنْ أَمَمِ

سیو ئاشکرا، شەوەکەی وەکو ڕۆژەکەیەتی.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی ڕابردوودا فەرمووی: پێغەمبەرﷺ شەریعەتێکی ئاسانی بۆ ئێمە هێناوەو گومان نیە. لەوانەیە کەسێك وا تێبگا: تێگەیشتن و زانینی گەورەیی پێغەمبەرﷺ وەکو شەریعەتەکەی ئاسانە. جا ئەم تێگەیشتنە ڕەد دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(أَعْيَا الْوَرَى) خەڵکی بێتوانا کردوە (فَهْمُ مَعْنَاهُ) تێگەیشتنی واتەی گەورەیی پێغەمبەرﷺ، واتە: خەڵك ناتوانێ لە واتەی گەورەیی پێغەمبەرﷺ تێبگا، چونکە ئەو نهێنیی و تایبەتیانەی خوای گەورە داویەتیە پێغەمبەرﷺ، نەیداوەتە پێغەمبەرەکانی تر -عليهم الصلاة و السلام-. بەڵکو لە پێش دروستکردنی هەموو پێغەمبەران -عليهم الصلاة والسلام- ئەوی کردۆتە پێغەمبەرﷺ، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إِنِّي عِنْدَ اللهِ لَخَاتَمُ النَّبِيِّينَ، وَإِنَّ آدَمَ لَمُنْجَدِلٌ فِي طِينَتِهِ﴾ وفي رواية: ﴿وَآدَمُ بَيْنَ الرُّوحِ وَالْجَسَدِ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والبيهقي، من لە لای خوا کۆتایی پێغەمبەران بوم هێشتا باب (آدم)ﷺ لە لاشە قوڕەکەیدا بوو و گیانی نەهاتبووە ناو لاشەکەی.

جا لە بەر ئەوەی خەڵك لە گەورەیی پێغەمبەرﷺ تێناگا، بۆیێ (فَلَيْسَ يُرَى) نادیترێ (لِلْقُرْبِ) لە حاڵەتی نزیکیو (وَالْبُعْدِ) لە حاڵەتی دوری (مِنْهُ) لە پێغەمبەرﷺ (غَيْرُ مُنْفَحِمِ) جگە لە بینەرێکی بێدەنگبوو.

واتە: هەر کەسێك لە دورەوە، یان لە نزیکەوە پێغەمبەرﷺ ببینێ، ئەوە تەنها بێدەنگبوونی بۆ دەمێنێتەوەو لە واتەی گەورەیی پێغەمبەرﷺ تێناگا، چونکە ناتوانێ بە تەواوی تەماشای پێغەمبەرﷺ بکا ﴿عَنْ عُرْوَةَ رضي الله عنه فِي حَدِيثِ الْحُدَيْبِيَةِ: ...وَمَا يُحِدُّونَ النَّظَرَ إِلَيْهِ تَعْظِيماً لَهُ﴾ رواه البخاري، (صَحابَة)کان بە تەواوی تەماشای پێغەمبەریانﷺ نەدەکرد، لە بەر گەورەیی پێغەمبەرﷺ.

ئینجا لەوانەیە کەسێك بڵێ: چۆن نە لە دور و نە لە نزیك مرۆڤ ناتوانێ بە تەواوی تەماشای پێغەمبەرﷺ بکا و لێی تێبگا؟ جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

(كَالشَّمْسِ) پێغەمبەرﷺ وەکو ڕۆژ وایە (تَظْهَرُ) ڕۆژ کە وەدەردەکەوێ (لِلْعَيْنَيْنِ)

له چاوەكانى خەڵك (مِنْ بُعْدٍ) له دوورەوه (صَغِيرَةً) به بچوكى وەدەردەكەوێ، بەڵام (وتُكِلُّ الطَّرْفَ) ڕۆژ چاوى تەماشاكەرەكە بێهێز و بێتوانا دەكا (مِنْ أَمَمٍ) له نزيكەوە، چونكە تيشكەكەى زۆر بەهێزە، بۆيێ حەزرەتى (اَلرُّبَيِّع بِنْت معوّذ) له مەدحى پێغەمبەرداﷺ فەرمويەتى: ﴿لَوْ رَأَيْتَ الشَّمْسَ طالعةً﴾ رواه الطبراني في الكبير والأوسط بسند موثوق، ئەگەر ڕۆژ له كاتى هەڵاتندا ببينى، پێغەمبەرﷺ ئەوها بوو.

هەروەها حەزرەتى (أَبُوهُرَيْرَةَ)ﷺ فەرمويەتى: ﴿مَا رَأَيْتُ شَيْئاً أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللهِﷺ كَأَنَّ الشَّمْسَ تَجْرِى فِى وَجْهِهِ﴾ رواه الإمام أحمد والترمذي، وقال: حديث غريب، هيچ شتێكم نەديتووە له پێغەمبەرﷺ جوانتر بێ، وەك ڕۆژ به ناو ڕووىدا بڕوا، ئەوها بوو.

هەر لەم بابەتەش شێخ (مَعْرُوف)ى نۆدەهى له (قَطْر العارِض)دا فەرمويەتى:

(بَلْ كُلُّ مَنْ شاهَدَهُ بِعَيْنِهِ * حُجِبَ عَنْ إبْصارِ كُلِّ حُسْنِهِ)

بەڵكو هەر كەسێك به چاوى خۆى پێغەمبەرىﷺ ديتبا، ئەو كەسە قەدەغە دەكرا له ديتنى هەموو جوانيەكەى پێغەمبەرﷺ.

ئينجا كه ئيمامى (البُوصيرِي) له دوو (بَيْت)ىڕابردوودا فەرمووى: خەڵك بێتواناية له تێگەيشتنى گەورەيى پێغەمبەرﷺ. ئەم جارە ئەوەمان بۆ باس دەكا: ئەم تێنەگەيشتنە -تەنها- له دونيايە، نەك له قيامەت. جا دەفەرموێ:

(وَكَيْفَ يُدْرِكُ فِى الدُّنْيَا) چۆن له دونيادا به تەواوى تێدەگا (حَقِيقَتَهُ) له هەموو گەورەيى پێغەمبەرﷺ به ڕاستى و دروستى (قَوْمٌ نِيامٌ) كەسانێكى خەوتوو= بێئاگا، چونكه كەسانێك هەنه له دونيادا وەك مرۆڤى خەوتوو بێئاگانە، هەروەك ئيمامى (عَلِي)ﷺ فەرمويەتى: ﴿اَلنّاسُ نِيامٌ، فَإِذا ماتُوا انْتَبَهُوا﴾ خەڵك خەوتوونە، جا كاتێ مردن هەشيار دەبنەوە.

جا ئەو كەسانەى بێئاگانه (تَسَلَّوْا) قەناعەتيان كردوە (عَنْهُ) له ناسينى پێغەمبەرﷺ (بِالْحُلُم) به خەونەكانيان. واتە: كه له دونيادا كەسانێكى ئاگادار و نزيك له پێغەمبەرﷺ، به تەواوى له گەورەيى پێغەمبەرﷺ تێنەگەن، چۆن كەسانێكى بێئاگا -كه هەر به خەيالْ پێغەمبەريانﷺ ناسيوە- لێى تێدەگەن؟

بێگومان ئەم جۆرە كەسانە ناگەنە (صَحابَة)ى پێغەمبەرﷺ، ئەوجا (صَحابَة)شﷺ -به تەواوى- له گەورەيى پێغەمبەرﷺ تێنەگەيشتون؟ بەڵكو به هۆى شكۆمەندىى پێغەمبەرﷺ، (صَحابَة)شﷺ نەياندەتوانى به تەواوى تەماشاى بكەن- به بەڵگەى

هەرسێك حەدیسەكانی‌ڕابردوو- هـەم ﴿عَنْ أُسامَة بِنِ شَريك‌رضي الله عنه: كُنّا جُلُوساً عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، كَأنَّما عَلَى رُؤُوسنا الطَّيْر، ما يَتَكَلَّمُ مِنّا مُتَكَلِّمٌ...﴾ رواه الطبراني ورجالُه رجال الصحيح، ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوین، وەك باڵندە لـە سـەر سـەرمان بـێ. واتە: نەدەجولاین‌و هیچ كەسێك لە ئێمە قسەی نەدەكرد.

**جا بزانە:** لە قیامەتدا كە لە مەیدانی مەحشەردا هیچ پێغەمبەرێك ناتوانێ شـەفاعەت بكا. ئـەو كـات موسـوڵمانەكان‌و كافرەكـان ڕێـزداری‌و گـەورەیی پێغەمبـەریان ﷺ بـۆ دەركرا دەبێ‌و هەردوو تیـپ سوپاسـی دەكـەن، هـەروەك پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: «...فَيَشْفَعُ لِيُقْضَى بَيْنَ الْخَلْقِ، فَيَمْشِي حَتَّى يَأْخُذَ بِحَلَقَةِ الْبَابِ، فَيَوْمَئِذٍ يَبْعَثُهُ اللهُ مَقَامًا مَحْمُودًا يَحْمَدُهُ أَهْلُ الْجَمْعِ كُلُّهُمْ﴾رواه البخاري في‌الزكاة، جـا پێغەمبـەر ﷺ لـە لای خـوا تكایان بۆ ئەكا تا دەست بە دادكردن بكرێ، جا پێغەمبەر ﷺ دەڕوا تـا دەسـت بـە ئاڵقـەی دەرگای بەهەشتەوە ئـەگرێ، ئینجـا لـەم ڕۆژەدا خـوای گـەورە پێغەمبـەری خـۆی ئەباتـە شوێنێكی سوپاسكراو كە خەڵكی مەحشەر بە تێكڕایی سوپاسی ئەكەن. واتە: چونكە بـە بـێ جیاوازی لە لای خوا تكای بۆ كردون.

جا لەوانەیە كەسێك بڵێ: چۆن هیچ كەسـێك پێغەمبـەری ﷺ بـە تـەواوی نەناسـیوە؟ خۆ لە ئیسلامدا مرۆڤی زانـا و پلـە بـەرز زۆر هـەبون، جـا ئیمـامی (الْبُوصِـيرِي) وەڵام ئەداتەوەو دەفەرموێ:

(فَمَبْلَغُ الْعِلْمِ) كۆتـایی زانسـتی خـەڵك (فِيـهِ) لـەبارەی ناسـینی پێغەمبـەر ﷺ، هـەر ئەوەندەیە (أَنَّهُ بَشَرٌ) پێغەمبەر ﷺ ئادەمیزادە، واتە: (مَلائِكَة) نیەو ناشگاتە پلـەی خوایەتی، خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَـا بَشَـرٌ مِـثْلُكُمْ﴾الكهف:١١٠، ئـەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: من هەر ئادەمیزادێكم وەكو ئێوە.

(وَ) هەروەها (أَنَّهُ) پێغەمبەر ﷺ (خَيْرُ خَلْقِ اللهِ) چـاكتریی هـەموو دروسـتكراوێكی خوایە (كُلِّهِم) بە تێكڕایی، پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: ﴿إِنَّ اللهَ خَلَقَ الْخَلْقَ فَجَعَلَنِـي مِنْ خَيْرِهِمْ...﴾الحديث حسن، رواه الإمام أحمد والترمذي واللفظ له، بەڕاسـتی خـوای گـەورە بوونەوەری دروست كرد، جا منی كردە چاكترینی بوونەوەرەكان.

ئینجا كـە ئیمـامی (الْبُوصِـيرِي) فـەرمووی: پێغەمبـەر ﷺ چـاكترینی دروسـتكراوی خوایە. بێگومان ئەو بڕیارە وا ئەگەیێنێ: پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەرانیش-عليهم الصلاة و السلام- گەورەترە. جا ئەم بڕیارەش جێگیر دەكا و دەفەرموێ:

**(وَكُلُّ آيٍ)** گشت نیشانەیەکی پێغەمبەرایەتی: کە (مُعْجِزَة)یەو **(أَتَى الرُّسْلُ الْكِرامُ بِها)** پێغەمبەرە ڕێزدارەکان هێنابێتیان، ئەوانە **(فَإِنَّما اتَّصَلَتْ)** کە گەیشتونەتە ئەو پێغەمبەرانە، تەنها **(مِنْ نُورِهِ)** لە نوری ئایینی پێغەمبەرەوەﷺ **(بِهِمْ)** گەیشتونەتە ئەوان عليهم الصلاة والسلام، چونکە پێغەمبەرﷺ پێغەمبەری هەموو پێغەمبەرانو ئوممەتەکانیانە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ﴾ آل عمران:٨١، باسی ئەوە بکە کە خوای گەورە بەڵێنی لە پێغەمبەران -عليهم الصلاة والسلام- وەرگرت – هەرچەند زانستو پێغەمبەرایەتیم داوەتە ئێوە-: ئەگەر پێغەمبەرێکتان بۆ هات کە ناوی (مُحَمَّد)ەﷺ، ئەبێ ئیمانی پێبێنن و یارمەتیشی بدەن. 

ئیمام (عَلِي)و حەزرەتی (ابن عَبّاس)رضي الله عنهما لە تەفسیری ئایەتەکەدا فەرموویانە: (خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ، بەڵێنی لێ وەرگرتووە: ئەگەر ئەو زیندوو بووو و حەزرەتی (مُحَمَّد)ﷺ نێردرا بە پێغەمبەر، ئەبێ ئیمانی پێبێنێو یارمەتیشی بدا، هەم بەڵێنیش لە ئوممەتەکەی خۆی وەربگرێ: ئەگەر ئەوانیش زیندوو بونو حەزرەتی (مُحَمَّد)ﷺ کرایە پێغەمبەر، ئەبێ ئیمانی پێبێنن و یارمەتیی بدەن).

هەروەها پێغەمبەریشﷺ فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ مُوسَىﷺ كَانَ حَيًّا مَا وَسِعَهُ إِلاَّ أَنْ يَتَّبِعَنِي﴾ حسن بكثرة طرقه رواه الإمام أحمد والطبراني والبزار، سوێندم بەو خوایەی گیانی منی بە دەستە: ئەگەر (مُوسَى) پێغەمبەرﷺ زیندوو بوایە، هیچی پێنەدەکرا تەنها دەبوا شوێن من بکەوێ.

**جا بزانە:** بۆیێ فەرمووی: (اتَّصَلَتْ مِنْ نُورِهِ بِهِمْ) نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی لە نوری ئایینی پێغەمبەرەوەﷺ گەیشتۆتە پێغەمبەرەکانیتر -عليهم الصلاة والسلام- چونکە (مُعْجِزَة)ی پێغەمبەران -عليهم الصلاة والسلام- نیشانەی ڕاستگۆیی خۆیانو ڕاستیی ئایینەکەیانە، بنچینەی ئایینەکەی ئەوانیش خودی بنچینەی ئایینی پێغەمبەرەﷺ: کە (التَّوْحِيد)= یەکخواپەرستییە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾الأنبياء:٢٥، لە پێش تۆوە ئەی (مُحَمَّد)ﷺ هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێ، وەحیمان هەر بۆ ناردوە: کە جگە لە خۆم هیچ خوایەك نیە، کەوابوو: بمپەرستن.

بەڵام لە شەریعەتدا پێغەمبەران-علیهم الصلاة والسلام- جیاوازییان هەیە، هەروەك لە (بَیْت)ی داهاتوودا ئاماژەی بۆ كردوە.

ئینجا كە ئیمامی (البُوصیری) لە (بَیْت)ی‌ڕابردوودا ئاماژەی بۆ ئەوە كرد: كە پێغەمبەرﷺ پێغەمبەری هەموو پێغەمبەرانەو-علیهم الصلاة والسلام-پێش ئەوەی پێغەمبەرﷺ بێتە دونیا، ئەوان بەڵێنیان لێ وەرگیراوە: كە ئیمانی پێ‌بێنن‌و یارمەتی‌ی بدەن. جا ئەم جارە بە ڕێگەی (تَشْبِیه)=وێچواندن ئاماژە بۆ ئەوە دەكا: كە شەریعەتی پێغەمبەرﷺ شەریعەتی پێغەمبەرەكانی‌تری-علیهم الصلاة والسلام- (نَسْخ) كردۆتەوە، واتە: لایبردوە. جا دەفەرموێ:

(**فَإِنَّهُ**) پێغەمبەرﷺ (**شَمْسُ فَضْلٍ**) ڕۆژی گەورەیی‌یە، واتە: خوای گەورە لە گەورەیی خۆی ئەو پێغەمبەرەی‌ﷺ ناردوە: كە وەك ڕۆژ بە ئایینەكەی خۆی دونیا ڕۆناك دەكاتەوە (**هُمْ**) پێغەمبەرەكانی‌تریش-علیهم الصلاة والسلام- (**كَواكِبُها**) ئەستێرەكانی ئەو ڕۆژەن‌و ڕوناكی لەو ڕۆژە وەردەگرن، جا (**یُظْهِرْنَ أَنْوارَها**) ئەستێرەكان ڕوناكی خۆیان ئاشكرا دەكەن (**لِلْخَلْقِ**) بۆ بەندەكانی خوا (**فِي الظُّلَمِ**) لە تاریكیەكاندا: لەو كاتەی ڕۆژ لەو شوێنەدا هەبوونی نیە.

واتە: هەروەك لە تاریكی شەوی‌دا ئەستێرەكان ڕوناكی دەدەنە خەڵك، ئەوهاش: هەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەكان-علیهم الصلاة والسلام- لە تاریكی (كُفْر)دا ڕوناكی‌ی ئایین دەداتە گەلەكەی خۆی‌و ئەیانهێنێتە سەر ڕێگەی ڕاست.

هەروەها چۆن ئەگەر ڕۆژ دەربكەوێ، ئەستێرەكان لە بەرچاو ون دەبن، ئەوهاش: كە پێغەمبەرﷺ بووە پێغەمبەرﷺ، شەریعەتی گشت پێغەمبەران-علیهم الصلاة والسلام- بە شەریعەتی پێغەمبەرﷺ (نَسْخ) بۆوەو لابرا، خوای گەورە شەریعەتی وی كردە یاسایەكی سەرتاسەری‌ی بەردەوام لەم دونیایەدا، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ آل عمران:٨٥، هەر كەسێك جگە لە ئیسلام ئایینێكی‌تری بوێ–واتە: بە بەرنامەی خواپەرستی‌و ژیانی دابنێ– ئەوە لێ‌ی وەرناگیرێ‌و لە ڕۆژی دواییشدا لە زەرەرمەندەكانە.

جا ئەم (نَسْخ)=لابردنەش تەنها شەریعەت دەگرێتەوە، نەك بنچینەكانی ئایین، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿الأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ مِنْ عَلاَّتٍ وَأُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى، وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ﴾

رواهُ مُسلم، پێغەمبەران زرِ برای یەکترین دایکیان لێك جیایە، ئایینیان یەك ئایینە.

واتە: بنچینەی ئایینیان یەك بنچینەیە: کە یەکخواپەرستییە، بەڵام لە لقەکانی ئایینداا لێك جیانە. جا لەم بارەیەوە (عاجز) فەرمویەتی:

(نائب)ی وی بون (مُرْسَلین) * هەر یەك بۆ قەومێ داوەرین
ئەمما ئەوی بۆ (عالَمین) * بە عام هەنارد (غفّار)ی من

ئینجا کە ئیمامی (البُوصیري) لەچەند (بَیْت)ێکی ڕابردوودا مەدحی پێغەمبەری ﷺ کرد، هەست ئەکا: کە ناتوانێ مافی خۆی بداتێو بە تەواوی مەدحی بکا، بۆیێ سەرسوڕمانی خۆی ئاشکرا دەکا و دەفەرموێ:

(أَکْرِمْ) ئای جێگەی سەرسوڕمانە! ئەو ڕێزدارییەی (بِخَلْقِ نَبِيٍّ) خوای گەورە داویەتیە جەستەی ئەو پێغەمبەرەی ﷺ کە (زانَهُ) ئەو جەستەی جوانتر کردوە (خُلُقٌ) چەندەها ڕەوشتی جوان، کە خوای گەورە بەو ڕەوشتە جوانانە مەدحی کردوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾القلم: ٤، بەڕاستی ـئەی پێغەمبەر ﷺ ـ تۆ لە سەر ڕەوشتێکی گەورەی.

(بِالْحُسْنِ مُشْتَمِلٌ) پێغەمبەر ﷺ جوانی کردۆتە بەرگی خۆیو هەموو جەستەی خۆی بەو جوانیە پۆشیوە، واتە: هیچ جوانیەك نەماوە، پێغەمبەر ﷺ نەیدرابێتێ، بۆیێ پێغەمبەر ﷺ دوعای دەکرد و دەیفەرموو: ﴿اَللَّهُمَّ حَسَّنْتَ خَلْقِي فَحَسِّنْ خُلُقِي﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد و ابن حبان، خودایە جەستەی منت جوان کردوە، خودایە ڕەوشتیشم جوان بکە.

(بِالْبِشْرِ) پێغەمبەر ﷺ بە ڕووخۆشیو زەردەخەنەیی (مُتَّسِمِ) نیشانەدارە ﴿عَنْ جابر رضي الله عنه فِي صِفَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: رَأَيْتُ أَطْلَقَ النَّاسِ وَجْهاً وَأَكْثَرَهُمْ ضَحْكاً وَأَحْسَنَهُمْ بِشْراً﴾رواه البزار بسند حسن، من پێغەمبەرم ﷺ بینی: لە هەموو کەسێك ڕووکراوەتر بوو، لە هەموو کەسێك زەردەخەنەی زۆرتر بوو، لە هەموو کەسێك ڕووخۆشتر بوو.

ئینجا ئیمامی (البُوصیري) لە دوای سەرسوڕمانەکەی زیاتر مەدحی پێغەمبەر ﷺ دەکا و دەفەرموێ:

کالزَّهْرِ پێغەمبەر ﷺ وەك کڵۆکە (فِي تَرَفٍ) لە نەرمیو درەوشانەوەدا، حەزرەتی

ئنس)ﷺ فەرمویەتی: ﴿كانَ رَسُولُ اللهِﷺ أَزْهَرَ اللَّوْنِ كَأَنَّ عَرَقَهُ اللُّؤْلُؤُ إذا مَشى تَكَفَّأ. وَما مَسِسْتُ حَرِيراً وَلا دِيباجاً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللهِﷺ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ ڕەنگی ڕوخساری وەك كلۆكی سپی دەدرەوشاوە، ئارەقەی وەك (لُؤلُؤ) جوانو بێگەرد بوو، كاتێ دەڕۆیشت بەم لا و بەو لادا مەیلی دەكرد، دەستم لە هیچ ئاوریشمێك نەداوە، كە لە لەپەدەستی پێغەمبەرﷺ نەرمتر بێ.

(وَالْبَدْرِ) پێغەمبەرﷺ وەك مانگی شەوی چواردەیە (فِي شَرَفٍ) لە بەرزی پلەو پایەو تەواوی ڕۆناكیدا، واتە: هەروەك مانگی شەوی چواردە لە هەموو ئەستێرەكان ڕۆناكترەو ڕێزدارترە، ئەوهاش: پێغەمبەرﷺ لە هەموو خەڵك جوانترەو ڕێزدارترە، حەزرەتی (البراء)ﷺ فەرمویەتی: ﴿كانَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِﷺ مِثْلَ الْقَمَرِ﴾رواه البخاري، ڕووی پێغەمبەرﷺ وەك مانگ بوو.

(والْبَحْرِ) پێغەمبەرﷺ وەك دەریایە (فِي كَرَمٍ) لە بەخشندەییدا، واتە: هەروەك دەریا بە لێهەڵێنجان مەترسی كەمبوونی ئاوی لێناكرێ، ئەوهاش پێغەمبەرﷺ شت دەبەخشێو لە نەبوونی ناترسێ. حەزرەتی (أنس)ﷺ فەرمویەتی: ﴿پێغەمبەرﷺ پڕ بە نێوان دوو كێو بزنو مەڕی دانە پیاوێك، جا پیاوەكە گەڕاوە لای گەلەكەی خۆی و گوتی: [يا قَوْمِ أَسْلِمُوا فَإِنَّ مُحَمَّداًﷺ يُعْطي عَطاءً لا يَخْشَى الْفاقَةَ] رواه مسلم، هۆ گەلی من موسوڵمان بن، چونكە (مُحَمَّد)ﷺ بەخشینێكی وەها دەبەخشێ: لە نەبوونی ناترسێ﴾.

(وَالدَّهْرِ) پێغەمبەرﷺ وەك ڕۆژگاری هەمیشەییە (فِي هِمَمٍ) لە ویستی بەهێزو لە ورەی بەرزیدا، بەڵگەش ئەوەیە: لە بێهێزترین حاڵەتدا: لەو كاتەی خۆیو (صَحابَة)كانیﷺ لە (مَكّة)دا ئازار دەدران، پێغەمبەرﷺ وازی لە بەشێكی كەمی بەرنامەی ئیسلام نەهێنا، بەڵكو فەرمووی: ﴿يَا عَمِّ لَوْ وَضَعُوا الشَّمْسَ فِي يَمِينِي وَالْقَمَرَ فِي يَسَارِي عَلَى أَنْ أَتْرُكَ هَذا الْأَمْرَ ما تَرَكْتُهُ حَتَى يُظْهِرَهُ اللهُ أَوْ أَهْلكَ فِي طَلَبِه﴾ أخرجه ابن اسحاق، ئەی مامە، ئەگەر ڕۆژ لە ڕاستەم دابنێنو مانگ لە چەپەم دابنێن، من واز لەم كارەی ئیسلام ناهێنم، تا خوای گەورە ئاشكرا و سەركەوتووی دەكا، یان تا لە پێناویدا لەناو دەچم.

ئینجا كە ئیمامی (البُوصِيرِي) باسی ورە بەرزیی پێغەمبەریﷺ كرد، ئەم جارە

كَأَنَّهُ وَهْـــوَ فَـــرْدٌ مِنْ جَــلالَتِه (٥٦) فِي عَسْكَرٍ حِـــينَ تَلْقاهُ وَفِي حَـــشَمٍ
كَأَنَّمَا اللُّؤْلُؤُ الْمَكْنُونُ فِي صَدَفٍ (٥٧) مِنْ مَعْـــدِنَيْ مَـــنْطِقٍ مِنْهُ وَمُبْتَسَـــمِ

---

باسی ئازایەتی‌و شكۆمەندیی پێغەمبەرﷺ دەكا و دەفەرموێ:

(كَأَنَّهُ) پێغەمبەرﷺ (وَهُوَ فَرْدٌ) لەو حاڵەتەی كە بە تەنهایەو هیچ كەسێكی لەگەڵدا نیە (مِنْ جَلالَتِهِ) بە هۆی شكۆمەندیو پایەداری خۆی، بەرامبەر كافرەكان ئەوەندە ئازا و نەترسە، وەك ئەو حاڵەتەیە: كە (فِي عَسْكَرٍ) لە ناو لەشكرێكی گەورەدا بێ (حِينَ تَلْقاهُ) لەو كاتەی تۆ دەیگەیی‌و دەیبینی، هەم (وَفِي حَشَمٍ) وەك لە ناو خزمەتكارەكانیدا بێ.

واتە: پێغەمبەرﷺ لە حاڵەتی بە تەنهاییدا بەرامبەر بە دوژمنانی ئیسلام ئەوەندە ئازا و نەترسە: وەك لە ناو لەشكر و خزمەتكارەكانی خۆیدا بێ‌و ئەوان بەرگریی لێبكەن. حەزرەتی (البراء)رضي الله عنه فەرمویەتی: ﴿لەو كاتەی لە غەزای (حُنَيْن)دا (صَحابَة)كانرضي الله عنهم لە دەورەی پێغەمبەرﷺ نەمانو كافرەكان لە پێغەمبەرﷺ نزیك بونەوە، پێغەمبەرﷺ خۆی پێ ناساندنو فەرمووی: [أَنَا النَّبِيُّ لا كَذِب، أَنَا ابْنُ عَبْـدِ الْمُطَّلِب] رواه البخاري ومسلم، وفي رواية: [فَطَفِـقَ يَـرْكُضُ بَغْلَتَـهُ قِبَـلَ الْكُفَّـار]، مـن پێغەمبەرمﷺ هیچ درۆ نیە، من كوڕی (عَبْدالْمُطَّلِب)م. جا پێغەمبەرﷺ بە سواری هێسترەكەی بەرەو كافرەكان غاری دەدا﴾.

جا ئەوەش ئەو پەڕی نەترسی‌و ئازایەتییە: سەركردەی لەشكر بە تەنهایی بمێنێتەوەو دوژمن دەورەی بدا، ئەوجا بە تەنهاییش هەڵمەت ببا و ناوی خۆیشی ئاشكرا بكا، فصَلّى اللهُ عَلَيْه فِي الدُّنيا وَالآخرَة.

جا كە ئیمامی (البُوصيرِي) باسی ئازایەتی پێغەمبەریﷺ كرد، لەوانەیە كەسێك وا تێبگا: پێغەمبەرﷺ بە هۆی ئازایەتیەكەی دڵڕەقو قسەی توندە؟ جا ئەم تێگەیشتنە ڕەد دەكاتەوەو دەفەرموێ:

(كَأَنَّمَا) وەك بڵێی (اللُّؤْلُؤُ الْمَكْنُونُ) ئەو گەوهەرەی پارێزراوە (فِي صَدَفٍ) لە ناو بەرگی خۆیدا (مِنْ) هاتۆتە دەرەوە لە (مَعْدِنَيْ مَنْطِقٍ مِنْهُ) شوێنی گوفتاری پێغەمبەرﷺ (وَمُبْتَسَم) لە شوێنی زەردەخەنەی پێغەمبەرﷺ.

**جا بزانە:** لێرەدا وێچواندنی ئاوەژووی بەكار هێناوەو مەبەستی ئەوەیە: فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ كە لە دەمی موبارەكی دەردەچنو ددانە پیرۆزەكانیشی دەردەكەون،

وەك گەوهەری پارێزراوە لە ناو بەرگی خۆیدا. جا ئەمەش ئاماژە بۆ حەدیسەکەی (أُمّ مَعْبد) دەکا، کە لە مەدحی پێغەمبەرداﷺ فەرمویەتی: ﴿كأنَّ مَنْطقَهُﷺ خَرَزاتُ نَظْـــمٍ يَنْحَـــدِرْنَ﴾رواه الطبراني والبيهقي وصححه الحاكم، گوفتـاری پێغەمبـەرﷺ وەك گەوهەرەکانی داوریزکراو بوو: کە لە سەرەوەڕا شۆڕ دەبنە خوارەوە.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصِيري) مەدحی پێغەمبەریﷺ کرد لە حاڵەتی ژیانیدا، ویستی مەدحێکی دوای وەفاتیشی بکا و فەرمووی:

(**لاطِيبَ**) هیچ بۆنێکی خۆش نیە کە (**يَعْدِلُ**) یەکسان بێ لەگەڵ (**تُرْباً**) بۆنی ئەو گڵەی کە (**ضَمَّ أَعْظُمَهُ**) ئێسقانەکانی پێغەمبەریﷺ وە ناوەخۆ گرتووە، واتە: دەورەی لە جەستە پیرۆزەکەی پێغەمبەرﷺ داوەو بە هۆی بۆنە خۆشەکەی پێغەمبەرﷺ، گڵەکە بۆنخۆش بووە.

حەزرەتی (أنس)ﷺ فەرمویەتی: ﴿مَا شَمَمْتُ رائحَةً أَطْيَبَ مِنْ رِيحِ رَسُولِ اللهِﷺ﴾ رواه البخاري ومسلم، هیچ بۆنێکم بۆن نەکردوە لە بۆنی پێغەمبەرﷺ خۆشتر بێ.

هەروەها ﴿عَنْ ابْن عُمَررضي الله عنهما: لَمَّا قُبِضَ رَسُولُ اللهِﷺ دَخلَ عَلَيْه أَبُوبَكْرٍ فَوَضَعَ فاهُ عَلَى جَبِينِ رَسُول اللهِﷺ يُقَبِّلُهُ وَيَقُولُ: بِأَبِي وَأُمِّي طِبْتَ حَيّاً وَمَيّتاً﴾رواه البزار بسند صحيح، کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، ئیمامی (أبوبکر)ﷺ هاتە ژوورەوەو دەمی خۆی لە سەر نێوچاوانی پێغەمبەرﷺ دانا و ماچی دەکرد و دەیفەرموو: بە باوکمو دایکمەوە بە فیدات بم، بە زیندوویی‌و بە مردوویی بۆنت خۆشە.

(**طُوبَى**) خۆشی‌و شادی (**لِمُنْتَشِقٍ مِنْهُ**) بۆ ئەو کەسەی بۆنی گڵی گۆڕی پێغەمبەرﷺ دەکا و (**وَمُلْتَثِمِ**) ڕووی خۆی پێدا دێنێ‌و ماچی دەکا.

وا دیارە لە لای ئیمامی (البُوصِيري) دروستە: گۆڕی پێغەمبەرﷺ ماچ بکرێ، هەروەك چەند زانایەکیش ڕێگەیان داوە، بەڵام بە مەزهەبی ئیمامی (الشافعي): ماچکردن‌و دەست پێداهێنانی دیواری گۆڕی پێغەمبەرﷺ ناپەسەندە، هەروەك ئیمام (النواوي) لە (المجموع)دا فەرمویەتی.

**جا بزانە**: بە (إجْماع)ی زانایانی ئیسلام: ئەو خاکەی دەورەی لە جەستە پیرۆزەکەی پێغەمبەرﷺ داوە، لە (كَعْبَة)ش گەورەترەو هەم زیارەتی گۆڕی پێغەمبەریش سوننەتە، بەو شێوەی لە (مێرگ‌وگوڵزاری بەهار)دا ڕوونم کردۆتەوە.

أَبانَ مَـــوْلِدُهُ عَنْ طِـــيبِ عُنْصُـــرِهِ (٥٩) يا طِـــيبَ مُـــبْتَدَإٍ مِنْهُ وَمُخْـــتَتَمِ

جا لێرەدا ئیمام (ابن قدامَة)و ئیمامی (النَّـواوي)و ئیمـام (ابـن كـثیر) گێڕاویەتیانـەوە: (اَلْعُتْبي) فەرمویەتی: جارێك لە خزمـەت گـۆڕی پێغەمبـەرﷺ دانیشـتبوم، عـەرەبێك هاتو گوتی: (السَّلامُ عَلَيْكَ يا رَسُولَ الله)، بیستومە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَـــوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَـــدُوا اللهَ تَوّابـــاً رَحِيماً﴾النسـاء:٦٤، ئەگەر ئەوان ستەمیان لـە خۆیان كرد: بە تاوانكردن جا هاتنە لای تۆ –ئەی پێغەمبەرﷺ– جا لـە خوا پاڕانەوە تاكو لـە گوناهیان خـۆش ببـێ‌و پێغەمبـەریشﷺ بۆیان پاڕاوە، دەبینن خوای گەورە تۆبەیان قبوڵ دەكاو ڕەحمیان پێ‌دەكا.

ئینجا عەرەبەكە گوتی: وا هاتمە لای تۆ–ئەی پێغەمبەرﷺ– لە خوا دەپاڕێمەوە: لە گوناهم خۆش ببێ، تۆش دەكەمە تكاكـار لـە لای خـوای گـەورە. جـا عەرەبەكـە ئـەم شیعرانەی گوتن:

**يا خَيْرَ مَنْ دُفِنَتْ بِالْقاعِ أَعْظُمُهُ * فَطابَ مِنْ طِيبِهِنَّ الْقاعُ وَالأَكَمُ**

**نَفْسِي الْفِداءُ لِقَبْرٍ أَنْتَ ساكِنُهُ * فِيهِ الْعَفافُ وَفِيهِ الْجُودُ وَالْكَرَمُ**

(الْعُتْبِي) فەرمویەتی: ئینجـا عەرەبەكـە ڕۆیشـت، منـیش خـەوتمو پێغەمبـەرمﷺ لـە خەونمدا بینی‌و فـەرمووی: ﴿ئەی (الْعُتْبی) مژدە بـدە عەرەبەكـە خـوای گـەورە لێی خۆش بوو﴾. بڕوانە (تفسیر ابن كثیر) النساء (٦٤) و(مغنی ابن قدامة) ب(٣) ل(٥٩٩–٦٠٢) و(الأذكار للإمام النّواوي) ل(٩٧و١٧٤).

**جـــا بزانـــە**: ئـەم دوو (بَیْـت)ەی‌ڕابـردوو لـە سـەر دیـواری گـۆڕی پێغەمبـەرﷺ نووسراونەوەو تا كاتی نووسینی ئەم ڕوونكردنەوەیەش نووسینەكە هـەر مـاوە، وَالْحَمْدُ لِلّه الَّذِى أَرْسَلَهُ رَحْمَةً لِلْعالَمِين، وصَلَّى اللهُ عليه دائماً في الدُّنيا ويوم الدِّين.

## ﴿ اَلْـفَـصْلُ الـرّابِـعُ: فـى مَـوْلِـدِه ﷺ ﴾

### ﴿بەشی چوارەم: لە باسی لەدایكبوونی پێغەمبەرﷺ﴾

پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی دوو شەممە (١٢) دوانزەی مـانگی (ربیـع الأول) سـاڵی (فیـل)، بەرامبەر(٢٠) بیستی (نیسان)ی ساڵی (٥٧١) پێنج سـەدو حـەفتاو یـەكی زایینـی، لـە شاری (مَكَّة)ی پیرۆز لەدایك بووە، جـا لـە شـەوی لـەدایكبوونی‌دا چـەند نیشـانەیەكی سەیر ڕویاندا، ئیمامی (الْبُوصیري) باسی هەندێكیان دەكا و دەفەرموێ:

(أَبانَ) ئاشكرای كرد (مَوْلِدُهُ) نیشانەكانی لەدایكبوونی پێغەمبەرﷺ (عَنْ طِيبِ

يَوْمٌ تَفَــرَّسَ فِيهِ الْفُــرْسُ أَنَّهُـــمُ (٦٠) قَدْ أُنْذِرُوا بِحُلُــولِ الْبُؤْسِ وَالنِّقَـــمِ
وَبَاتَ إِيوانُ كِسْرَى وَهْوَ مُنْصَدِعٌ (٦١) كَشَمْلِ أَصْحَابِ كِسْرَى غَيْرَ مُلْتَئِمِ

عُنْصُرِهِ) پاكیو بێگەردی وەچاخو بنچینەی پێغەمبەرﷺ. واتـە: بـە ڕووداوەكـانی شەوی لەدایكبوونی پێغەمبەرﷺ خوای گەورە ئاشكرای كرد كە بنچینەو نـەژادی پێغەمبەرﷺ پاكو بێگەردە، هەر لە باب (آدم)وەﷺ تا دەگاتە (عبدالله)ی باوكی.

(يا طيب مُبْتَدإٍ) ئای چەند پاكو بێگەردە لای سەرەتای: كە باب (آدم)ەﷺ (مِنْهُ) لـە نـەژادی پێغەمبـەرﷺ، هـەم (وَمُخْتَتَمٍ) لای كۆتـایی نەژادیشـی: كـە (عبـدالله)ی باوكیەتی، پێغەمبەرﷺ فەرمویـەتی: ﴿إِنِّي خَرَجْتُ مِنْ نِكَــاحٍ وَلَـــمْ أَخْــرُجْ مِــنْ سِفَاحٍ﴾حديث حسن رواه البيهقي، من بەردەوام لــە مـارەبڕینێكی حەڵاڵـەوە دەرهـاتوم، لـە جیماعی حەرام دەرنەهاتوم.

لەم بارەیەوە (عاجز) فەرمویەتی:

(نُور)ی لە (آدم) پشت بە پشت * هەتـــا بــە (عبدالله) گـــەیشت
هەم (آمنة)ی حۆری سروشـــت * (مَحْفُوظ) بوو (طُرَّة)داری من

ئینجا بەو پێنج (بَيْت)ەی داهاتوو، ئیمامی (البُوصيري) چەند ڕووداوێكی سـەیر بـاس دەكـا: كـە لـە شـەوی لـەدایكبوونی پێغەمبـەرداﷺ بـە سـەر دەوڵـەتی فارسـەكاندا هاتونو دەفەرموێ:

(يَوْمٌ) كـاتی لـەدایكبوونی پێغەمبـەرﷺ ئـەو كاتـە بـوو: كـە (تَفَرَّسَ فِيهِ الْفُرْسُ) فارسەكان هەستیان كرد و بۆیـان ئاشـكرا بـوو (أَنَّهُمْ) ئـەوان (قَدْ أُنْذِرُوا) بەڕاسـتی ئاگاداركراونــەوەو ترسـێندراون (بِحُلُولِ الْبُؤْسِ) بـە هـاتنی دڵتـەنگیو (وَالنِّقَمِ) سـزادان، واتــە: بــە نیشـانەكانی شــەوی لــەدایكبوونی پێغەمبــەرﷺ، فارسـەكان ئاگاداركرانـەوە: كـە لـە سەردەسـتی ئـەو پێغەمبـەرەﷺو (صَحابَة)كـانی ویﷺ دەوڵەتیان لەناو دەچیو توشی دڵتەنگیو ماڵوێرانی دەبن.

(وَ) هـەروەها: لـە شـەوی لـەدایكبوونی پێغەمبـەرداﷺ (بَاتَ إِيوانُ كِسْرَى) تـاقی (كِسْرَى) وەهای لێهات (وَهُوَ مُنْصَدِعٌ) قەڵشتو لەت بوو.

**تـاقی (كِسْرَى):** دەكەوێتە شارۆچكەی (مَدائن)، لە باشوری (بَغْداد)، پاشای فارسـەكان لەوێ دادەنیشتو وڵاتـی بـەڕیوە دەبـرد، جـا لـە شـەوی لـەدایكبوونی پێغەمبـەرداﷺ هەژاوەو لەت بوو و چواردە بەرهەیوانی لێ كەوتنە خوارەوە. جا ئەم لەتبوونەی

وَالنّارُ خامِـــدَةُ الْأَنْفاسِ مِنْ أَسَفٍ (٦٢) عَلَيْه وَالنَّهْرُ ساهِي الْعَيْنِ مِنْ سَـــدَمِ
وَسَاءَ ساوَةَ أَنْ غاضَتْ بُحَـــيْرَتُها (٦٣) وَرُدَّ وارِدُها بِالْغَـــيْظِ حِينَ ظَمِـــي
كَأَنَّ بِالـــنّارِ مَابِالْـــماءِ مِـــنْ بَلَلٍ (٦٤) حُـــزْناً وَّبِالْماءِ ما بِالنّارِ مِنْ ضَـــرَمِ

تاقی (كِسْرَى) یەکتریی نەگرتـەوە (كَشَمْلُ أَصْحابِ كِسْرَى) هـەروەك هاوڕێکـانو لەشکری (كِسْرَى)ش پەرت بونو (غَيْرُ مُلْتَئِمٌ) یەکترییان نەگرتەوە.

واتە: لە سەردەمی ئیمامی (عُمر)دا رضي الله عنه بـە سـەرکردایەتی حـەزرەتی (سعد بن أبي وقاص رضي الله عنه)و بە بەشداری (٥٠٠٠) پێنج هـەزار کورد-کـە لـە سـەر دەسـتی حـەزرەتی (جابان)ی کوردی رضي الله عنه موسوڵمان بوبون- تەختو بەختی (كِسْرَى) تێك شكێندرا.

جا ئەم باسەم بە درێژی لە (مێرگو گوڵزاری بەهار)دا ڕوون کردۆتەوە.

(وَ) هـەروەها لـە شـەوی لـەدایکبوونی پێغەمبـەردا صلى الله عليه وسلم (النّـارُ) ئـاگری فارسـەکانی ئاگرپەرست (خامِدَةُ الْأَنْفاسِ) بلێسەی نەما و کوژاوە (مِنْ أَسَفٍ) بە هۆی نیگـەرانیو خەفەتباری (عَلَيْهِ) لە سەر لەدایکبوونی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، جا ئەو ئـاگرە لـە پـێش ئـەو شەوەدا هەزار ساڵ بوو، نەکوژابۆوەو ئاگرپەرستەکان ئەیانپەرست.

(وَ) هەروەها لە شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم (النَّهْرُ) ڕوباری (الفُرات): کـە لـە ڕێی (سُورِيَة)وە دێتـە عێـراق (سـاهِي الْعَيْنِ) چـاوەکەی غافـڵو بـێ ئـاگـا بـوو و لـە ڕۆیشتنەکەیدا هەڵەی کرد و ڕێگەی خۆی گۆڕی و بـەرەو دەشـتی (سَـماوَة)ی عێـراق لایدا (مِنْ سَدَمٍ) بـە هـۆی دڵگیربـوونو سـوێلێبوونەوەی ئـەو ئایینـە پووچـەی لـەو شوێنەدا ئەنجام دەدرا و بە هاتنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەناو دەچێ.

جا تا ئێستاش ڕێگۆڕییەکەی ڕوباری (الفُرات) هەر ماوەو لە دەشـتی (سَماوَة) بووەتـە دوو بەشو لە نزیك شاری (سَماوَة) تێك دەکەنەوە.

(وَ) هەروەها لە شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم (سَاءَ ساوَةَ) دانیشـتووانی شـاری (ساوَة)ی دڵگیر و خەفەتبار کرد (أَنْ غاضَتْ بُحَيْرَتُها) ڕووچوونی ئاوی دەریاچـەکەی، واتە: بە وشکبوونی ئاوی دەریاچەکەیان خەفەتبار بون، چونکە هیچ ئـاوی تێـدا نـەما و (وَرُدَّ وارِدُها) ئاوهێنەکەشی گەڕێندراوە (بِالْغَيْظِ) بە ڕقو قینـەوە (حِينَ ظَمِـي) لـەو کاتەی تینوو بوو، چونکە هیچ ئاو لە دەریاچەکەدا نەمابو بیخواتەوە.

جا کوژاوەوەی ئاگری ئاگرپەرستەکانو وشکبونی دەریاچەی (سـاوَة) بـە شـێوەیەکی وەهـا بـوو: (كَـأَنَّ بِالنّـارِ) وەك بڵـێی: شـوێنی ئـاگرە کوژاوەکـە ئـەوها تـەڕ بـووە (مابِالْماءِ مِنْ بَلَلٍ) وەك ئەو تەڕایەتییەی لە ئـاودا هەیـە (حُزْناً) بـە هـۆی غـەمباری،

هەم (وَبِالْماءِ) شوێنی ئاوی دەریاچەکەش ئەوها گەرم بووە (ما بِالنّارِ مِنْ ضَرَمِ) وەك ئەو گەرمیەی لە بڵێسەی ئاگردا هەیە.

جا بەڵگەی ئەو نیشانانەیڕابردوو ئەمەیە: ﴿عَن مَخْزُوم بن هانِئ الْمَخْزُومِيِّ عَن أَبِيه: لَمَّا كانَت اللَّيْلَةُ الَّتِي وُلِدَ فِيها رَسُولُ اللهِﷺ ارْتَجَّ إِيوانُ كِسْرى وَسَقَطَتْ مِنْــهُ أَرْبَــعَ عَشْرَةَ شُرْفَةً، وخَمِدَتْ نارُ فارِس وَلَمْ تَخْمُدْ قَبْلَ ذلِكَ بِأَلْفِ عــامٍ، وَغاضَــتْ بُحَيْــرَةُ ساوَةَ، وَرَأَى الْمُوبِذانُ إِبِلاً صِعاباً تَقُودُ خَيْلاً عِراباً قَدْ قَطَعَتْ دِجْلَةَ وانْتَشَرَتْ فِي بِلادِها ...ثُمَّ ذَكَرَ قَوْلَ سَطِيحٍ: إِذا كَثُرَت التِّلاوَةُ وَظَهَرَ صاحِبُ الْهِراوَةِ وَفاضَ وادِي السَّماوَةَ وَغاضَتْ بُحَيْرَةُ ساوَةَ وَخَمِدَتْ نارُ فارِسَ، فَلَيْسَ الشّامُ لِسَطِيحٍ شــاماً-وَزادَ فِيرِوايَـةٍ-: فَلَيْسَتْ بابِلُ لِلْفُرْسِ مُقاماً...﴾رواه بتمامه الحافظان: الخرائطي والبيهقي، وذكره الحافظ ابن كثير في البداية والنهاية، والإمام الحلبي في سيرته، لەو شەوەی پێغەمبەرﷺ لەدایك بوو: تاقی (كِسْرى) هەژاوەو چواردە بەر هەیوانی لێکەوتنە خوارەوە، ئـاگری ئاگرپەرستەکانی (فـارس) کوژاوە، کە لە پێشدا هەزار ساڵ بوو نەکوژابۆوە، ئاوی دەریاچەی (ســاوَة) ڕوچـووە خوارەوەو وشك بوو، (الْمُوبِذان)=گەورەی دادوەرەکانی ئاگرپەرستەکان لــە خەونـدا دیتی: چەند وشترێکی خۆشنەکراو چەند ئەسپێکی عەرەبیان ڕادەکێشاو لە ڕووباری (دِجْلَــة)ی عێــراق پەڕینــەوەو لــەو وڵاتــەدا بــڵاو بونــەوە-مەبەســت (صَحابَة)ی پێغەمبەرنﷺ- ...ئینجا (سَطِيح)ی (کاهِن)ش گوتی: هەر کاتێك خوێنـدنی قورئـان زۆر بوو، خاوەنی دارعەسایەکەش-کە پێغەمبەرەﷺ- ئاشکرا بوو، دۆڵی (سَـماوَة)ش لافاوی لێهەڵسا-واتە: بە هۆی لادانی ڕوباری (فُرات)، کە باسمـان کـرد- دەریاچـەی (ساوَة)ش وشك بوو، ئاگری (فارس) کوژاوە، ئەو کاتە (شام) وڵاتـی (سَـطِيح) نیـەو (بابِل)ش شوێنی مانەوەی فارسەکان نیە.

**جا بزانە:** (ساوَة) شارۆچکەیەك بوو لە ئێران لە نێوان (قُم)و (هَمْذان)، تـا سـەرەتای سەدەی حەفتەمی کۆچی هەر ئاوەدان بوو، دانیشتووەکانی هەمووی لە سـەر مەزهـەبی ئیمامی (الشافعي) بون، جا کەوتنە بەر هێرشی (تَتَر)و هەموو دانیشتووەکانیان کوشتن‌و شارۆچکەکەشیان وێران کرد، إنا لله وإنّا إليْه راجعُون.

ئینجا هەر لە شەوی لەدایکبوونی پێغەمبـەرداﷺ (وَالْجِنُّ تَهْتِفُ) جنۆکـە هاواریـان دەکرد و بە دەنگی بەرز دەیانگوت: ئەم شەو پێغەمبـەرﷺ لـەدایك بـوو ﴿عَنْ أَسْماءَ

بِنْت أبي بكر رضي الله عنهما: أَنَّ وَرَقَةَ بن نَوْفَلٍ وَزَيْدَ بن عمْرٍو أَتَيا النَّجاشيَّ، فقالَ وَرَقَةُ: أَيُّهـا الْمَلِكُ أَنِّي قَدْ بِتُّ عِنْدَ وَثَنٍ لَنا، إِذْ سَمِعْتُ مِنْ جَوْفِهِ هاتِفاً يَقُولُ:

(وُلِـدَ الـنَّبِيُّ فَـذَلَّتِ الْأَمْـلاكُ * وَنَأَى الضَّـلالُ وَأَدْبَـرَ الْإِشْـراكُ)

ثُمَّ انْتَكَسَ الصَّنَمُ عَلَى وَجْهِهِ﴾رواه الحافظ الخرائطي، وذكره الحافظ ابن كثير في البداية والنهاية،

(وَرَقَة) به (النَّجاشِي)ى گوت: ئەی پاشا من شەوێك لە لای بتێکی خۆمـان مابومـەوە، لە ناکاو گوێم لێبوو لە ناو بتەکەدا دەنگێکی بەرز دەیگوت: (پێغەمبـەرﷺ لـەدایك بوو، پاشایەکان زەلیل بون، گومڕایی دور کەوتەوە، هاوبەشدانان بۆ خـوا پشـتی دا و ڕۆیشت)، ئینجا بتەکە بە سەر ڕوویدا کەوت.

**جا بزانە:** لەو کاتەی (وَحْي)شـی بـۆ هـات و بـووە پێغەمبـەرﷺ، جنۆکـە هاواریـان کردو هـەواڵی پێغەمبەرایـەتییان ڕاگەیانـد، هـەروەك لـە (صَحيح البُخـارِي) لـە باسـی موسوڵمانبوونی ئیمام (عُمر رضي الله عنه) گێڕاویەتیەوە.

(وَ) هـەر لـە شـەوی لـەدایکبوونی پێغەمبـەرداﷺ (الأَنْـوارُ) ڕوناکیـەکان (**ساطِعَةٌ**) ئاشکرا دەبون و ئەو خانووەی پێغەمبەرﷺ تێ‌یدا لەدایك بوو، گشـتی ڕونـاك بـۆوە، هەروەك ئیمامی (البيهقي) گێڕاویەتیەوە.

هەم (العِرْباض بن سـارِية)رضي الله عنه فەرمویـەتی: ﴿إِنَّ أُمَّ رَسُولِ اللهِﷺ رَأَتْ حِينَ وَضَـعَتْهُ نُوراً أَضاءَتْ لَهُ قُصُورُ الشّامِ﴾سنده صحيح رواه الإمام أحمد والطبراني، دایکی پێغەمبـەرﷺ لـە کاتی دانانی پێغەمبەرداﷺ نورێکی دیت، تەلارەکانی (شام)ی ڕوناك کردنەوە.

**جا بزانە:** دوو جار (آمِنَة) دیتی (نُور)ێکـی لێ‌هـاتـە دەرەوەو تـەلارەکانی (بُصْـرَى)ی ڕۆناك کردنەوە:

**یەکەم:** ﴿لە شەوی لە دایکبـوونی پێغەمبـەداﷺ (آمِنَـة) دیتـی (نُـور)ێکـی لێ‌هـاتـە دەرەوەو تەلارەکانی (بُصْرَى)ی ڕۆناك کردنەوە﴾.

**دووەم:** هەم لە حەدیسێکی‌تری (صحیح)دا هاتووە: ﴿لەو شەوەی (آمِنَة) پێغەمبەریﷺ وەزگ کەوتووە–بە هەمان شێوە–(نُور)ێکی ئەوهای دیتووە﴾.

واتە: لە کاتی وەزگکەوتنی پێغەمبـەرداﷺ لـە خەونـدا (نُـور)ەکـەی دیـت، بـەڵام لـە شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەرداﷺ بە ئاشکرایی بە چاوی‌خۆی دیتـی (نُـور)ەکـەی لێ هاتە دەرەوە. هەروەك ئیمام (ابن كثير) فەرمویەتی.

لە بارەی ئەو نیشانە گەورەیە (أحمد شَوْقِي) دەڵێ:

عَمُوا وَصَمُّوا فَإعْلانُ الْبَشائِرِ لَمْ (٦٦) تُسْمَعْ وَبارِقَةُ الإنْذارِ لَمْ تُشَمِ
مِنْ بَعْدِ ما أَخْبَرَ الأَقْوامَ كاهِنُهُمْ (٦٧) بِأَنَّ دينَهُمُ الْمُعْوَجَّ لَمْ يَقُمِ

وُلِـدَ الْهُدَى فَالْكائِنَاتُ ضِياءُ * وَفَمُ الزَّمانِ تَبَسُّمٌ وَثَنَاءُ
اَلرُّوحُ وَالْمَلأُ الْمَلائِكُ حَوْلَهُ * لِلدِّينِ وَالدُّنْيا بِهِ بُشَراءُ

ڕێنموونی-كه پێغەمبەرە ﷺ-لە دایك بوو، جا هەموو بوونەوەر ڕۆناکییەو دەمی ئەو کاتەش زەردەخەنەو مەدحی پێغەمبەرە ﷺ، حەزرەتی (جُبْرائیل)و کۆمەڵی (مَلائکَة)ش لە دەورەی وی بۆ ئەم دینو دونیایە بە وی موژدەدەرن.

(وَالْحَقُّ) ڕاستیی هاوارکردنی جنۆکە کە دەیانگوت: پێغەمبەر ﷺ لەدایك بوو (يَظْهَرُ) ئاشکرا دەبێ (مِنْ مَعْنَىً) لە واتەی قورئانو (وَمِنْ كَلِمِ) لە وشەکانی قورئان، چونکە سورەتی ﴿قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ﴾ بەڵگەیە: کە بە هۆی هاتنی پێغەمبەر ﷺ جنۆکەکان لە چوونە ئاسمان قەدەغە کران.

جا لەوانەیە کەسێك پرسیار بکا: ئەگەر ڕاستیی گوتەی جنۆکە قورئان ئاشکرای بکاو ڕۆناکی بڵاو بوبێتەوە، بۆچی کافرەکان باوەڕیان بە پێغەمبەر ﷺ نەدەکرد؟ جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە وەڵامدا دەفەرموێ:

(عَمُوا) کافرەکان کوێر بوبونو (وَصَمُّوا) کەڕ بوبون، بۆیێ (فَإعْلانُ الْبَشائِرِ) ئاشکراکردنی هەواڵەکانی مژدەدەرەکان (لَمْ تُسْمَعْ) نەبیسترا، واتە: قبوڵ نەکرا، جا هەندێك لەو مژدەدەرانە جنۆکە بون، کە باسمان کردن، هەم حەزرەتی (عیسَی) پێغەمبەریش ﷺ مژدەی هاتنی پێغەمبەری ﷺ داوەو فەرمویەتی: ﴿وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾الصف: ٦، هۆ (بَنِيإِسْرائِيل)...من مژدەدەرم بە پێغەمبەرێك لە دوای من دێ ناوی (أَحْمَد)ە ﷺ.

کەواتە: هەروەك کافرەکانی (مَكَّة) گوێیان نەدا مژدەی جنۆکەکان، ئەوهاش گاورەکان= دیانەکان گوێیان نەدا مژدەی حەزرەتی (عیسی)ی پێغەمبەری خۆیان ﷺ. هەم (وَبارِقَةُ الإنْذارِ) بروسکەی ترساندنو ئاگادارکردنەوە لە هاتنی پێغەمبەر ﷺ (لَمْ تُشَمِ) تەماشای نەکرا و نەدیترا.

جا کەسێك بۆی هەیە بڵێ: ئەوە زانیمان مژدەدەرەکان کێنە، ئەدی ترسێنەرەکان کێ بون؟ جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) ترسێنەرەکانیش ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(مِنْ بَعْدِ ما) بروسکەی ترساندن گوێی نەدرایێ، پاش ئەوەی (أَخْبَرَ الأَقْوامَ) هەواڵی گەیاندە کافرەکان (كاهِنُهُمْ) هەواڵگۆی نادیارەکانی ئەوان، واتە: ئەو

فاڵچیانەی دەیانگوت: ئێمە (غَيْب)=زانستی نادیار دەزانین، چونكە كافرەكان زۆر متمانەیان بە قسەكانی هەواڵگۆی نادیارەكان هەبوو، دەبوا ئەو هەواڵەشیان باوەڕ كردبا، كە هەواڵگۆیەكە پێی گوتن: (بِأَنَّ دِينَهُمُ الْمُعْوَجَّ) ئایینە چەوتو پوچەڵەكەی ئەوان (لَمْ يَقُم) جێگیر نابێ‌ء نامێنێ.

﴿عَنْ عائشَةَ رضي الله عنها : كانَ يَهُوديٌّ يَتَّجِرُ في مَكَّة، فَلَمَّا كانَت اللَّيْلَةُ الَّتي وَلَدَ فيها رَسُولُ اللهِ ﷺ، قالَ في مَجْلسٍ منْ قُرَيْشٍ: وُلِدَ هَذه اللَّيْلَةَ نَبِيُّ هذه الْأُمَّة الْأَخيرَة... فَلَمّا ذَهَبُوا مَعَهُ إلَى آمنَةَ وَنَظَرَ الْيَهُوديُّ إلَى شامَة النُّبُوَّة وَقَعَ مَغْشيّاً عَلَيْه، فَلَمّا أَفاقَ قالَ: ذَهَبَت النُّبُوَّةُ منْ بَني إسْرائيلَ، يا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ أَمَا وَاللهِ لَيَسْطُوَنَّ بكُمْ سَطْوَةً يَخْرُجُ خَبَرُها منَ الْمَشْرِق وَالْمَغْرب﴾ رواه ابن سعد والحاكم والبيهقي، جولەكەیەك لە (مَكَّة)دا بازرگانیی دەكرد، جا لە شەوی لەدایكبوونی پێغەمبەردا ﷺ لە دانیشگەیەكی (قُرَيْش)دا گوتی: ئەم شەو پێغەمبەری ئەم ئوممەتەی ئاخیر زەمان لەدایك بوو...جا كە لەگەڵی چونە لای (آمِنَة)، جولەكەكە تەماشای نیشانەی پێغەمبەرایەتیی كرد، یەكسەر بێ‌هۆش بوو، جا كە وەهۆش هاتەوە، گوتی: پێغەمبەرایەتی لە (بَنِي إسْرائِيل) ڕۆیی، هۆ گەلی (قُرَيْش) بەو خوایە ئەم پێغەمبەرە كارێكتان پێ دەكا، هەواڵەكەی دەڕواتە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا.

**جا بزانە:** هەر چەند جارجارە هەواڵگۆی نادیارەكان هەواڵێكی ڕاستیان ڕادەگەیاند و لە سەردەمی پێش ئیسلامدا خەڵك باوەڕی پێ‌دەكردن، بەڵام لە ئیسلامدا حەڕامە باوەڕیان پێ‌بكرێ، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ﴿مَنْ أَتَى عَرّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاةُ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾ رواهُ مُسْلم، هەر كەسێك بچێتە لای فاڵچیو پرسیاری لە شتێك لێبكا، ئەوە خێری نوێژی چل شەوی بۆ نانووسرێ. وفي رواية الإمام أحمد: ﴿مَنْ أَتَى عَرَّافًا أَوْ كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ ﷺ﴾: هەر كەسێك بچێتە لای فاڵچی، یان لای ئەو كەسەی زانستی نادیار ئەڵێ، باوەڕیشی پێ‌كرد، بەڕاستی ئەوە كوفری كردوە بەو قورئانەی بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتۆتە خوارەوە.

(وَ) هەروەها بروسكەی ترساندن گوێی نەدرایێ (بَعْدَما عَايَنُوا) پاش ئەوەی كافرەكان بە چاوی خۆیان دیتیان (فِي الْأُفْقِ) لە بەرزاییەكانی ئاسمان (مِنْ شُهُب) ... ئاگرەی لە ئەستێرەكانی ئاسمانەوە دەهاویشترا شەیتانەكان.

واتە: پێش لەدایکبوونی پێغەمبەرﷺ شەیتانەکان سەردەکەوتن بۆ ئاسمان‌و گوێیان لە قسەکانی (مَلائكَة) دەگرت‌و لە ناو خەڵکیدا بڵاویان دەکردەوە، جا کە پێغەمبەرﷺ لەدایك بوو، هەندێ ڕێگەی ئاسمانیان لیٚ قەدەغەکرا و بڵێسە ئاگری ئەستێرەکانیان بۆ دەهاویشترا، ئینجا کە پێغەمبەرﷺ (وَحْي) بۆ هات‌و بووە پێغەمبەرﷺ بە یەکجاری لە هەموو ئاسمانەکان قەدەغە کران‌و دەسوتێندران.

جا لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَصَدًا﴾الجن:٩، چونکە گوتیان: پێشتر ئێمە لە هەندێك شوێنەکانی ئاسمان دادەنیشتین بۆ گوێگرتن لە قسەی (مَلائِكَة)، جا هەر کەسێك ئێستا گویٚ لە قسەی (مَلائِكَة) بگریٚ، ئەوە بڵێسەی ئاگری ئەستێرەی دەست دەکەویٚ بۆی ئامادەکراوەو دەیسوتێنیٚ.

(مُنْقَضَّةٍ) ئەو بڵێسە ئاگرەی ئەستێرەکان دادەڕژێتە خوارەوە بۆ سەر شەیتانەکان (وِفْقَ مافِي الأرْض) وەك ئەو داڕژانەی لە زەمیندا هەیە (مِنْ صَنَمٍ) لە کەوتنە خوارەوەی بت‌و سەنەمەکان، لە شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەرداﷺ، هەروەك لە گێڕانەوەی (وَرَقَة)دا ڕابرا.

هەم (عَبْدُالمُطَّلب)ی باپیری پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿كُنْتُ فِي الْكَعْبَةِ فَرَأَيْتُ الأَصْنامَ سَقَطَتْ وَخَرَّتْ سُجَّداً وَسَمِعْتُ صَوْتاً مِنَ الْكَعْبَةِ يَقُولُ: وُلِدَ الْمُصْطَفَى الْمُخْتَارُ...﴾ ذكره الامام الحلبي في سيرته، وذكره الحافظ ابن كثير في البداية والنهاية بلفظ آخر، من لە (كَعْبَة)دا بوم، دیتم سەنەمەکان کەوتنە خوارەوەو سوجدەیان برد، گوێم لێبوو دەنگێك لە (كَعْبَة) دەیگوت: پێغەمبەری بژاردە لەدایك بووﷺ.

جا ئیمامی (البُوصيري) باسی شەیتانەکان دەکا: کە لە ترسی داڕژانی بڵێسەی ئەستێرەکان هەڵدەهاتن، دەفەرموێ:

(حَتّى غَدا) بە شێوەیەکی وەها شەیتانەکان بە بڵێسەی ئەستێرەکان دەسوتێندران، تا وای لێهات: وازی هێنا (عَنْ طَرِيقِ الْوَحْيِ) لە ڕێگەی (وَحْي)، واتە: وازی لە چوونە ئاسمان هێنا (مُنْهَزِمٌ مِنَ الشَّياطِينِ) هەڵاتووی شەیتانەکان، جا بە شێوەیەکی وەها هەڵدەهات (يَقْفُو إثْرَ مُنْهَزِمٍ) هەڵاتووەکە شوێن هەڵاتووێکی تر دەکەوت، واتە: جگە لە هەڵاتن هیچ کارێکی تریان لە ئاسمان دەست نەکەوت، بۆیێ

كَأَنَّهُـمْ هَـرَباً أَبْطَـالُ أَبْرَهَـةَ (٧٠) أَوْ عَسْكَرٌ بِالْحَصَى مِنْ رَّاحَتَيْهِ رُمِي
نَبْذاً بِهِ بَعْـدَ تَسْـبِيحٍ بِبَطْنِهِـمَا (٧١) نَبْذَ الْمُسَـبِّحِ مِنْ أَحْـشَاءِ مُلْتَقِمِ

---

كه شەیتان بلّێسەی ئەستێرەكانی دیت دادەڕژانە خوارەوە، تێگەیشت كار لە كار ترازاوەو گوتی: ﴿لَقَدْ وُلِدَ اللَّيْلَةَ وَلَدٌ يُفْسِدُ عَلَيْنَا أَمْرَنَا﴾ أخرجه ابن أبي حاتم في تفسيره، بێگومان ئەم شەو كوڕێك لەدایك بوو، كارەكەمان لێ تێك دەدا.

جا ئیمامی (البُوصِيري) شێوەی هەڵاتنی شەیتانەكان بە دوای یەكتردا باس دەكا و دەفەرموێ:

(**كَأَنَّهُمْ هَرَباً**) وەك بڵێی شەیتانەكان لە هەڵاتندا (**أَبْطَالُ أَبْرَهَةَ**) وەك پاڵەوانەكانی لەشكری (أَبْرَهَة) بون، كە لە ساڵی لەدایكبوونی پێغەمبەرداﷺ هاتبون (كَعْبَة)ی پیرۆز بڕوخێنن، جا ﴿وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْراً أَبَابِيلَ * تَرْمِيهِمْ بِحِجَارَةٍ مِنْ سِجِّيلٍ﴾ الفيل:٣و٤، خوای گەورە باڵندەی (أبابيل)ی نارده سەریانو بەردبارانیان كردن. جا بە دوای یەكتردا هەڵدەهاتنو تەفروتونیان كردن.

(**أَوْ عَسْكَرٌ**) یان لە هەڵاتندا وەك لەشكری كافرەكان بون: كە (**بِالْحَصَى**) بە وردە بەرد (**مِنْ رَاحَتَيْهِ**) لە لەپەدەستەكانی پێغەمبەرەوەﷺ (**رُمِي**) بۆیان دەهاویشترا و بە دوای یەكتردا هەڵاتن، هەروەك لە غەزای (بَدْر) پێغەمبەرﷺ چەنگە گڵو وردە بەردێكی بڕژاندە لەشكری كافرەكان، جا كافرەكان بەزینو هەڵاتن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ رَمَى﴾ الانفال:١٧، ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ ئەو چەنگە گڵو بەردەت نەهاویشت، بەڵام خوای گەورە هاویشتی. واتە: گەیاندیە ناو چاوی كافرەكان.

هەروەها لە غەزای (حُنَيْن)ش ﴿أخذ رسُولُ اللهِﷺ حَصَيات فَرَمى بِهِنَّ وُجُوهَ الْكُفَّار، ثُمَّ قالَ: انْهزمُوا وربِّ مُحَمَّدﷺ﴾ پێغەمبەرﷺ هەندێك وردە بەردی هاویشتنە ڕووی كافرەكان، ئینجا فەرمووی: كافرەكان هەڵاتن سوێندم بە خوای (مُحَمَّد)ﷺ.

جا كە ئیمامی (البُوصِيري) هەڵاتنی شەیتانەكانی وێچواندە هەڵاتنی لەشكری كافرەكانو لەو وێچواندنەشدا (مُعْجِزَة)یەكی پێغەمبەرایەتیی لە وردە بەردەكاندا باس كرد. ویستی (مُعْجِزَة)یەكیتریش لە هەمان ڕەگەزی وردە بەردەكان باس بكا و فەرمووی:

(**نَبْذاً بِهِ**) پێغەمبەرﷺ ئەو وردە بەردانەی بە هاویشتن فڕێدانە لای لەشكری كافرەكان، جا ئەو فڕێدانەش (**بَعْدَ تَسْبِيحٍ**) لە دوای تەسبیحاتكردنی وردە بەردەكان

بوو (بِبَطْنِهِما) لە ناو بەرە دەستەكانى پێغەمبەرداﷺ. واتە: تەسبیحاتى وردە بەردەكان، لە (مُعْجِزَة)يەكىتردا بوو، كە ئەمەیە: ﴿عَنْ أبى ذرٍّ: كـانَ النَّبيُّﷺ جالساً وَحْدَهُ، فجاء أبُوبكْرٍ ثُمَّ عُمرُ ثُمَّ عُثْمانُ فَتناوَلَ النَّبيُّ سَبْعَ حَصيات فَسَبَّحْنَ في يَدهﷺ، ويَسْمَعُ تَسْبِيحَهُنَّ مَنْ في الْحَلْقَة...﴾ الحديث، سنده حسن رواه البزار والطبراني والبيهقي، پێغەمبەرﷺ بە تەنهایی دانیشتبوو، جا ئیمام (أبوبكر) هات، ئینجا ئیمام (عُمر)، ئینجا ئیمام (عُثْمان)، جا پێغەمبەرﷺ حەفت وردە بەردى دانانە ناو دەستى خۆى، جا وردە بەردەكان گوتیان: (سُبْحانَ اللهِ). ئەوەى لەو دانیشگەدا بوو، گوێى لە تەسبیحاتكردنى وردە بەردەكان بوو.

(نَبذَ الْمُسبِّح) فرێدانى وردە بەردەكانو تەسبیحاتەكەیان وەك فرێدانى حەزرەتى (يُونُسْ) پێغەمبەر بووﷺ (مِنْ أحْشاء مُلْتَقِم) لە هەناوى ماسیە قوتدەرەكەوە، لە دواى تەسبیحاتكردنى لە ناو زگى ماسیەكەدا.

واتە: هەروەك حەزرەتى (يُونُس) پێغەمبەرﷺ لە ناو زگى ئەو ماسیەدا كە قوتى دابوو، تەسبیحاتى دەكرد و دەیفەرموو: ﴿لا إلهَ إلا أنْتَ سُبْحانَكَ إنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالمينَ﴾ الأنبياء:٨٧، ئینجا بە فەرمانى خوا ماسیەكە فرێىدا دەرەوە، تەسبیحاتى وردە بەردەكانیش لە ناو دەستى پێغەمبەرداﷺ هەمان تەسبیحاتى خودا بوو و هەر بە فەرمانى خوداش: پێغەمبەرﷺ وردە بەردەكانى فرێدان.

**ئینجا بزانە**: جگە لە وردە بەردەكان، خواردەمەنیش تەسبیحاتى كردوە ﴿عَنْ عَبْدالله...فَلَقدْ رأيْتُ الْماء يَنْبُعُ مِنْ بيْنِ أصابعِ رسُول اللهِﷺ ولَقدْ كُنّا نَسْمَعُ تَسْبيحَ الطَّعامِ وَهُو يُؤْكلُ﴾رواه البخاري، دیتم ئاو هەڵدەقوڵا لە نێوان پەنجەكانى پێغەمبەرﷺ، وە ئێمە گوێمان لە تەسبیحاتكردنى خواردەمەنى دەبوو، لەو حاڵەتەى خواردەمەنیەكە لە لاى پێغەمبەرﷺ دەخورا.

## ﴿الْـفَـصْـلُ الْـخَـامـسْ: فـى مُـعْـجـزاتـهﷺ﴾

### ﴿ بەشى پێنجەم: لە باسى (مُعْجِزَة)كانى پێغەمبەرﷺ ﴾

**پێناسە**: (مُعْجِزَة)=بێتواناكردن، كارێكە لە سنوورى تواناى ئادەمیزاددا نیە، خواى گەورە لە كاتى مەیدان خواستنەوەدا، لە سەر دەستى پێغەمبەرانى خۆى ئەیهێنێتە جێ، تاكو باوەڕیان پێبكرێ، كە ئەڵێ: (من پێغەمبەرى خوامە).

وەکو نەسووتانی (إبْراهیم) پێغەمبەرﷺ، دارعەسای (مُوسی) پێغەمبەرﷺ، مردوو زیندووکردنەوەی (عیسی)پێغەمبەرﷺ، هەروەها: لەتکردنی مانگ بە ئاماژەی پێغەمبەرمانﷺو هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەکانی پیرۆزی...هتد.

**ئینجا بزانە:** (مُعْجِزَة) لە بەهێزی بەڵگەیی‌دا ئەگاتە ئەو پلەیە، کە خوای گەورە بفەرموێ: ﴿صَدَقَ عَبْدِي فِي كُلِّ ما يُبَلِّغُهُ عَنِّي﴾ بەندەی من ڕاست ئەکا لە هەموو ڕاگەیاندنێکی لە لای منەوە.

**جا بزانە:** گەورەترین (مُعْجِزَة)ی پێغەمبەرﷺ: قورئانی پیرۆزە، کە بە بەردەوامی لە ناو خەڵکدا دەمێنێ‌و هیچ پێغەمبەرێك-وەك پێغەمبەری ئێمە-عليهم الصلاة والسلام- (مُعْجِزَة)ی بەردەوامی نیە، هەروەك ئیمامی (الغزالي) لە (إحْياء العُلوم)دا فەرمویەتی.

ئینجا کە لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا ئیمامی (البُوصيري) تەسبیحاتی وردە بەردەکانی وێچواندە تەسبیحاتی حەزرەتی (يُونُس) پێغەمبەرﷺو باسی فڕێدانە دەرەوەیشی کرد، بەم باسکردنەش ئاماژەی بۆ (مُعْجِزَة)یەکی حەزرەتی (يُونُس) پێغەمبەرﷺ کرد، لەو کاتەی لە زگی ماسی فڕێدرا دەرەوە، خوای گەورە درەختێکی کولەکەی بۆ ڕواند تاکو سێبەری لێبکا. ئەم جارە ئیمامی (البُوصيري)ی ویستی باسی ئەوەش بکا: کە هەمان (مُعْجِزَة)ی درەخت، خوای گەورە -بە شێوەیەکی‌تر- داویەتیە پێغەمبەرمانﷺ، جا دەفەرموێ:

(**جَائَتْ**) هاتن (**لِدَعْوَتِه**) بە هۆی بانگکردنی پێغەمبەرﷺ (**الأَشْجارُ**) درەختەکان (**ساجِدَةً**) بە سوجدەبردن (**تَمْشي إِلَيْه**) درەختەکە بۆ لای پێغەمبەر دەڕۆیشت (**عَلَى ساقٍ**) لە سەر باقێکی وەها: کە (**بِلا قَدَمٍ**) بێ پێ بوو.

واتە: بە بێ پێ درەختەکە دەڕۆیشت ﴿عَنْ ابن عَباس-رضي الله عنهما-: جاءَ رَجُلٌ مِنْ بَني عامِرٍ إلى رَسُولِ اللهِﷺ-وحَوْلَ رَسُولِ اللهِﷺ أَعْذاقٌ وَشَجَرٌ- فَقالَﷺ: هَلْ لَكَ أَنْ أُرِيَكَ آيَةً؟ قالَ: نَعَمْ. فَدَعاﷺ عِذْقاً مِنْها فَأَقْبَلَ يَخُدُّ الأَرْضَ وَيَسْجُدُ وَيَرْفَعُ رَأْسَهُ حَتَّى وَقَفَ بَيْنَ يَدَيْهِﷺ ثُمَّ أَمَرَهُ فَرَجَعَ. فَخَرَجَ العامِريُّ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللهِ لا أُكَذِّبُهُ بِشَيْءٍ يَقُولُهُ أَبَداً﴾ حديث صحيح رواه البيهقي وأبو يعلى، پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ، ئەو کات هەندێك دارخورما و درەخت لە دەورەی پێغەمبەرﷺ بون، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایا (مُعْجِزَة)یەکت نیشان بدەم؟ پیاوەکەش گوتی: بەڵێ. جا پێغەمبەرﷺ

بانگی دارخورمایەکی کرد، جا دارخورمایەکە بەرەو لای پێغەمبەرﷺ هاتو هێڵی بە زەویدا دەکێشا و سوجدەی دەبرد و سەری خۆی لە سوجدە بەرز دەکردەوە، تا لە بەر دەستەکانی پێغەمبەرﷺ ڕاوەستا، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە دارخورمایەکە کرد: گەڕاوە شوێنەکەی خۆی، جا پیاوەکەش ڕۆیشتو هەر دەیگوت: واللهِ هیچیتر پێغەمبەرﷺ بە درۆ ناخەمەوە لە هەر شتێکی بیلێ، هەتاهەتایی.

هەروەها وشتریش سوجدەی بۆ پێغەمبەرﷺ بردوە، هەروەك حەزرەتی (أَنَس رضي الله عنه) لە حەدیسە درێژەکەی وشترەکەدا فەرمویەتی: ﴿...فَلَمّا نَظَرَ الْجَمَلُ إِلَى رَسُولِ اللهِﷺ أَقْبَلَ نَحْوَهُ حَتَّى خَرَّ ساجداً بَيْنَ يَدَيْهِ...فَقالَ لَهُ أَصْحابُهُ: يارَسُولَ الله هذه بَهِيمَةٌ لا تَعْقِلُ تَسْجُدُ لَكَ! فَنَحْنُ أَحَقُّ أَنْ نَسْجُدَ لَكَ؟ فَقالَﷺ: لا يَصْلُحُ لِبَشَرٍ أَنْ يَسْجُدَ لِبَشَرٍ، وَلَوْ صَلَحَ لِبَشَرٍ أَنْ يَسْجُدَ لِبَشَرٍ لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِها...﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد بإسناد جيد، کە وشترەکە تەماشای پێغەمبەریﷺ کرد، هاتە لایو لە بەر دەستەکانی پێغەمبەرداﷺ کەوتە سوجدە بردن...جا (صَحابَة)کانرضي الله عنهم فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەمە ئاژەڵێکە عەقڵیشی نیەو سوجدە بۆ تۆ دەبا! ئێمە شیاوترین سوجدە بۆ تۆ ببەین؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ناگونجێ ئادەمیزاد سوجدە بۆ ئادەمیزاد ببا، ئەگەر گونجابا ئادەمیزاد سوجدە بۆ ئادەمیزاد ببا، فەرمانم دەدا: ژن سوجدە بۆ مێردی خۆی ببا.

هەروەها لە حەدیسێکی بێهێزدا هاتووە: مەڕ و بزن سوجدەیان بۆ پێغەمبەرﷺ بردوە، هەروەك ئیمام (ابن كثير) لە (البداية والنهاية)دا هێناویەتی.

**ئینجا بزانە:** بۆیێ ئیمامی (الْبُوصِيرِي) فەرمووی: (الأشْجار) درەختەکان، چونکە (مُعْجِزَة)ی هاتنی درەختەکان زیاتر لە سێ جاریش ڕووی داوە، هەروەك ئاماژەش بۆ هاتنی درەختێکیتر دەکا و دەفەرموێ:

(**كَأَنَّما سَطَرَتْ**) درەختەکە-کە هاتە لای پێغەمبەرﷺ- وەك بڵێی هێڵێکی کێشا (**سَطْراً**) هێڵێکی ڕاست وەکو پێنووس (**لِما كَتَبَتْ**) بە هۆی ئەو نووسینەی (**فُرُوعُها**) لقەکانی نووسیبوی (**مِنْ بَدِيعِ الْخَطِّ**) بە نووسینێکی جوانو ڕاست (**بِاللَّقَمِ**) لە ناوەندی ڕێگەکە.

واتە: درەختەکە-بێ خواروخێچی-ڕاستوڕاست بە ناوەندی ڕێگەدا هاتە لای

پێغەمبەرﷺ، شوێنی لقەکانیشی لە ڕێگەدا دیار بوو. جا ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەم حەدیسە: ﴿عن ابْنِ عُمَر رضي الله عنهما: كُنّا مَعَ رسُولِ اللهِﷺ في سَفَرٍ، فَأَقْبَلَ أعْرابيٌّ، فقالَ لَهُ النَّبِيُّﷺ: ...تَشْهَدُ أن لاَ إلهَ إلاّاللهُ وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ، وأنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ؟ قالَ: مَن شاهِدٌ عَلى ما تَقُولُ؟ قالﷺ: هذه الشَّجَرَةُ. فَدَعاها رسُولُ اللهِﷺ فَأَقْبَلَتْ تَخُدُّ الْأَرْضَ خَدّاً فَقامَتْ بَيْنَ يَدَيْهِﷺ فاسْتَشْهَدَها ثَلاثاً، فَشَهِدَتْ: أَنَّهُ كَما قالَﷺ. ثُمَّ رَجَعَتْ إلى مَنْبَتِها...﴾حديث صحيح رواه الطبراني والبزار و البيهقي بإسناد جيد، لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لە سەرفەرێکدا بوین، عەرەبێکی دەشتاوی هاتە لامان، جا پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: شایەدی ئەدەی: کە جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێك نیەو خوا تەنهایە هاوبەشی نیە، هەم (مُحَمَّد) بەندەو پێغەمبەری خوایە؟ عەرەبەکە گوتی: کێ شاهیدە لە سەر ئەو قسەی تۆ دەیلێی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەم درەختە. جا پێغەمبەرﷺ بانگی درەختەکەی کرد، جا درەختەکەش هاتو هێڵی لە زەوی‌دا دەکێشا، جا لە بەر دەستەکانی پێغەمبەرﷺ ڕاوەستا، جا پێغەمبەرﷺ سێ جار داوای شاهیدی‌ی لە درەختەکە کرد، درەختەکەش هەر سێك جاران شاهیدی دەدا: ڕاستی وەك ئەو ڕاستیەیە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی. ئینجا درەختەکە گەڕاوە شوێنی لیڕوانی خۆی.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصيري) باسی (مُعْجِزَة)ی درەختەکەی کرد، –کە (مُعْجِزَة)یەکی زەمینی‌یە– ویستی ئەو (مُعْجِزَة)یە وێبچوێنێتە (مُعْجِزَة)یەکی‌تری ئاسمانی‌و دەفەرموێ:

(**مِثْلَ الْغَمامَةِ**)، هاتنی درەختەکە بۆ لای پێغەمبەرﷺ، وەك ڕۆیشتنی پارچە هەورەکەی سەر پێغەمبەر بووﷺ کە (**أَنَّى سارَ**) پێغەمبەرﷺ بۆ هەر شوێنێك ڕۆیشتبا (**سائِرَةً**) لەو حاڵەتەدا هەورەکەش بە سەری‌دا دەڕۆیشت‌و سێبەری لێدەکرد، بەو سێبەرە (**تَقِيه**) پێغەمبەریﷺ دەپاراست (**حَرَّ وَطِيسٍ**) لە گەرمایی ڕۆژ –کە وەك تەندور بوو– (**لِلْهَجِيرِ**) کە لە کاتی نیوەڕۆدا (**حَمِي**) گەرم دەبوو.

﴿عَنْ أَبي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه في قِصَّةِ سَفَرِهِﷺ مَعَ عَمِّهِ إلى الشّامِ، حينَ خَلَّفُوهُﷺ في رِعْيَةِ الإبِلِ، قال بَحيرا: أَرْسِلُوا إلَيْهِ فَأَقْبَلَﷺ وَعَلَيْهِ غَمامَةٌ تُظِلُّهُ، فَقالَ بَحيرا: أُنْظُرُوا الَيْهِ عَلَيْهِ غَمامَةٌ تُظِلُّهُ!...﴾حديث حسن رواه الترمذي والبيهقي وصححه الحاكم، کە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ مامی خۆی چووە (شام) لە ڕێگەدا (بَحِيرا)ی(راهِب) میوانداری‌ی

كردن، جا پێغەمبەریانﷺ بۆ لەوەڕاندنی وشترەکان بەجێ‌هێشتبوو، (بَحِيرا) گوتی: بە دوایدا بنێرن با ئەویش بێتە میوانداریەکەم. جا کە پێغەمبەرﷺ هات، پارچە هەورێك لە سەرەوەڕا سێبەری لێدەکرد، جا (بَحِيرا) گوتی: تەماشای بکەن، وا پارچە هەورێك لە سەرەوەیەتی سێبەری لێ‌دەکا!.

هەروەها کە پێغەمبەرﷺ بۆ بازرگانی (خَدِيجَة)ش چووە (شام) دوو (مَلائكَة) لە گەرمایی نیوەڕۆدا سێبەریان لێدەکرد. ئیمام(ابن اسحاق)و ئیمام(ابن سعد) گێڕاویەتیانەوە.

ئینجا ئیمامی (البُوصِيرِي) ئاماژە بۆ (مُعْجِزة)یەکی تری ئاسمانی دەکا و دەفەرموێ: (أَقْسَمْتُ) سوێند دەخۆم (بِالْقَمَرِ الْمُنْشَقِّ) بە خوای ئەو مانگەی بە ئاماژەی پێغەمبەرﷺ دوو لەت بووە ﴿عَنْ أَنَسٍ﴾: أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ سَأَلُوا رَسُولَ اللهِﷺ أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً؟ فَأَراهُمُ الْقَمَرَ شِقَّتَيْنِ، حتّى رأَوْا حراءَ بَيْنَهُما﴾رواه البخاری ومسلم، کافرەکانی (مَكّة) داوایان لە پێغەمبەرﷺ کرد بەڵگەیەکی پێغەمبەرایەتیان نیشان بدا و مانگ لەت بکا؟ جا پێغەمبەرﷺ مانگی نیشان دان بووە دوو لەت، تا کێوی (حِراء)یان لە نێوان هەردوو لەتەکەدا بینی...جا خوای گەورە سەرەتای ئەم سورەتەی ناردە خوارەوە: ﴿اقْتَربتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمرُ...﴾القمر: ١و٢، دونیا وێرانبوون نزیك بوو و مانگ لەت بوو.

**جا بزانە:** (أقْسَمْتُ بِالْقَمَرِ) لێرەدا وەك (وَاسْأَلِ الْقَرْيَةَ)یە، واتە: هەروەك لە ئایەتەکەدا (مُضاف)=(أهْل) نەگوتراوە، ئەوەهاش لێرەدا (مُضاف)=(رَبّ) نەگوتراوە؟ چونکە دروست نیە: سوێند بە دروستکراوی خوا بخورێ، هەروەك لە شەرحی (وَاسْمُهُ قَسَمٌ مِنْ أعْظَمِ الْقَسَمِ) ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

جا ئیمامی (البُوصِيرِي) وەڵامی سوێندەکە ئاشکرا دەکا و دەفەرموێ:

(إنَّ لَهُ) بەڕاستی ئەو مانگە لەتبووە هەیەتی (مِنْ قَلْبِه) لەگەڵ دڵی پێغەمبەرﷺ (نِسْبَةً) وێچوونێکی هەیە. واتە: هەروەك مانگ دوو لەت بووە، ئەوەهاش دڵی پێغەمبەرﷺ دوو لەت کراوە (مَبْرُورَةَ الْقَسَمِ) من لە سوێندخواردنەکەم ڕاستم گوتووەو سوێندم لێناکەوێ، چونکە لەو کاتەی پێغەمبەرﷺ لە لای (حَلِيمَة السَّعْدِيَة) شیری دەخوارد، لەوێ دڵی دوو لەت کراوە ﴿عَنْ أَنَسٍ﴾: أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ أَتاهُ

جِبْرِيلُ عليه السلام وَهُوَ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمانِ فَأَخَذَهُ فَصَرَعَهُ فَشَقَّ عَنْ قَلْبِهِ فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ عَلَقَةً سَوْداءَ وَقالَ: هذا حَظُّ الشَّيْطانِ، ثُمَّ غَسَلَهُ في طَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ بِماءِ زَمْزَمَ ثُمَّ لَأَمَهُ﴾رواه مسلم، وزاد أحمد بسند حسن: ﴿وَخَتَمَ عَلَى قَلْبِي بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ﴾ لەو حاڵەتەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ منداڵان یاری دەکرد، حەزرەتی (جُبْرائِيل)عليه السلام هاتە لای و گرتی و لە سەر پشت درێژی کرد و سینگی لەت کرد و دڵی لێدەرهێنا و لەتی کرد و پارچە خوێنێکی ڕەشی لێدەرهێناو فڕێی دا و فەرمووی: ئەمە بەشی شەیتانە. ئینجا دڵەکەی لە ناو تەشتێکی زێڕدا بە ئاوی (زَمْزَم) شوشت، ئینجا دڵەکەی لە شوێنی خۆی داناوەو سینگیشی پێك وەناوەو مۆری پێغەمبەرایەتیشی لە سەر دڵی دا.

لەم بارەیەوە (عاجز) فەرمویەتی:

**چەند جار مەلائیکەی خودا * شەقیان کرد سینەی (اَلْهُدَى)**

**(حَظّ)ی شەیتانیان کرد جودا * کردیانە گوڵی گوڵزاری من**

ئینجا ئیمامی (الْبُوصيري) باسی چەند (مُعْجِزَة)یەکی کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ دەکاو دەفەرموێ:

**(وَما حَوَى الْغارُ)** یەکێکیتر لە (مُعْجِزَة)کانی پێغەمبەرﷺ ئەوەیە: کە ئەشکەوتەکەی (ثَوْر) وەناوەخۆی گرتبوو (مِنْ خَيْرٍ) لە چاکترینی هەموو خەڵك: کە پێغەمبەرەﷺ، هەم (وَمِنْ كَرَمٍ) لە ڕێزدارترینی ئوممەتی پێغەمبەرﷺ، کە ئیمام (أَبُوبَكْر)ەرضي الله عنه، جا بۆیێ وشەی (كَرَم)ی بۆ ئیمام (أَبُوبَكْر) بە کار هێنا، چونکە لە سەفەری کۆچکردندا ئیمام (أَبُوبَكْر)رضي الله عنه گیانی خۆیو ماڵو منداڵی خۆی هەموو لە خزمەتو لە پاراستنی پێغەمبەرداﷺ بە کار هێنا و قارنانی بە هیچێك لەوانە نەکرد.

**جا بزانە:** کە پێغەمبەرﷺ بۆ کۆچکردن لەگەڵ ئیمام (أَبُوبَكْر)رضي الله عنه لە (مَكَّة)ی پیرۆز چوونە دەرەوە، ماوەی سێ شەوان لە ئەشکەوتی (ثَوْر)دا مانەوە—کە دەکەوێتە خوارەوەی (مَكَّة)– تا کافرەکان نەیانبیننەوە، جا کافرەکان بە دوایاندا هاتنو شوێنهەڵگریشیان لەگەڵدا بوو و گەیشتنە دەورەی ئەشکەوتەکە، بەڵام خوا وای کرد پێغەمبەریانﷺ نەدیت، هەروەك دەفەرموێ:

**(وَكُلُّ طَرْفٍ)** گشت چاوێك (مِنَ الْكُفّارِ) لە چاوی کافرەکان (عَنْهُ) لە دیتنی پێغەمبەرﷺ **(عَمِي)** کوێر بوو و نەیاندیت.

فَالصِّـــدْقُ فِي الْغارِ وَالصِّدِّيقُ لَمْ يَرِمَا (٧٧) وَهُمْ يَقُولُــونَ مَا بِالْغارِ مِنْ أَرِمِ
ظَنُّوا الْحَمامَ وَظَنُّوا الْعَنْكَــبُوتَ عَلَى (٧٨) خَيْرِ الْبَرِيَّةِ لَمْ تَنْسُجْ وَلَمْ تَحُــمِ

جا لەو کاتەی کافرەکان دەورەی ئەشکەوتەکەیان دا، ئیمام (أَبُـوبَكْر)ﷺ فـەرمووی: ئەی پێغەمبـەری خـواﷺ ﴿لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ نَظَرَ تَحْتَ قَدَمَيْــهِ لأَبْصَــرَنا، فقــالﷺ: ماظَــنُّكَ -يا أَبابَكْرٍ- بِاثْنَيْنِ اللهُ ثالِثُهُما﴾رواه البخاري، ئەگەر یەکێك لە کافرەکان لە بن پێی خۆی تەماشامان بکا دەمانبینێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (أَبُـوبَكْر) گومانـت چۆنە بەرامبەر دوو کەسان کە خوای گەورە سێیەمیانە.

جـا لەوانەیـە کەسـێك بڵـێ: پێغەمبـەرﷺو ئیمـام (أَبُـوبَكْر)ﷺ لـەو کاتـدا لـە ئەشکەوتەکەدا نـەمابون، بـۆیێ کافرەکـان نەیانـدیتن؟ جـا ئیمـام (الْبُوصِـيرِي) وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

(فَالصِّـدْقُ) ڕاسـتی-کـە پێغەمبـەرەﷺ-(فِـي الْغـارِ) لـە ئەشـکەوتەکەدا (وَ) هەروەها (الصِّدِّيقُ) ئیمام (أَبُوبَكْرالصِّدِّيق)ش ﷺ لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ (لَمْ يَرِمَا) لـە ئەشـکەوتەکەدا لانەچـوبونو هـەر لـەوێدا بـون، بـەڵام کافرەکـان نەیانـدیتن، بۆیێ (وَهُمْ يَقُولُونَ) کافرەکان دەیـانگوت: (ما بِالْغـارِ) لـە نـاو ئەشـکەوتەکەدا نیـە (مِنْ أَرِمِ) هیچ کەسێك.

جا بۆیێ گوتیان هیچ کەسێك لە ئەشکەوتەکەدا نیە، چونکە خـوای گـەورە بـە جـۆرە سەربازێکی خۆی وەهـا بـەرگریی لـە پێغەمبـەری خۆیﷺ کـرد، کافرەکـان بیریـان لێنەدەکردەوە: کە داپیرۆچکەو کۆتر بون: داپیرۆچکە لە زارکی ئەشـکەوتەکەدا تـەونی کرد، کۆتریش هێلانەی کرد، خوای گەورە بەم تەونو هێلانەیە کافرەکانی فریـو دانو گەڕانەوە، هەروەك ئیمامی (الْبُوصِيرِي) دەفەرموێ:

(ظَنُّوا الْحَمامَ) کافرەکـان گومانیـان بـرد: کـە کۆترەکـەو هـەم (وَظَنُّـوا الْعَنْكَبُوتَ) گومانیـان بـرد: کـە داپیرۆچـکە (عَلَـى خَيْرِ الْبَرِيَّةِ) لـە سـەر چاکترینی خـەڵك کـە پێغەمبـەرەﷺ (لَـمْ تَنْسُجْ) داپیرۆچـکە تـەونی نـەکردوە (وَلَـمْ تَحُـمِ) کۆترەکـەش بەدەورەی پێغەمبەرداﷺ نەسوڕاوەتەوە.

واتە: کافرەکان وەها تێگەیشتن: کۆترە کێویەکە پێغەمبەریﷺ نەدیتووە، بۆیێ لـە زارکی ئەشکەوتەکەدا هێلانەی کردوە ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما فِي حَــدِيثِ الْهِجْــرَةِ: وَخَرَجَ النَّبِيُّﷺ حَتى لَحِقَ بِالْغارِ...فَلَمَّا أَصْبَحَ الْمُشْرِكُونَ اقْتَصُّوا أَثَرَهُﷺ فَصَــعَدُوا

الْجَبَل فَمَرُّوا بالْغار فَرأَوْا عَلَى بابه نَسْجَ الْعَنْكَبُوت، فقالُوا لَوْ دَخَل هَــــهُنا لَمْ يَكُــنْ عَلَى بابِه نَسْجُ الْعَنْكَبُوت، فَمَكَثَ فيه ثَلاثَ لَيالٍ﴾رواه الإمام أحمد بإسناد حسن، لــه شـەوى كۆچكردنەكەدا پێغەمبەرﷺ لە (مَكَّة) چووە دەرەوە، تا هاتــە نــاو ئەشــكەوتەكە، جــا ســبەینێ كافرەكــان بــە شــوێنیدا هــاتن و بــە ســەر كێوى (ثَــوْر) كــەوتن و بــە لاى ئەشكەوتەكەدا ڕابردن، جا كە تەونى داپیرۆچكەیان دیت، گوتیان: ئەگەر (مُحَمَّد)ﷺ هاتبا ناو ئەشكەوتەكە، تەونى داپیرۆچكە لە سەر دەرگەى ئەشكەوتەكە نــەدەبوو. جــا پێغەمبەرﷺ سێ ڕۆژان لە ناو ئەشكەوتەكەدا مایەوە.

﴿وَعَنْ زَيْد بن أَرْقَمَ وَالْمُغيرة بن شُعْبَةَ وَأَنَس بن مالكﷺ في حَديث الْهِجْرَة:...أَمَرَ اللهُ حَمامَتَيْنِ وَحْشيَّتَيْنِ فَوَقَفَتا بِفَمِ الْغار...﴾ رواه ابن سعد والبيهقي وابو نعيم، قال الحافظ ابن كثير: هذا حديث غريب جداً، خــواى گــەورە فــەرمانى بــە دوو كــۆترى كێــوى كــرد: لــە زاركــى ئەشكەوتەكەدا ڕاوەستان...تا كۆتایى.

جــا لەوانەیــە كەســێك بپرســێ: چــۆن خــواى گــەورە بــەو دوو گیانلەبــەرە بــێ‌هێزانــە بەرگرى لە پێغەمبەرﷺ كرد؟! خۆ پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)ى چــەكدار و زرێپۆشــى هــەبون، بۆچــى بــە جــەنگكردن خــۆى نەپاراســت؟ جــا ئیمــامى (الْبُوصــيرِي) وەلام دەداتەوەو دەفەرموێ:

(**وِقايَــةُ اللهِ**) پاراســتنى خــواى گــەورە (**أَغْنَــتْ**) پێغەمبــەروﷺ ئیمــام (أَبُــوبَكْر)ى دەولەمەند كردن، واتە: پێویستیان نــەبو (**عَنْ مُضاعَفَةٍ**) بــە دەبــەركردنى دوو قــات (**مِنَ الدُّرُوعِ**) لە زرێیەكانى پــۆلایى (وَ) هــەروەها دەولەمەنــدى كــردن (**عَنْ عالٍ**) لــە بەرزایى (**مِنَ الأُطُمِ**) قەلایەكان. واتە: بە هۆى پاراستنى خــوا ئــەوان پێویســتییان بــە پۆشینى زرێ‌و چوونە ناو قەلایەكانى بەرز نەبو.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەم فەرموودەیــەى خــواى گــەورە: ﴿إِلاَّ تَنْصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذينَ كَفَرُوا ثانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِه لا تَحْزَنْ إِنَّ اللهَ مَعَنَــا فَأَنزلَ اللهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْه وَأَيَّدَهُ بِجُنُــودٍ لَــمْ تَرَوْهَــا﴾التوبة: ٤٠، ئەگــەر ئێــوە یارمــەتى پێغەمبەرﷺ نەدەن، بێگومان خواى گەورە یارمەتى دەدا، خودا لــەو كاتەش یارمەتى پێغەمبەرىﷺدا: كە كافرەكان لــە (مَكَّة) دەریــانكردە دەرەوە، لــەو حالەتــەىدا كــە پێغەمبەرﷺ یەكێك بوو لە دووانەى بە یەكەوە لە ئەشــكەوتەكەدا بــون، لــەو كاتــدا

پێغەمبەرﷺ بە (أبوبَكْر)ی هاوڕێی خۆی فەرموو: دڵتەنگ مەبەو مەترسە، خودامان لەگەڵدایە، واتە: یارمەتیمان دەدا. جا خوای گەورە دڵنیایی خۆی دابەزاندە سەر پێغەمبەرﷺ، خوای گەورە پشتگیری پێغەمبەریﷺ کرد و بەهێزی کرد بە چەند سەربازێك کە ئێوە نەتاندیتن: کە (مَلائِكَة) بون.

لە بارەی (مُعْجِزَة)کانی ئەشکەوتەکە، (عاجز) فەرمویەتی:

**کافر و شەیتانی لەعین * هاتن لە دویان چین بە چین**
**هەتا لۆ (غار)ێ داوەرین * ئەو (غار)ی پڕ (أنْوار)ی من**
**کە دیتیان تەونی (عَنْكَبُوت) * کۆتر لە هێلانە بە جووت**
**گەڕانەوە لە فایدە پووت * نەیاندەدیت نازداری من**

ئینجا کە ئیمامی (البُوصِيري) باسی ئەوەی کرد: خوای گەورە پێغەمبەری خۆی دەپارێزێ. ئەم جارە باسی ئەوە دەکا: ئەویش بە خاتری پێغەمبەرﷺ لە خوا پاڕاوەتەوەو خوای گەورە پاراستویەتیو دەفەرموێ:

(**ما سامَنِي الدَّهْرُ**) خەڵکی ئەم زەمانە توشی نەکردوم (**ضَيْماً**) هیچ ستەمێك، واتە: هەر کەسێك ویستبی ستەمێکم لێبکا، جا (**وَاسْتَجَرْتُ**) منیش تکای پاراستنم لە خوا کردبێ (**بِهِ**) بە خاتری پێغەمبەرﷺ (**إلاَّ**) ئیللا لە هەموو حاڵەتێکدا (**وَنِلْتُ**) دەستم کەوتووە (**جِواراً**) پاراستنێکی خوای گەورە (**مِنْهُ**) لە لایەن پێغەمبەرەوەﷺ (**لَمْ يُضَمِ**) پاراستنەکەش بێڕێزیی لەگەڵ نەکراوە.

واتە: هەروەك بە دانانی ئەم (قَصِيدَة)یە لە خوا پاڕاوەتەوەو خوای گەورە شیفای نەخۆشیەکەی بۆ ناردوە، ئەوهاش ئەگەر کەسێك ویستبی زیانێکی لێبدا، بە خاتری پێغەمبەرﷺ لە خوا پاڕاوەتەوەو خودا پاراستویەتی.

کەوابوو: پاڕانەوە لە خوا بە خاتری پێغەمبەرﷺ لە دوای وەفاتیشی هەر دروستە، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: ﴿عَنْ مالك الدَّار: أَصابَ النَّاسَ قَحْطٌ فِي زَمَنِ عُمَرَ رضي الله عنه، فَجاءَ رَجُلٌ –وَهُوَ بلالُ بن الْحَرْث الْمُزَنِيُّ الصَّحابيُّ رضي الله عنه– إِلَى قَبْرِ النَّبِيِّ ﷺ فَقالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِسْتَسْقِ لِأُمَّتِكَ فَإِنَّهُمْ قَدْ هَلَكُوا...﴾ الحديث، رواه البيهقي وابن أبيشيبة بإسناد صحيح، وذكره الحافظ العسقلاني في (فتح الباري، باب الإسْتسقاء)، والحافظ ابن كثير في (البداية والنهاية، عام الرّمادة)، واتە: لە سەردەمی ئیمام (عُمَر)رضي الله عنه لە (عام الرّمادَة)دا قاتیو بێبارانی توشی خەڵك بوو، (صَحابَة)یەك –کە (بلال بن الْحَرْث الْمُزَنِي) بوورضي الله عنه– هاتە سەر گۆڕی پێغەمبەرﷺ

گوتی: (يَا رَسُولَ الله) دوعای باران بۆ ئوممەتت بکە، چونکە بە هیلاك چون.

جا کە ئیمامی (البُوصِيرِي) باسی کرد: خوای گەورە بەخاتری پێغەمبەرﷺ پاراستویەتی. ئەم جارە باسی ئەوە دەکا: کە بە هۆی خۆشویستن و شوێنکەوتنی پێغەمبەرﷺ قازانجی دونیا و قیامەتی بەدەست هێناوەو دەفەرموێ:

(وَلاَ الْتَمَسْتُ) هیچ کاتێك داوام نەکردوە (غِنَى الدّارَيْنِ) دەوڵەمەندی دونیاو قیامەت، واتە: هەر کاتێك داوای دەوڵەمەندی دونیاو قیامەتم کردبێ، تا دەستم بکەوێ (مِنْ يَدِهِ) لە نیعمەت و بەرەکەتی پێغەمبەرﷺ (إلاّ) ئیللا لە هەموو حاڵەتێکدا (اسْتَلَمْتُ) وەرمگرتووە (النَّدَى) بەخشینێکی زۆری دونیاو قیامەت (مِنْ خَيْرِ مُسْتَلَمِ) لە چاکترین لێوەرگیراو: کە پێغەمبەرەﷺ.

کەواتە: موسوڵمان بە بەرەکەتی شوێنکەوتنی پێغەمبەرﷺ قازانج و دەوڵەمەندی دونیاو قیامەت وەدەست دێنێ؟ چونکە بۆ ژیانی دونیا-وەك پێغەمبەرﷺ- بە بژێویێکی کەم ڕازی دەبێ و خۆی بە خواپەرستی خەریك دەکا و بە چاوتێری دەژیێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إنَّ اللهَ تَعالَى يَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ تَفَرَّغْ لِعبادَتِي أَمْلأْ صَدْرَكَ غِنىً وَأَسُدَّ فَقْرَكَ﴾حديث صحيح رواه الإمام أحمد والترمذي، خوای گەورە لە حەدیسێکی (قُدْسِي)دا دەفەرموێ: هۆ کوڕی (آدَم)، خۆت یەکلا بکەوە بۆ پەرستنی من، منیش دڵت پڕ دەکەم لە دەوڵەمەندی، هەژاریت پڕ دەکەمەوەو پێویستیت بە هیچ خەڵکێك نابێ.

هەروەها بۆ ژیانی قیامەتیش: شوێن ڕێبازەکەی پێغەمبەرﷺ دەکەوێ و بە ژیانە خۆشەکەی قیامەت شاد دەبێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللهُ﴾ آل عمران:٣١، ئەی پێغەمبەرﷺ بەم خەڵکە بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش ئەوێ، وەرن شوێن من بکەون، تا خوای گەورە ئێوەی خۆش بوێ.

کەواتە: خوای گەورە بە بەرەکەتی شوێنکەوتنی خۆشەویستەکەی خۆیﷺ، خۆشەویستی خۆی بە بەهەشتی خۆی دەوڵەمەند دەکا، والحمد لله تعالى.

جا ئەگەر کەسێك بڵێ: ئەو پێغەمبەرەﷺ چ پێغەمبەرێکە: کە بە شوێنکەوتنی وی دەوڵەمەندیی دونیاو قیامەت دەست دەکەوێ؟ جا ئیمامی (البُوصِيرِي) وەڵام دەداتەوە: ئەو پێغەمبەرەﷺ لە لای خوداوە (وَحْي) بۆ هاتووەو دەفەرموێ:

لا تُنْكِرِ الْوَحْــيَ مِنْ رُؤْياهُ إنَّ لَهُ (٨٢) قَــلْباً إذا نامَتِ الْعَيْنانِ لَمْ يَنَمِ
وَذاكَ حِــينَ بُلُــوغٍ مِــنْ نُبُوَّتِه (٨٣) فَــلَيْسَ يُنْكَرُ فيه حالُ مُحْتَلِمِ

(**لاتُنْكِرِ**) ئینكاری مەكە (**الْوَحْيَ**) هاتنی (وَحْي) بۆ پێغەمبەرﷺ (**مِنْ رُؤْياهُ**) كە سەرەتایەكەی بە خەونی پێغەمبەرﷺ دەستی پێكرد ﴿عَنْ عائشَةَ رضي الله عنها: أَوَّلُ ما بُدئَ به رَسُولُ اللهِﷺ مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيا الصّادقَةُ في النَّوْمِ، فكانَ لا يَرَى رُؤْياً إلاّ جائَتْهُ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ...﴾ الحديث بطوله رواه البخاري ومسلم، سەرەتای دەستپێكردنی (وَحْي) بۆ پێغەمبەرﷺ، خەونی ڕاست بوو، كە لە خەودا دەیدیت، هەر خەونێكی دەیدیت وەك ڕۆشنایی سبەینە دەهاتە جێ.

جا لەوانەیە كەسێك پێی سەیر بێو بڵێ: چۆن لە خەوندا (وَحْي) بۆ پێغەمبەرﷺ دێ؟! جا ئیمامی (البُوصيري) وەڵام دەداتەوەو دەفەموێ:

(**إنَّ لَهُ**) بەڕاستی پێغەمبەرﷺ هەیەتی (**قَلْباً**) دڵێكی ئەوەندە پاكو هەشیار (**إذا نامَتِ الْعَيْنان**) هەر كاتێك چاوەكانی بخەون (**لَمْ يَنَم**) دڵەكەی ناخەوێ.

حەزرەتی (عائشَةَ رضي الله عنها) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ دەخەوی پێش ئەوەی نوێژی (وَتْر) بكەی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إنَّ عَيْنَيَّ تَنامان وَلا يَنامُ قَلْبــي﴾ رواه البخاري، چاوەكانم دەخەون، دڵەكەم ناخەوێ.

جا لەوانەیە كەسێك بڵێ: پێغەمبەرﷺ لە تەمەنی چلساڵیدا بووەتە پێغەمبەروﷺ (وَحْي)ی بۆ هاتووە، جا ئەگەر خەون بە (وَحْي) دابنەدرێ، ئەوە خەونەكانی پێش پێغەمبەرایەتیش هەر بە (وَحْي) دادەندرێن؟ جا ئیمامی (البُوصيري) ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە ڕەد دەكاتەوەو دەفەرموێ:

(**وَذاكَ**) ئەو خەونەی بە (وَحْي) دادەندرێ، ئەو خەونەیە كە (**حينَ**) لەو كاتەی (**بُلُوغٍ**) گەیوەتە (**مِنْ نُبُوَّتِه**) تەمەنی پێغەمبەرایەتی: كە تەمەنی چل ساڵی بوو.

واتە: خەونەكانی پێش ئەو تەمەنە، بە (وَحْي) دانانـدرێن، چونكە لە حەدیسەكەی ڕابردووی (وَحْي)دا فەرمووی: ﴿أَوَّلُ ما بُدئَ به رَسُولُ اللهِﷺ مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيا الصّادقَةُ﴾ سەرەتای دەستپێكردنی (وَحْي) بۆ پێغەمبەرﷺ خەونی ڕاست بوو.

كەوابوو: (**فَلَيْسَ يُنْكَرُ**) ئینكاری ناكرێ (**فيه**) لەو تەمەنەی پێغەمبەرایەتیدا (**حالُ مُحْتَلِم**) حاڵەتی (وَحْي)ی بە خەون، واتە: نابێ ئینكاری ئەوە بكرێ: كە خەونی پێغەمبەرﷺ لە تەمەنی پێغەمبەرایەتیدا بە (وَحْي) دابندرێ.

**جا بزانـه:** مـاوەی ئـەم جـۆرە خەونانـە شـەش مـانگ بـوو، بۆیـێ پێغەمبـەرﷺ فەرمویەتـی: (الرُّؤْيا الْحَسَنَةُ من الرَّجُلِ الصَّالحِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّة وأرْبَعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُـوَّة) رواه البخاري، خەونی ڕاست کە پیاوی چاك لە خەودا دەیبینێ، بەشێکە لـە چـل و شـەش بەش لە پێغەمبەرایەتی.

واتە: چونکە (وَحْي) هەشیاری ماوەی (٢٣) بیستو سێ ساڵ بوو، (وَحْـي) خـەونیش شەش مانگ بوو، شەش مانگیش نیوی ساڵێکە، بیستو سێ سـاڵەکەش چـل و شـەش نیوەی تـێدایـە، کەواتـە شـەش مـانگی خەونەکـە بەشـێکی چـل و شـەش مانگەکـەی هەشیاریەکەیە.

جا لەوانەیە کەسێك بڵێ: بۆچـی پێغەمبـەرﷺ وای نـەکرد پـێش ئـەو تەمەنـە ببێتـە پێغەمبەر، تاکو خەونەکانی پێش ئەو تەمەنەیشی بە (وَحْـي) دابنـدرێن؟ جـا ئیمـامی (البُوصيري) وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

(تَبارَكَ اللّه) پاکیو بێعەیبی بۆ خوایە، ڕەوا نیە ئـەو پرسـیارە بکـرێ! چـونکە (مَـا وَحْيٌ بِمُكْتَسَبٍ) هیچ جۆرێکی (وَحْي) بە وەدەستهێنان نیە، واتە: بە هەوڵدان مـرۆڤ نابێتە پێغەمبەرﷺ، هـەر چـەند مرۆڤەکـەش پلـەو پایـەی زۆر بـەرز بـێ، بـەڵکو بـە دانـانی خـوای گـەورە پێغەمبـەرەکان-علیهم الصلاة والسلام- دەبنـە پێغەمبـەر، خـوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿أللّهُ أعْلَمُ حَيْثُ يجْعلُ رسالَتَهُ﴾ الأنعام:١٢٤، خوای گەورە زاناترە، بـەخۆی دەزانی: کێ شیاوی پێغەمبەرایەتی‌یەو دەیکاتە پێغەمبەر.

(وَ) هەروەها (لانَبِيٌّ) هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خوا-علیهم الصلاة والسلام- (عَلَـى غَيْـبٍ) لە سەر گوتنی (غَيْب)= شتی نادیار (بِمُتَّهَمٍ) تۆمـەتبار نیـە، چـونکە خـوای گـەورە بـە (وَحْي) ئەو (غَيْب)=نادیـارەی داوەتـە ئـەو پێغەمبـەرەﷺ، خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿عالِمُ الْغَيْبِ فلا يُظْهِرُ علَى غَيْبِه أحدًا * إلاَّ مَنِ ارْتَضى مِنْ رَسُولٍ﴾ الجن:٢٦-٢٧، خـوای گەورە زانای زانستی نادیارە، هیچ کەسـێك شـارەزای نادیـاری خـۆی ناکـا، تـەنها ئـەو پێغەمبەرە نەبێ: کە خۆی هەڵیبژێرێو پێی ڕازی‌یە زانستی نادیاری بداتێ.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصيري) ئەوەی ڕوون کردەوە: پێغەمبەرایەتی بە دانـانی خـوای گەورەیەو خوای گەورە لە سەر دەسـتی پێغەمبـەری خـۆی (مُعْجِزَة)کـانیش دروسـت دەکا. ئەم جارەش باسی ئەوە دەکا: کە خوای گەورە لە سـەر دەسـتی پێغەمبـەرﷺ

—وەكو (مُعْجِزَة)— شیفای دەردەداران دەدا و دەفەرموێ:

(**كَمْ أَبْرَأَتْ وصَباً**) چەندەها نەخۆشیی لابردونە (**باللَّمْس**) بە دەست پێداهێنان (**راحَتُهُ**) بەرە دەستی پێغەمبەرﷺ، واتە: شیفایان بۆ هاتووە ﴿عَنِ الْبَراءِ رضي الله عنه: أَنَّ عَبْدَاللهِ بن عَتيكٍ رضي الله عنه لَمَّا قَتَلَ أَبا رافِعٍ الْيَهُودِيَّ انْكَسرتْ ساقُهُ، فَمَسَحَها رَسُولُ اللهِ ﷺ، قال: فَكَأَنَّها لَمْ أَشْتَكِها قَطُّ﴾رواه البخاري، لە كاتی كوشتنی (أَبی رافِع)ی جولەكە، حەزرەتی (عَبْدُاللهِ بن عَتِيكٍ) رضي الله عنه پێی شكا، جا پێغەمبەرﷺ دەستی خۆی پێدا هێنا و شیفای بۆ هات، وەك هیچ كاتێك پێی نەئێشابێ.

﴿وَعَنْ قَتادَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ أُصيبَتْ عَيْنُهُ يَوْمَ بَدْرٍ فَسالَتْ عَلَى وَجْنَتِه، فَغَمَزَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَدَقَتَهُ بِراحَتِه فَكانَ لا يَدْرِي أَيُّ عَيْنَيْهِ أُصيبَ﴾حديث صحيح رواه البيهقي، لە غەزای (بَدْر) حەزرەتی (قَتادَة) رضي الله عنه تیرێكی وەچاوی كەوتو چاوەكەی ڕژا سەر كولمەكەی، جا پێغەمبەرﷺ بە لەپەدەستی خۆی چاوەكەی پاڵداوە شوێنی خۆی، چاوەكەی ئەوها چاك بۆوە: نەیدەزانی كام چاوی تیری وێكەوتووە.

(**وَأَطْلَقَتْ أُرَباً**) هەروەها بەرەدەستی پێغەمبەرﷺ چەندەها گرێی كردونەوە (**مِنْ رِبْقَةِ اللَّمَم**) لە گرێیەكانی شێتی. هەروەك ﴿لە غەزای (ذاتُ الرِّقاع) ئافرەتێك منداڵێكی شێتی هێنا خزمەت پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ دوعای بۆ كردو فەرمووی: ﴿بِسْمِ اللهِ أَنا عَبْدُاللهِ—وفي رِوايَةٍ—: أُخْرُجْ عَدُوَّ اللهِ أَنا رَسُولُ اللهِ﴾رواه الإمام أحمد بسند صحيح، جا منداڵەكە شیفای بۆ هاتو شێتیەكەی نەما﴾.

هەروەها ئافرەتێكی‌تریش منداڵێكی شێتی هێنا، جا پێغەمبەرﷺ دەستی بە سینگی منداڵەكەدا هێنا و منداڵەكە ڕشاوە، شتێكی وەك كوجیلە سەگ لێی هاتە دەرەوە، جا ئەویش شیفای بۆ هاتو شێتیەكەی نەما، ئەمەش ئیمام (أحمد)و (الطبراني) گێڕاویەتیانەوە، جا هەر چەند (سَنَد)ی ئەم حەدیسە بێ‌هێزە، بەڵام حەدیسەكەی‌ڕابردوو، شاهیدیەتی، هەروەك (الحافظ ابن كثير) فەرموویەتی.

ئینجا كە ئیمامی (الْبُوصيري) باسی ئەوەی كرد: بە بەرەكەتی پێغەمبەرﷺ خوای گەورە شیفای دەردەدارانی ئادەمیزادانی داوە. ئەم جارە باسی ئەوەمان بۆ دەكا: كە بە بەرەكەتی پێغەمبەرﷺ خوای گەورە دەردێكی تری ئادەمیزادانو گیانلەبەرەكانی‌تریشی لابردووەو دەفەرموێ:

وَأحْيَت السَّنَةَ الشَّـــهْباءَ دَعْوَتُهُ (٨٦) حَتَّى حَكَتْ غُرَّةً فِي الأَعْصُرِ الدُّهُمِ
بِعارِضٍ جادَ أَوْ خِلْتَ البِطاحَ بِها (٨٧) سَـــيْبٌ مِنَ الْيَمِّ أَوْ سَيْلٌ مِنَ الْعَرِمِ

**(وَأَحْيَت السَّنَةَ الشَّهْباءَ)** سالّی سپی‌ی بێبارانی زیندوو كردەوە **(دَعْوَتُهُ)** دوعایەكەی پێغەمبەرﷺ، واتە: بە دوعای پێغەمبەرﷺ خوای گەورە ئەو زەمینەی بە باران زیندوو كردەوە: كە بە هۆی وشكە سالّی‌و بێبارانی ڕەنگی زەمینەكە سپیپات بوبوو **(حَتَّى)** تا بە جۆرێكی وەها بەو بارانە سەوزایی لە سەر زەمین پەیدا بوو **(حَكَتْ غُرَّةً)** سپیایی زەمینەكە وەك سپیایی نێوچاوانی ئەسپی قەرەبەش كەم بۆوە **(فِي الأَعْصُرِ الدُّهُمِ)** بە بەراورد لەگەڵ سالّە سەوزەكانی‌تر.

واتە: ئەو سالّەی بە دوعای پێغەمبەرﷺ باران باری بە بەراورد لەگەڵ سالّەكانی‌تر، ئەوەندە سەوزایی لە زەمین پەیدا بوو، تا وای لێهات سپیایی وەك سپیایی نێوچاوانی ئەسپی قەرەبەش لە زەمین كەم بۆوە ﴿عَن أَنَسٍ رضي الله عنه بَيْنَما رَسُولُ اللهِﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِذْ جاءَهُ رَجُلٌ فَقالَ: يا رَسُولَ اللهِ قَحَطَ الْمَطَرُ فادْعُ اللهَ أَنْ يَسْقِينا. فَدَعاﷺ فَمُطِرْنا إِلَى الْجُمُعَةِ الْمُقْبِلَةِ﴾رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ وتاری (جُمُعَة)ی دەدا، جا پیاوێك پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا باران ناباریێ، لە خوا بپاڕێوە ئاومان بداتێ. جا پێغەمبەرﷺ دوعای كرد، جا تا (جُمُعَة)كەی‌تر بارانمان بۆ باری.

جا لە بەر ئەوەی لە (بَيْت)ی ڕابردوودا ئیمامی (البُوصيرِي) بە ئاشكرایی باسی هەورو بارانی نەكرد، لەوانەیە كەسێك وا تێبگا: بە دوعای پێغەمبەرﷺ بە بێ هەور و باران زەمینەكە سەوز بووە. جا ئەم تێگەیشتنە ڕەد دەكاتەوەو دەفەرموێ:

**(بِعارِضٍ)** سەوزبوونی زەمین بە هەورێك بوو، كە خوای‌گەورە بە دوعای‌پێغەمبەرﷺ لە ئاسمان پەیدای كرد، ئینجا **(جادَ)** هەورەكەش بارانێكی زۆری پڕ ئاوی باراند **(أَوْخِلْتَ)** تا وا تێگەیشتی‌و گومانت وا بوو: **(البِطاحَ)** دۆڵەكانی (مَكَّة)و (مَدينَة)و دەوروبەریان **(بِها)** پێیاندا دەڕوا **(سَيْبٌ مِنَ الْيَمِّ)** لافاوێكی ڕۆیندە لە دەریاوە **(أَوْ سَيْلٌ مِنَ الْعَرِمِ)** یان ئاوێكی بەرهەڵدراو لە بەنداوی دۆڵەكە.

واتە: زەمین‌و دۆڵەكان بە هۆی بارانی زۆر، وەها دەهاتە بەرچاو: كە ئاوی دەریای بە سەردا هاتبێ، یان بەنداوێك بەرهەڵدرابێ‌و ئاوەكەی ئەو شوێنەی داگرتبێ.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ حەدیسێكی‌تری لەم بابەتە، كە حەزرەتی (أنس)رضي الله عنه فەرموویەتی: ﴿تا (جُمُعَة)كەی تر باران باری، جا پیاوێك گوتی: [يارَسُولَ اللهِ تَهَدَّمَ الْبِناءُ وَغَرِقَ

دَعْنِي وَوَصْفِي آياتٍ لَهُ ظَهَرَتْ (٨٨) ظُهُورَ نارِ الْقِرَى لَيْلاً عَلَى عَلَمِ

---

الْمالُ، فَادْعُ اللهَ لَنا...حَتَّى سالَ وادِى قَناةَ شَهْراً، فَلَمْ يَجِئْ أَحَدٌ مِنْ ناحِيَةٍ إلاَّ حَدَّثَ بِالْجَوْدِ]﴾ رواه البخاري ومسلم، ئەی پێغەمبەری خوا خانوو ڕوخا، ماڵ نقوم بوو، لە خوا بپاڕێوە چیتر نەبارێ...باران ئەوەندە زۆر باری بوو: تا شیوی (قَناة)–لە لای (أُحُد)– ماوەی مانگێك هەر ڕووباری پێدا دەهات، جا هەركەسێك لە هەر لایەك هاتبا (مَدِينَة)، باسی ئەو بارانە زۆرەی دەكرد.

﴿ اَلْفَصْلُ السَّادِسُ فى شَرَفِ الْقُرْآنِ الْكَرِيمِ وَمَدْحِه ﴾

## ﴿ بەشی شەشەم: لە باسی گەورەیی‌و ستایشی قورئانی پیرۆز ﴾

ئینجا لەوانەیە كەسێك بڵێ: (مُعْجِزَة)كانی پێغەمبەرﷺ وەك ڕۆژی ڕوناك ئاشكران، مانگی شەوی چواردەش حەوجەی ئەنگوستێ نیە، واتە: پێویستی بە ئاماژە نیە، ئیتر پێویست ناكا هەندە درێژەی پێبدەی؟ جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) وەڵامی دەداتەوەو دەفەرموێ:

(دَعْنِي) وازم لێبێنە (وَوَصْفِي آياتٍ) تاكو بە هۆنراوە باسی چەند (مُعْجِزَة)یەك بكەم (لَهُ ظَهَرَتْ)كە لە بۆ پێغەمبەرﷺ ئاشكرا بوینە (ظُهُورَ نارِ الْقِرَى) وەك ئاشكرایی ئاگری میوانداری (لَيْلاً) لە شەوێدا (عَلَى عَلَمٍ) لە سەر كێوێكی بەرز.

عادەتی ناندەرەكانی عەرەب ئەوها بوو: لە شەوێدا لە سەر كێوێكی بەرزی نزیك ماڵەكەیان ئاگریان دەكردەوە، تاكو لە دورەوە دیار بێ‌و ڕێبوارەكان بەو ئاگرە ماڵەكەیان ببیننەوەو ئەوانیش میوانداریان بكەن‌و نانیان بدەنێ.

جا مەبەستی ئیمامی (الْبُوصِيرِي) ئەوەیە: هەرچەند (مُعْجِزَة)كانی پێغەمبەرﷺ وەك ئاگری سەر كێوێكی بەرز ئاشكران، بەڵام تكات لێدەكەم: وازم لێبێنە تاكو بە هۆنراوە باسی (مُعْجِزَة)كانی پێغەمبەرﷺ بكەم، بەڵكی منیش–بەو باسكردنە– بێمە ڕیزی ئەو كەسانەی ستایشی پێغەمبەریانﷺ كردوەو هەم –بەو باسكردنە– فەرمانی پێغەمبەرﷺ بەجێ‌دێنم كە فەرموویەتی: ﴿بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً﴾رواه البخاري، لەجیاتی من ڕابگەیێنن، هەرچەند ئایەتێكی قورئانیش بێ.

كەواتە: حەدیسەكانی پێغەمبەرﷺ زیاتر پێویستیان بە ڕاگەیاندن هەیە؟ چونك ئەوان–وەكو قورئان–پارێزراو نین.

فَالدُّرُّ يَزْدادُ حُسْناً وَهْوَ مُنْتَظِـمٌ (٨٩) وَلَيْس يَنْقُصُ قَدْراً غَيْرَ مُنْتَظِـمِ
فَما تَطاوُلُ آمالُ الْمَـديحِ إلَـى (٩٠) مَا فيهِ مِنْ كَرَمِ الأَخْلاقِ وَالشِّيَمِ

ئینجا ئەم جارەش ئیمامی (الْبُوصيرِي) هۆی باسکردنی (مُعْجِزَة)کان بە هۆنراوە، باس دەکا و دەفەرموێ:

(فَالدُّرُّ) گەوهەر= لُؤْلُؤ= یاقوت (يَزْدادُ حُسْناً) جوانیەکەی زیاتر دەبێ (وَهُوَ مُنْتَظِمٌ) لەو حاڵەتەی بە داوێك ڕیز کرابێ، بەڵام (وَلَيْسَ يَنْقُصُ قَدْراً) ڕێزداریی گەوهەرەکەش هیچ کەم نابێتەوە (غَيْرَ مُنْتَظِمٍ) لەو حاڵەتەی داوڕیزکراو نیە، چونکە یاقوت= گەوهەر لە خودی خۆیدا ڕێزدار و بەنرخە.

کەواتە: گشت (مُعْجِزَة)کانی پێغەمبەریشﷺ تەنها تەنها لە خودی خۆیدا ڕێزدارە، هەرچەند بە بڵاویش لە کتێبەکانی (حَديث)و (سيرَة)دا باس کراون، بەڵام ئەگەر وێکڕا لە یەك شوێندا کۆ بکرێنەوە، جوانتر دێنە بەرچاو، بە تایبەتیش ئەگەر بە هۆنراوە بێ، خەڵك زیاتر سودی لێدەبینێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً﴾ رواه البخاري، بەڕاستی هەندێك هۆنراوە داناییو قسەی بە سود و لەجێیە.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصيرِي) لە هەردوو (بَيْت)ی ڕابردوودا فەرمووی: وازم لێبێنە تاکو بە هۆنراوە باسی (مُعْجِزَة)کانی پێغەمبەرﷺ بکەم، چونکە هۆنراوە جوانتر دەبێ. لەوانەیە کەسێك بڵێ: ئایا تۆ دەتوانی بە هۆنراوە باسی هەموو ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەرﷺ بکەی؟ ئەویش وەڵام دەداتەوەو بێتوانایی خۆیو خەڵکی تریش ئاشکرا دەکا و دەفەرموێ:

(فَما تَطاوُلُ) ئایا سودی چییە درێژەدانی (آمالُ الْمَدِيحِ) ئومێدەکانی ستایشکار؟ کە هەوڵ ئەدا (إلَى مَا) هەموو ئەو ڕەوشتانە بزانێ: کە (فِيهِ) لە پێغەمبەرداﷺ هەنە (مِنْ كَرَمِ الأَخْلاقِ) لە ڕەوشتە ڕێزدارەکانو هەم (وَالشِّيَمِ) لە تەبیعەتو عادەتە ڕێزدارەکان.

واتە: هەوڵدانی ستایشکار بە ئومێدی ئەوەی بتوانێ باسی هەموو سیفەتەکانی پێغەمبەرﷺ بکا، هەوڵدانێکی بێسودەو ئومێدەکەشی نایەتە جێ، چونکە (مُعْجِزَة)کانو ڕەوشتەکانو عادەتەکانی پێغەمبەرﷺ زۆر لەوە گەورەتر و زۆرترن: کەسێك بتوانێ بە هۆنراوە باسیان بکا، بەڵکو خوای گەورە بەخۆی بە تەواوی مەدحی پێغەمبەری خۆیﷺ کردووەو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾القلم:٤،

www.iqra.ahlamontada.com

آياتُ حَــقٍّ مِّنَ الرَّحْمَنِ مُحْــدثَةٌ (٩١) قَدِيمَةٌ صِــفَةُ الْمَوْصُوف بِالْقِــدَمِ
لَمْ تَقْتَرِنْ بِزَمانٍ وَهْــيَ تُخْــبِرُنا (٩٢) عَــنِ الْمَــعادِ وَعَنْ عادٍ وَعَنْ إِرَمِ

بەڕاستی تۆ–ئەی پێغەمبەرﷺ– لە سەر ڕەوشتێکی گەورەی. کەوابوو: هەر ڕەفتار و ڕەوشتێکی بەرز و باش هەبێ لەم دونیایەدا، گشتی لە پێغەمبەرداﷺ کۆ بۆتەوە، بۆیێ حەزرەتی(عائِشَة)-رضي الله عنها-فەرمویەتی: ﴿کانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ﴾حديث صحيح رواه الإمام أحمد وغيره، ڕەوشتی پێغەمبەرﷺ ڕەوشتی قورئان بوو.

ستایشکاریش دەڵێ:

**وَلَمّا أَرادَ اللّهُ لِلْمَعْلاةِ أَنْ تَجَسَّدا * قالَ لَها: كُونِي. فَكانَتْ مُحَمَّداﷺ**

کە خوای گەورە ویستی ڕەوشتی بەرز ببێتە جەستە، فەرمانی پێکرد: ببە. ئەویش بووە (مُحَمَّد)ﷺ.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) دانی نا: کە ناتوانی باسی هەموو (مُعْجِزَة)و ڕەوشتەکانی پێغەمبەرﷺ بکا، پێشتریش گفتی دابوو: باسی چەند (مُعْجِزَة)یەك بکا، ئەم جارە گفتەکەی خۆی دێنێتە جێو دەفەرموێ:

(**آياتُ حَقٍّ**) یەکێك لە (مُعْجِزَة)کانی پێغەمبەرﷺ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزن و هەر هەموویان ڕاستن (**مِنَ الرَّحْمَنِ**) لە لایەن خوای بەخشندەوە (**مُحْدَثَة**) هاتونەتە خوارەوەو لە لای ئێمەش دەخوێندرێنەوەو دەنووسرێنەوەو لەبەر دەکرێن، جا ئەو نووسینەو خوێندنەوەیە–بە پیتو دەنگەوە– پەیدا کراوەو ڕۆژ بە ڕۆژیش ئەوانە نوێ دەبنەوە.

بەڵام قورئانی پیرۆز لەو ڕووەی کە فەرموودەی خوایە، ئەوە دروستکراو و پەیداکراو نیە، بەڵکو (**قَدِيمَةٌ**) سیفەتێکی (أَزَلِی)یەو (**صِفَةُ الْمَوْصُوفِ**) سیفەتی ئەو خوایەیە کە وەسف کراوە (**بِالْقِدَمِ**) بە سیفەتی (الْقِدَمِ)=(أَزَلِيَّة)، واتە: هەبوونێکی بێ سەرەتا.

جا سیفەتی (الْقِدَم) لەم حەدیسە وەرگیراوە: ﴿کە پێغەمبەرﷺ دەچووە ناو مزگەوت ئەم دوعایەی دەکرد: (أَعُوذُ بِاللهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ وَسُلْطانِهِ الْقَدِيمِ مِنَ الشَّــيْطانِ الرَّجِيمِ)﴾ رواه أبوداود بسند صالح.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی ڕابردوودا فەرمووی: قورئان سیفەتی خوایە. ئەم جارە ڕەدی (مُعْتَزِلَة) دەداتەوەو ئەوەمان بۆ باس ئەکا: کە قورئان دروستکراو نیەو هەر لە(أَزَل)دا سیفەتی خوایە. جا دەفەرموێ: (**لَمْ تَقْتَرِنْ بِزَمانٍ**) ئایەتەکانی

قورئان بەرامبەر هیچ ڕۆژگارێك نین، چونكە قورئان سیفەتی خوایە، خـوای گـەورەش بە زاتو سیفەتەوە (أَزَلِي)و (أَبَدِي)یە، ڕۆژگاریش دروستكراوی خوایە، كەوابوو: پێش دروستكردنی ڕۆژگار، لە (أزَل)دا قورئان سـیفەتی خوایـە، پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ﴿كانَ اللهُ وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ غَيْرُهُ﴾رواه البخاري، خوای گەورە لە (أَزَل)دا هەبوو، جگە لـە خۆی هیچ شتێكیتر نەبو.

(وَهِـيَ تُخْبِرُنـا) ئایەتــەكانی قورئــان زانیــاری داهاتوومــان دەدەنــێ (عَـنِ الْمَعـادِ) لەبارەی گەڕانەوەمان—لە دوای مردن— بۆ لای خوای گەورە، لە چەندەها ئایەتـەكانی قورئاندا ئەو زانیاریە هاتووە، بۆ نمونە: خوای گەورە دەفەرموێ:﴿كَمَـا بَـــدَأْنا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ﴾ الانبياء:١٠٤، هەروەك لە سەرەتادا ئادەمیزادمان دروست كـردوە، ئـەوهاش دووبارە دروستی دەكەینەوە.

(وَ)هەروەها ئایەتەكانی قورئان زانیـاری ڕابردووشمـان دەدەنـێ (عَنْ عـادٍ) لـەبارەی هۆزەكەی (عاد): كە گەلی حەزرەتی (هود) پێغەمبەرﷺ بونو ئیمانیان پێ نـەهێنا و خوای گـەورە بـە ڕەشـە بـا لـەناوی بـردن (وَعَنْ إِرَمٍ) هـەروەها زانیاریمـان دەدەنـێ لەبارەی شاری (إِرَم)ش: كە شوێنی دەوڵەتی (عـاد) بـوو، خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ * إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ * الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلادِ﴾الفجر: ٦-٨، ئایا نابینی= نەتزانیوە: خوای گەورە چی لـە هـۆزی (عـاد) كـرد، ئـەو هـۆزەی خەڵكی (إِرَم)ی خاوەن كۆشكو تەلاری بەرز بون، هۆزێكی ئەوەندە بەهێز و باڵا بەرز بون: خوای گەورە وێنەی ئەوانی لە شارەكاندا دروست نەكردبوو.

ئینجـا ئیمـامی (الْبُوصِـيرِي) باسـی ئـەوەمان بـۆ دەكـا: كـە قورئـانی پـیرۆز لـە (مُعْجِزَة)كانی هەموو پێغەمبەران-عليهم الصلاة و السلام- گـەورەترەو تایبەتـە بـە پێغەمبـەری ئێمەﷺ، جا دەفەرموێ:

(دَامَتْ لَدَيْنا) ئایەتەكانی قورئانی پـیرۆز لـە لای ئێمـە ماونەتـەوەو هـیچ گۆڕانكـاری تێیاندا نەكراوەو هەر ئەوهاش دەمێننەوە، خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحافِظُونَ﴾الحجر:٩، بەڕاستی ئێمە قورئانمـان ناردۆتـە خـوارەوە، بەڕاسـتی ئێمە پارێزەری قورئانین.

(فَفاقَتْ) جـا بـەم مانەوەیـە قورئـانی پـیرۆز بـاڵاتر بـووە (كُلَّ مُعْجِـزَةٍ) لـە گشـت

(مُعْجِزَة)كانىتر كه (مِنَ النَّبِيِّين) كه له سهر دهستى پێغهمبهرهكانىتر-عليهم الصلاة والسلام- هاتون (إذْ جائَتْ) چونكه (مُعْجِزَة)كانى پێغهمبهرهكانىتر تهنها له سهردهمى ئهواندا هاتون‌و (ولَمْ تَدُم) له دواى خۆيان نهماونهوه‌و براونهتهوه.

بهلاّم قورئانى پیرۆز-كه (مُعْجِزَة)ى پێغهمبهرى ئێمهيهﷺ- له دواى وهفاتيشى بێ گۆرانكارى به پارێزراوى دهمێنێتهوه، پێغهمبهرﷺ فهرموويهتى:﴿ما مِنَ الأَنْبِياءِ نَبِيٌّ إلاّ أُعْطِيَ مِنَ الآياتِ ما مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإنَّما كانَ الَّذى أُوتِيتُهُ وَحْياً أَوْحــاهُ اللهُ إلَيَّ، فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تابِعاً يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾رواه البخاري ومسلم، هــهر پێغهمبــهرێك لــه پێغهمبهرهكانى خوا-عليهم الصلاة والسلام-ههر ئهوهنده (مُعْجِزَة)ى دراونىٚ: كه به وێنهى (مُعْجِزَة)كـه ئادهميزادان ئيمانى پێ بێنن، جا (مُعْجِزَة)كه براوهتهوه، بـهلاّم (مُعْجِـزَة)كـهى مـن-كـه قورئانه- به (وَحْي) خوا بۆ منى ناردوه‌و نابڕێتهوه، بۆيێ تكام وايه: له ڕۆژى قيامهتـدا له ههموانيان زياتر شوێنكهوتهم ههبن. واتـه: تكـام وايـه بـه هـۆى مانـهوهى قورئـان، ئوممهتى من له ئوممهتى پێغهمبهرهكانىتر-عليهم الصلاة والسلام-زياتر بێ.

ئينجا ئيمامى (البُوصِيرِي) باسى ڕێك‌وپێكى قورئان دهكا و دهفهرموىٚ:

(مُحَكَّماتٌ) ئايهتـهكانى قورئـان پتـه‌و و ڕێـك‌و جـوانن (فَمـا تُـبْقِينَ) ناميێڵنـهوه (مِـنْ شُبَه) هيچ گومانێك (لِذِى شِقاقٍ) بۆ كـافرى بهدبـهخت، واتـه: كـافرى بـێ‌بـاوهڕ دان دێنىٚ به جـوانى‌وپتـهوى ئايهتـهكانى قورئانـدا، بـهلاّم لـه بهدبـهختى خـۆى ئيمـانى پـێ ناهێنىٚ. خواىگهوره دهفهرموىٚ: ﴿كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾ هود:١، ئهم قورئانه كتێبێكه ئايهتهكانى پته‌و و ڕێك‌و جـوان كـراون، ئينجـا كاروبـارى دونيا و ئايينيش ڕوون كراوهتهوه له لايهن خوداى كارلهجێ‌و خهبهردار.

(وَ) ههروهها (مَاتَبْغِينَ) ئايهتهكانى قورئان داوا ناكـهن (مِنْ حَكَمٍ) هـيچ دادوهرێـك، چونكه قورئانى پیرۆز بهخۆى (حاكِم)= دادوهره به سهر هـهموو دادوهرێـك‌و بـه سـهر ههموو خهڵكىتريشدا، بۆيێ خواى گهوره دهفهرموىٚ: ﴿أَفَغَيْــرَ اللهِ أَبْتَغِــي حَكَمــاً﴾ الأنعام:١١٤، چۆن جگه له خوا داواى دادوهرێكىتر بكهم؟!.

كهوابوو: ههر كهسێك باوهڕى به بڕيارى قورئان نهبىٚ، ئهوه كافره‌و ئيمانى نيه، بۆيێ خواىگهوره سوێند دهخوا و دهفهرموىٚ: ﴿فَلا وَرَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَــا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجاً مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْــلِيماً﴾النساء: ٦٥.

سوێندم به خوای تۆ–ئەی پێغەمبەرﷺ– ئەوان ئیمان ناهێنن تا ئەتۆ نەکەنــه (حَکَــم)= ناوبژیکار لەو کێشەیەی لە نێوانیاندا ڕوو ئەدا، ئینجـا لــه نـاو دڵیانیشـدا نـابێ هـیچ دڵتەنگیەك هەبێ بە هۆی ئەو بڕیارەی تۆ داوتە، دەبی بە ئاشکرایی‌و پەنهانی ملکەچــی بڕیارەکەت بن.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصِيرِي) لـه (بَيْـت)یڕابـردوودا فـەرمووی: قورئـانی پـیرۆز هـیچ گومانێکی بۆ هیچ کافرێك نەهێشتۆتەوە. لەوانەیە کەسێك بڵێ: ئەی بۆچی کافرەکانی عەرەب–هەر هەموویان– ئیمانیان بە پێغەمبەرﷺ نەهێنا و جـەنگیان لەگـەڵ کـرد؟ جا ئیمامی (البُوصِيرِي) وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

(**ماحُورِبَتْ قَطُّ**) هێنەری ئایەتـەکانی قورئـان هـیچ کاتێـك جـەنگی لەگـەڵ نـەکراوە، واتــه: هــەر کاتێـك بــه هـۆی هێنـانی قورئـان جـەنگ لەگـەڵ پێغەمبــەرﷺ کرابــێ‌و بەرهەڵستیی کرابێ (**إلاَّ عادَ**) ئیللا گەڕاوەتـەوە (**مِنْ حَرَبٍ**) بە هۆی توندیی قورئان (**أَعْدَى الأَعَادِي**) دوژمـنترین دوژمنــی ئیســلام (**إلَيْها**) گەڕاوەتــەوە لای ئایەتـەکانی قورئان (**مُلْقِيَ السَّلَمِ**) چەکی فڕێ داوەو داوای ئاشتیی کردوە، جـا دوژمنەکـە: یـان موسوڵمان بووە، یان وازی لە جەنگ هێناوە.

**بۆ نموونــه:** یـەکێك لـه بـەهێزترین دوژمنـانی ئیسـلام (عُمَـر بـن الْخَطـاب) بـوو، جـا (أبوجهل) گوتـی: هەر کەسێك (مُحَمَّد)ﷺ بکوژێ، سەد وشتری دەدەمـێ؟ جـا (عُمَـر بن الْخَطاب) گوتـی: من دەیکوژم. جا کاتێك ڕۆشت‌و لە ڕێگەدا لایدا ماڵی خوشکەکەی خۆی...جا خوشکەکەی کاغەزێکی دایێ: سورەتی (طَه)ی تـا ئایـەتی ﴿إِنَّنِي أَنَا اللهُ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي﴾طه: ١٤، تـێدا نووسراو بوو، واتە: بەڕاستی هـەر من خودامە، جگە لە من هیچ پەرستراوێکیتر نیە، کەوابوو: مـن بپەرسـتەو نوێـژم بـۆ بکە تا منت لە یاد بێ.

جا کە (عُمر) خوێندیەوە، یەکسەر کاری لێکرد و گوتی: ئەمە قسەیەکی چەند جوانە، ئـەو خوایـەی ئـەوها دەڵـێ، پێویسـتە لەگـەڵ ئـەودا هـیچ خودایـەك نەپەرسـترێ، (مُحَمَّد)مﷺ نیشان بدەن...جا (عُمر) موسوڵمان بوو.

واتــه: یەکســەر بــه خوێندنــەوەی چــەند ئایـەتێکی قورئـان ئـەو دوژمنــه بـەهێزە لــه دوژمنایەتی گەڕاوەو چەکی فڕێدا و موسوڵمان بوو، جا لەئەنجامدا بووە ئیمام

(عمر)و (أمير المؤْمنين)=گەورەی ئیمانداران. رضی الله عنه حيا وميتا. ئیتر زۆر لە کافرەکانیش پێکهاتنی جەنگ نەکردنیان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ مۆر کردوە، لە بەر درێژی نەمنووسین.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی‌رابردوودا باسی کرد: ئەو کەسانەی دوژمنی پێغەمبەرﷺ بون، بە هۆی ئایەتەکانی قورئان تەسلیم بون‌و داوای ئاشتییان کرد. ئەم جارە ئەوەمان بۆ باس دەکا: ئەو کەسەی بەرهەڵستی خودی قورئانیشی کردوە، ئەویش شکستی هێناوە. جا دەفەرموێ:

(رَدَّتْ) پوچەڵی کردۆتەوە (بَلاغَتُها) ڕەوانبێژی‌ی ئایەتەکانی قورئان (دَعْوَى مُعارِضِها) هەوڵدانی بەرهەڵستکاری ئایەتەکانی قورئان.

واتە: ڕەوانبێژی‌ی قورئان داوای ئەو کەسەی ڕەد کردۆتەوە، کە دەیەوێ بەرهەڵستی قورئان بکا و دەڵێ: من دەتوانم شتێکی وەك قورئان دابهێنم.

جا بە جۆرێکی وەها ئەو داوایەی ڕەد کردۆتەوە: (رَدَّ الْغَيُورِ) وەك ڕەدکردنەوەی پیاوی بە ناموس‌و بە غیرەت (يَدَ الْجانِي) دەستی تاوانکاری بێناموس (عَنِ الْحُرُمِ) لە ئافرەتە مەحرەمەکانی خۆی.

تەماشا بکە: خوای گەورە چۆن خەڵکی لەو داوایە بێ منەت کردوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذا الْقُرْآنِ لا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾ الإسراء:٨٨، ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ: ئەگەر ڕەوانبێژەکانی ئادەمیزاد و جنۆکە کۆ ببنەوە لە سەر هێنانی وێنەی ئەم قورئانە، ناتوانن وێنەی ئەم قورئانە بێنن، هەرچەند هەندێکیشیان ببنە پاڵپشتی هەندێکیان.

ئیتر ئەوە ئەرز و ئەوە گەز، لەو ڕۆژەوە کە خوای‌گەورە ئەو مەیدانەی خواستۆتەوە، تا ئێستاش هیچ بەرهەڵستکارێکی قورئان بە ئاوات نەگەیشتووەو بووەتە گاڵتەجاری ڕەوانبێژەکان‌و خەڵکی‌تریش، تەماشا بکە: (مُسَيْلَمَةَ الْكَذَّاب)علیه اللعنة، ویستی بەرهەڵستی سورەتی (النّازِعات)بکا و گوتی: (والطّاحِناتِ طَحْناً وَالْعاجِناتِ عَجْناً وَالْخابِزاتِ خَبْزاً). جا بەم قسە ناڕێکانە سوك‌و ڕسوا بوو.

هەروەها ڕوو ڕەشێکی‌تریش بەرهەڵستی سورەتی (القارِعَة)ی کرد و گوتی: (الْفِيلُ مَاالْفِيل وَماأَدْراكَ مَاالْفِيل لَهُ ذَنَبٌ قَصِيرٌ وَخُرْطُومٌ طَوِيل إِنَّ ذلِكَ مِنْ خَلْقِ اللهِ لَقَلِيل). ئیتر قوڕ بەسەری ئەو کەسەی جەنگی قورئان دەکا و دێتە

لَها مَعَان كَمَوْجِ الْبَحْرِ فِي مَـــدَد (٩٧) وَفَوْقَ جَوْهَرِه فِي الْحُسْنِ وَالْقِيَمِ
فَما تُعَدُّ وَلا تُحْـــصَى عَـــجائِبُها (٩٨) وَلا تُسامُ عَلَى الإِكْـــثارِ بِالسَّـــأَمِ

مەیدانی سەرشۆڕی‌و گاڵتەجاڕی.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا فەرمووی: ڕەوانبێژی‌ی قورئان شکستی هێناوەتە سەر بەرهەڵستکارەکانی. لەوانەیە کەسێك بە گومانەوە بڵێ: ئایا قورئان لە ڕووی واتەکەشیەوە هەر ڕەوانبێژی‌ی تێدایە؟ جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

(لَهامعَانٍ) ئایەتەکانی قورئان مانای ئەوەندە زۆریان هەنە: سەرژمێر ناکرێن، چونکە لە زۆری‌دا (كَمَوْجِ الْبَحْرِ) وەك شەپۆلی دەریانە (فِي مَدَدٍ) لە پاڵپشتی‌کردنی یەکتری‌دا.

واتە: هەروەك شەپۆلەکانی دەریا بە دوای یەکتری‌دا دێن‌و پاڵپشتی یەکتری دەکەن، ئەوهاش مانایەکانی قورئانی پیرۆز پاڵپشتی یەکتری دەکەن‌و مەبەستی یەکتری ڕوون دەکەنەوە، بەڵام مانای ئایەتەکانی قورئان کۆتاییان نایێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا﴾الكهف:١٠٩، ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ: ئەگەر ئاوی دەریا مەرەکەب بێ بۆ نووسینەوەی فەرمودەکانی خوای من، ئەوە ئاوی دەریا دەبڕێ‌و نامێنێ، بەڵام فەرموودەکانی خوای من هەر دەمێنن‌و کۆتاییان نایێ، هەرچەند بە وێنەی ئاوی دەریاش ئاوی‌تر بە پاڵپشت بێنین.

(وَ) هەروەها (فَوْقَ جَوْهَرِهِ) مانای ئایەتەکانی قورئان لە سەرەوەی گەوهەری دەریانە (فِي الْحُسْنِ) لە جوانی‌دا، هەم (وَالْقِيَمِ) لە بەنرخی‌دا، چونکە خوای گەورە بە (جوانتر) مەدحی قورئانی کردوەو دەفەرموێ: ﴿اللهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ﴾الزمر:٢٣، خوای‌گەورە جوانترین فەرموودەی ناردۆتە خوارەوە کە قورئانی پیرۆزە.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا فەرمووی: مانایەکانی ئایەتەکانی قورئان وەك شەپۆلەکانی دەریا زۆرن‌و لە گەوهەری دەریاش جوانتر و بە نرختزن.

ئەم جارە دەفەرموێ:

کەوابوو: (فَما تُعَدُّ) نازمێردرێن‌و (وَلاتُحْصَى) سەرژمێر ناکرێن (عَجائِبُها) واتەو مانا سەرسوڕهێنەر و بێوێنەکانی ئایەتەکانی قورئان.

دەگێڕنەوە: کیژۆڵەیەکی عەرەب شیعرێکی گوت، جا (الأصْمعِي) گوتی: ئای تۆ چەند ڕەوانبێژی! کیژۆڵەکەش گوتی: ڕەوانبێژیی من بە چی دادەندرێ بەرامبەر فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾القصص:٧، بە دایکی (مُوسَى) پێغەمبەرمان ڕاگەیاند: شیری خۆت بدە (مُوسَى)، جا هەر کاتێك لە (فِرْعَوْن) ترسای زیانێك لە (مُوسَى) بدا، یەکسەر فڕێی بدە ناو ڕووباری (نِیل)، ترسی لەناوچوونی (مُوسَى)ت نەبێو غەمباریش مەبە، ئێمە (مُوسَى) دەگەڕێنینەوە لای تۆ، هەم دەیکەنە پێغەمبەرﷺ.

جا کیژۆڵەکە گوتی: خوای گەورە لەم ئایەتەدا: دوو فەرمانو دوو قەدەغەو دوو هەواڵو دوو مژدەی کۆ کردونەوە.

(وَ) هەروەها (**لاتُسامُ**) واز لە قورئان ناهێندرێ (**عَلَى الإكْثارِ**) هەرچەند زۆریش بخوێندرێتەوە (**بِالسَّأَمِ**) بەهۆی وەڕەزبوون.

واتە: هەرچەند زۆر جاریش قورئان بخوێندرێتەوە، مرۆڤ لێی وەڕەز= بێزار نابێ، چونکە فەرموودەی خوایە، بەلام لە قسەی خەڵکی وەڕەز دەبێ، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿...لا يَشْبَعُ مِنْهُ الْعُلَماءُ وَلا يَخْلُقُ عَلَى كَثْرَةِ الرَّدِّ وَلا تَنْقَضِي عَجائِبُهُ...﴾ رواه الترمذي بسند غريب، زانایان لە قورئانی پیرۆز تێر نابن، قورئان-هەرچەند زۆریش بگوترێتەوە- کۆن نابێو مرۆڤ لێی وەڕەز نابێ، سەرسوڕهێنەرەکانی قورئان کۆتاییان نایێ.

هەی ئافەرین بۆگەلی کورد، کە دەڵێن: (**زۆر گۆتن قورئان خۆشە**).

ئینجا کە ئیمامی (البُوصِيرِي) لە (بَيْت)یڕابردوودا فەرمووی: هەرچەند زۆر جاریش قورئان بخوێندرێ، مرۆڤ لێی وەڕەز نابێ. ئەم جارە باسی خێر و سودەکانی خوێندنی قورئان دەکا و دەفەرموێ:

(**قَرَّتْ**) شادمانو ڕۆناك بوو (**بِها**) بە هۆی خوێندنی ئایەتەکانی قورئان (**عَيْنُ قارِيها**) چاوی خوێنەرەکەی، واتە: بە هۆی خوێندنی قورئان چاوی قورئانخوێنەکە شادمانو دڵخۆش دەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَلا بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾الرعد:٢٨، ئاگادار بن بە زیکری خوا دڵەکان ئارامو شادمان دەبن.

جا له بەر ئەوەی قورئانخوێنەكە دڵخۆش دەبێ (**فَقُلْتُ لَهُ**) منیش پێم گوت: (**لَقَدْ ظَفِرْتَ**) بەڕاستی بەختەوەر بوییو وەدەستت هێنا (**بِحَبْلِ الله**) پەیمانی خودا، واتە: بە ئایەتەكانی قورئان ڕێبازی خوای گەورەت وەدەست هێناوە، كەوابوو: (**فاعْتَصِم**) دەست بەو قورئانەوە بگرە، دەتگەیەنێتە سەر ڕێی ڕاستو گومڕا نابی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ألا وَإنِّي تارِكٌ فيكُمْ ثَقَلَيْن، أحَدُهُما: كتابُ الله هُوَ حَبْلُ الله مَنْ اتَّبَعَهُ كانَ عَلَى الْهُدَى وَمَنْ تَرَكَهُ كانَ عَلى الضَّلالَة...﴾رواه مسلم، ئاگادار بن: من دوو شتی قەدرگران بۆ ئێوە بەجێ دێڵم، یەكەمیان: قورئانی پیرۆزە، ئەو قورئانە پەیمانی خوایە، هەر كەسێك شوێنی بكەوێ، ئەوە لە سەر ڕێی ڕاستە، هەر كەسێكیش وازی لێبێنێ، ئەوە لە سەر گومڕاییە...

ئینجا ئیمامی (**البُوصيري**) مژدەیەكیتریش دەداتە قورئانخوێنەكەو دەفەرموێ:

(**إنْ تَتْلُها**) ئەگەر تۆ ئایەتەكانی قورئان بخوێنی (**خيفَةً مِنْ**) لە ترسی (**حَرِّ نارِ لَظَى**) گەرمایی ئاگری دۆزەخ، ئەوە (**أطْفَأْتَ**) تۆ دەكوژێنیەوە (**نارَ لَظى**) ئاگری دۆزەخ (**مِنْ وِرْدِها**) بە هۆی شوێنی هێنانی ئاوی ئایەتەكان (**الشَّبِمِ**) كە ئاوێكی سارد و فێنكە.

واتە: هەروەك بە ئاوی سارد تێنووەتی لادەچێو ئاگر دەكوژێندرێتەوە، ئەوهاش بە هۆی خوێندنی قورئان، ئاگری دۆزەخ لە خۆت دەكوژێنیەوەو لە تێنووەتی دۆزەخ ڕزگار دەبیو بە بەهەشت شاد دەبێ.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿يجيءُ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقيامة فيَقُولُ: يارَبِّ حَلِّه فَيُلْبسُ تاجَ الْكَرامَة، ثُمَّ يَقُولُ: يارَبِّ زِدْهُ فَيُلْبَسُ حُلَّةَ الْكَرامَة، ثُمَّ يَقُولُ: يارَبِّ ارْضَ عَنْهُ فَيَرْضَى عَنْهُ، فَيُقالُ لَهُ: اقْرأْ وارْقَ وَتُزادُ بكُلِّ آيَةٍ حَسَنَةً﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، لە ڕۆژی قیامەتدا قورئانی پیرۆز دێتو بۆ قورئانخوێنەكەی دەپاڕێتەوەو دەڵێ: خوایە ئەم قورئانخوێنە جوان بكە. ئینجا تاجی ڕێزداریی لە سەر دەندرێ، ئینجا دەڵێ: خوایە زیاتری بدێ. ئینجا خشڵی ڕێزداریی دەبەر دەكرێ، ئینجا دەڵێ: خوایە لێی ڕازی بە. خوای گەورەش لێی ڕازی دەبێ، جا پێی دەگوترێ: قورئان بخوێنەوە-واتە: وەك لە دونیادا دەتخوێند-و لە نهۆمەكانی بەهەشت سەركەوەو بە خوێندنی هەر ئایەتێكیش چاكەیەكت بۆ زیاد دەكرێ.

واتە: هەر کەسێکیش خوا لێی ڕازی ببێو بچێتە بەهەشت، ئەوە لە بەهەشت نایەتە دەرەوەو بەدبەخت نابێ.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصيري) لە(بَيْت)ی‌ڕابردوودا فەرمووی: ئەگەر لە ترسی ئاگری دۆزەخ قورئان بخوێنی، ڕزگار دەبی. ئەم جارە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: ئەگەر قورئانخوێنەکە گوناهباریش بێو بە ئیمانەوە مردبێ، قورئان شەفاعەتی بۆ دەکا، هەرچەند چوبێتە ناو دۆزەخیش، جا دەفەرموێ:

(**كَأنَّها الْحَوْضُ**) ئایەتەکانی قورئان وەك ئاوی حەوزن، واتە: ئاوی ڕوباری (الْحَياة)= ڕوباری ژیان، کە لە بەر دەرگەی بەهەشتە (**تَبْيَضُّ الْوُجُوهُ**) جەستەکانی ڕەشبوو سپی دەبنەوە (**بِهِ**) بە ئاوەکەی بەهەشت (**مِنَ الْعُصاةِ**) جەستەی هەندێك گوناهباران (**وَقَدْ جاؤُوهُ**) لەو حاڵەتەی گوناهبارەکان دێنە سەر ئاوەکەی بەهەشت (**كَالْحُمَمِ**) وەك خەڵوزەکان سوتاوڕنو ڕەش بوینە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إذا دَخَلَ أهْلُ الْجَنَّة الْجَنَّةَ وَأهْلُ النّارِ النّارَ، يَقُولُ اللهُ تَعالَى: مَنْ كانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إيمانٍ فَأخْرِجُوهُ. فَيُخْرَجُونَ مِنْها حُمَمًا قَدْ امْتُحِشُوا، فَيُلْقَوْنَ فِي نَهْرِ الْحَياةِ، فَيَنْبُتُونَ كَما تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ﴾رواه البخاري ومسلم، کاتێ بەهەشتیەکان چوونە ناو بەهەشت، دۆزەخیەکانیش چونە ناو ئاگر، خوایگەورە دەفەرموێتە شەفاعەتکاران: هەر کەسێك بە ئەندازەی دنکە گلێرەیەك ئیمانی لە دڵدا بوبێ، ئێوە لە دۆزەخ بیهێننە دەرەوە. جا شەفاعەتکارەکان هەندێك خەڵوز دێننە دەرەوە کە بە تەواوی سوتاون، جا خەڵوزەکان فڕێ دەدرێنە ناو ڕوباری (الْحَياة)=ڕوباری ژیان لە بەر دەرگەی بەهەشت، جا زیندوو دەبنەوە، هەروەك دنکەکەی ناو لیتەی لافاو زوو سەوز دەبێ.

جا مەبەست ئەوەیە: هەر وەك بە شەفاعەتی شەفاعەتکاران گوناهبارەکانی ڕەشبوو لە دۆزەخ دەهێندرێنە دەرەوەو بە ئاوی بەهەشت زیندوو دەبنەوەو سپی دەبنەوە، ئەوهاش قورئانی پیرۆز شەفاعەت دەکا و گوناهبارەکانی ڕەشبوو لە دۆزەخ دێنێتە دەرەوەو سپییان دەکاتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿الصِّيامُ وَالْقُرْآنُ يَشْفَعانِ لِلْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيامَةِ...وَيَقُولُ الْقُرْآنُ: مَنَعْتُهُ النَّوْمَ بِاللَّيْلِ فَشَفِّعْنِي فِيهِ: فَيُشَفَّعانِ لَهُ﴾حديث صحيح رواه الإمام أحمدوالطبراني، ڕۆژوو و قورئان لە ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەت بۆ بەندە

دەکەن...قورئان دەڵێ: خودایە لە شەوێدا نوستم لەو قورئانخوێنە قەدەغە کردوە، کەوابوو: شەفاعەتم بۆ وی قبوڵ بکە، جا خوای گەورە شەفاعەتەکەیان قبوڵ دەکا.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) سودەکانی قورئانی لە ڕۆژی قیامەتدا باس کردن، ئەم جارە سودەکانی دونیایشی باس دەکا و دەفەرموێ:

(**وَكَالصِّراطِ**) ئایەتەکانی قورئان وەکو پردی دۆزەخە: کە خەڵك بەگوێرەی کردەوەکانی بە سەریدا دەڕوا بۆ بەهەشت، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿فَيَمُرُّ أَوَّلُكُمْ كَالْبَرْقِ...ثُمَّ كَمَرِّ الرِّيحِ ثُمَّ كَمَرِّ الطَّيْرِ وَشَدِّ الرِّجالِ، تَجْرِي بِهِمْ أَعْمالُهُمْ، وَنَبِيُّكُمْ قائِمٌ عَلَى الصِّراطِ يَقُولُ: رَبِّ سَلِّمْ سَلِّمْ...﴾رواه مسلم، سەرەتایەکەتان وەك بروسك بە سەر پردەکەدا ڕادەبری...ئینجا وەك با، ئینجا وەك باڵندەو وەك غاردانی پیاوان، کردەوەکانی خۆیان دەیانڕوێنن، لەو حاڵەتەشدا پێغەمبەری خۆتانﷺ لە سەر پردەکە ڕاوەستاوەو دەڵێ: خودایە سەلامەت بکە، سەلامەت بکە.

واتە: هەروەك بە تێپەڕبوونی سەر پردی دۆزەخ، مرۆڤ دەگاتە مەبەستی خۆی کە بەهەشتە، ئەوهاش بە دەستپێوەگرتنی قورئان دەگاتە هەمان مەبەستی خۆی.

(وَ) هەروەها (**كَالْمِيزانِ**) ئایەتەکانی قورئان وەك تەرازووی ڕۆژی قیامەتە (**مَعْدِلَةً**) لە ڕووی دادپەروەریەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيامَةِ فَلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً﴾الأنبياء: ٤٧، ئێمە تەرازووی دادپەروەری دائەنێین لە ڕۆژی قیامەت، هیچ کەسێك شتێکی کەمیش ستەمی لێناکرێ.

واتە: هەروەك تەرازووی قیامەت دادپەروەریی تێدایەو ستەمی تێدا نیە، ئەوهاش یاسای قورئان دادپەروەریی تێدایەو ستەمی تێدا نیەو بە دەستپێوەگرتنی قورئان دادپەروەری دەچەسپێ‌و جێگیردەبێ.

کەوابوو: (**فَالْقِسْطُ**) هەوڵدان بۆ دادپەروەری (**مِنْ غَيْرِها**) لە سەرچاوەیەکی تری جگە لە قورئان (**فِي النّاسِ**) لە ناو خەڵکیدا (**لَمْ يَقُمِ**) بەردەوام نەبوەو جێگیریش نابێ، چونکە خوای گەورە هەر بەخۆی ئەم خەڵکەی دروست کردوەو هەر بەخۆیشی دەزانێ چۆن یاسای بەڕێوەبردنی بۆ دابنێ، هەروەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾النحل:٧٤، بەڕاستی خوای گەورە ئەزانێ، ئێوە نازانن.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) مەدحی قورئانی کرد و ڕوونی کردەوە: قورئانی پیرۆز

لا تَعْجَبَنْ لحَسُــود راحَ يُنْكــرُها (١٠٣) تَجاهُلاً وَّهْــو عَيْنُ الْحاذق الْفَهِمِ
قَدْ تُنْكرُ الْعَيْنُ ضَوْءَ الشَّمْس مِنْ رَّمَدٍ (١٠٤) وَيُنْكرُ الْفَمُ طَعْمَ الْماء مِنْ سَقَمِ

بەختەوەری دونیا و قیامەتی تێدایە. جێی خۆیەتی کەسێك بڵێ: کە ئەو قورئانە ئەوەندە ڕێزدار و بە سودە، بۆچی زۆرینەی ئەو خەڵکە ڕەفتاری پێ‌ناکا و باوەڕیان پێی نیە؟ جا وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

(**لاتَعْجَبَنْ**) پێت سەیر نەبێ‌و سەرت سوڕ نەمێنێ (**لِحَسُودٍ**) لەو حەسودەی (**راحَ**) ڕۆیی‌و دەستی پێکردوە (**يُنْكِرُها**) ئینکاری ئایەتەکانی قورئان دەکا و دانی پێدا نامێنێ (**تَجاهُلاً**) نەزانی خۆی ئاشکرا دەکا (**وَهُوَ**) لە حاڵەتێکدا ئەو حەسودە نەزان نیە، بەڵکو (**عَيْنُ الْحاذِقِ**) خودی زیرەکێکی (**الْفَهِمِ**) زۆر تێگەیشتووە.

واتە: لە لای تۆ سەیر نەبێ: کەسانێك باوەڕیان بە قورئان نیەو خۆیان بە نەزان دێننە بەرچاو، لە حاڵەتێکدا ئەوان تێگەیشتوون‌و زۆر چاك دەزانن قورئان ڕاستەو گومانی تێدا نیە، بەڵام بە هۆی بەدڕەوشتی‌و حەسودی دانی پێدا ناهێنن‌و لە سەر هەمان ڕێبازی جولەکەو دیانەکان دەڕۆن، کە خوای گەورە باسیان دەکا و دەفەرموێ: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ﴾ البقرة:١٠٩، زۆر لە جولەکەو دیانەکان خۆزگەی ئەوە دەکەن: لە دوای موسوڵمانبوونتان بتانگەڕێننەوەو بتانکەنە کافر، بە هۆی حەسودی‌بردنیان بە ئێوە، پاش ئەوەی بۆیان ڕوون بۆتەوە: کە ئایینی ئێوە ئاینێکی ڕاستەو گومانی تێدا نیە.

ئینجا ئیمامی (الْبُوصيرِي) وێچواندێك بۆ ئەو حەسودە دێنی‌و تێیدا ئاشکرا دەکا: داننەهێنانی حەسودەکە بە هۆی ئەوە نیە: کە قورئان عەیبێکی هەبێ، بەڵکو عەیب لە حەسودەکەدا هەیە، هەروەك دەفەرموێ:

(**قَدْ تُنْكِرُ الْعَيْنُ**) هەندێ جار چاو ئینکاری دەکا و ڕازی نابێ (**ضَوْءَ الشَّمْسِ**) بە تیشکی ڕۆژ=هەتاو (**مِنْ رَمَدٍ**) بە هۆی چاوئێشان، هەروەك (**وَيُنْكِرُ الْفَمُ**) دەم ڕازی نابێ (**طَعْمَ الْماءِ**) بە تامی ئاوی خۆش‌و سارد (**مِنْ سَقَمِ**) بە هۆی نەخۆشی، هیچ عەیبێکیش: نە لە ڕۆژ و نە لە ئاودا نیە.

کەوابوو: ئەو کەسەی دان بە قورئاندا ناهێنی‌و ئینکاری دەکا، ئەوە نەخۆشی‌ی لە ناو دڵدایە، هەروەك (الْوَلِيد بن الْمُغِيرة)ﷺ، بە هۆی نەخۆشی کوفر ئینکاری قورئانی

يا خَيْرَ مَنْ يَمَّمَ الْعافُونَ ساحَتَهُ (١٠٥) سَعْياً وَفَوْقَ مُتُونِ الْأَيْنُقِ الرُّسُمِ

دەكرد و لێیشی تێکەیشتبوو و دەشیزانی ڕاستەو گوتی: ﴿وَاللهِ إِنَّ لِقَوْلِهِ الَّذِى يَقُولُهُ حَلاوَةٌ وَإِنَّ عَلَيْهِ لَطَلاوَةً، وَإِنَّهُ لَمُثْمِرٌ أَعْلاهُ مُغْدِقٌ أَسْفَلُهُ وَإِنَّهُ لَيَعْلُو وَلا يُعْلَى عَلَيْهِ﴾رواه اسحاق بن راهويه، سوێندم بە خوا: ئەو قورئانەی (مُحَمَّد)ﷺ دەیڵێ، شیرنایەتی ی هەیەو جوانی ی لە سەرە، سەرەوەی بەردەرەو بنەوەی پڕ ئاوە، ئەو قورئانە زاڵ دەبێ و زاڵبوون بە سەری دا نابێ.

## ﴿ اَلْفَصْلُ السَّابِعُ: فِى إِسْرائهِ وَمِعْراجِهِ ﷺ ﴾

**﴿بەشی حەفتەم: لە باسی شەوڕۆیی و سەرکەوتنی پێغەمبەرﷺ بۆ ئاسمانەکان﴾**

(**الإِسْراء**): شەوڕۆیی پێکردنی پێغەمبەرﷺ لە (مَكَّة)ی پیرۆزەوە بۆ (الْمَسْجِد الْأَقْصَى)-لە (فَلَسْطِين)- لە بەشێکی شەوێ دا.

(**الْمِعْراج**): سەرکەوتنی پێغەمبەرﷺ لە (الْمَسْجِدالْأَقْصَى)وە بۆ سەرەوەی هەر حەفت ئاسمانەکان لە هەمان شەوەکەی شەوڕۆیی دا.

ئەم (مُعْجِزَة) گەورەیە بە گیان و جەستەی پێغەمبەرﷺ بوو و خەون نەبو، لە شەوی هەینی (٢٧) بیست و حەفتی مانگی (رَجَب)، ساڵی دوانزەی پێغەمبەرایەتی، واتە: بە ساڵێك و چەند مانگێك پێش کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ، ڕووی دا. جا تکایە: ئەم باسە بە تەواوی لە (مێرگ و گوڵزاری بەهار)دا بخوێنەوە.

ئێنجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) باسی قورئانی پیرۆزی کرد، کە گەورەترین (مُعْجِزَة)ی پێغەمبەرەﷺ، ئەم جارە باسی (مُعْجِزَة)یەکی تری پێغەمبەرﷺدەکا: کە شەوڕۆیی و سەرکەوتنی پێغەمبەرەﷺ بۆ ئاسمانەکان، جا پێش بچێتە ناو باسەکە-بە دواندن= گفتوگۆی ڕووبەڕوو- باسی زیارەتی پێغەمبەرﷺدەکا و دەفەرموێ:

(**یاخَيْرَ مَنْ**) هۆ ئەو پێغەمبەرەیﷺ چاکترینی ئەو کەسانەی: کە (**يَمَّمَ الْعافُونَ**) داواکارانی چاکە سەردانیان دەکەن و دێنە (**ساحَتَهُ**) دەوروبەری ماڵەکانیان.

جا بۆیێ باسی دەوروبەری ماڵەکەی کرد، چونکە دەوروبەری ماڵەکەی پێغەمبەرﷺ مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَا بَيْنَ بَيْتِى وَمِنْبَرِى رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ، وَمِنْبَرِى عَلَى حَوْضِى﴾ رواه البخاري ومسلم، نێوان مینبەرەکەم و ماڵەکەم-کە گۆڕەکەی منی تدایە- مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت،

مێنبەرەکەم لە سەر حەوزی کەوسەرەکەمە.

ئینجا ئەو کەسانەش کە زیارەتی پێغەمبەرﷺ دەکەن (سَعْیاً) بە پیادەیی‌و بە پەلە دێن، هەم (وَفَوْقَ مُتُونِ) لە سەر پشتی (الْأَيْنُقِ) ئەو وشترانەش دێن: کە (الرُّسُمِ) جێی پێیەکانیان لە زەویدا دیارە.

**چۆنیەتی زیارەتکردنی پێغەمبەرﷺ**: پێش زیارەتکردنی پێغەمبەرﷺ، دوو رەکعەت (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) لە مزگەوتی پێغەمبەرداﷺ بکە، ئینجا برۆ لای گۆڕی پێغەمبەرﷺ سەلامی لێبکەو بڵێ: (اَلسَّلامُ عَلَيْكَ يارَسُولَ الله) چونکە پێغەمبەر فەرموویەتی: ﴿ما مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إلاَّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلامَ﴾ رواه أبوداود بسند صحيح، هەر کەسێك سەلامم لێبکا، خوای گەورە گوفتارم دەداتەوە تا وەڵامی سەلامەکەی بدەمەوە.

جا چۆنیەتی زیارەتکردنەکەم بە درێژی لە (مێرگو گوڵزاری بەهار)و لە (ڕووناکی رب العالمین)دا ڕوون کردۆتەوە.

بەڵام ئەو خێرەش لە دەست خۆت مەدە: کە هەموو نوێژەکانت بە جەماعەت لە مزگەوتی پێغەمبەرداﷺ بکەی، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ صَلَّى فِي مَسْجِدِي أَرْبَعِينَ صَلاةً لاَ تَفُوتُهُ صَلاةٌ كُتِبَتْ لَهُ بَراءَةٌ مِنَ النَّارِ وَبَراءَةٌ مِنَ الْعَذابِ وَبَرِئَ مِنَ النِّفَاقِ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والطبراني، هەر کەسێك لە مزگەوتی مندا چل نوێژ بکاو هیچ نوێژێکی لە دەست نەچێ، ئەوە ڕزگاربوونێکی لە ئاگر بۆ دەنوسرێ‌و ڕزگاربوونێکیشی لە عەزابی خوا بۆ دەنوسرێ‌و لە (نِفاق)و درۆ و فێڵبازی دوور دەکەوێتەوە.

ئینجا هەروەك (مُعْجِزَة)ی شەوڕۆیی‌و سەرکەوتن‌و (مُعْجِزَة)کانیتریش نیشانەی ڕاستیی پێغەمبەرنﷺ، ئەوهاش پێغەمبەریشﷺ بەخۆی نیشانەی ڕاستی‌و پوختی ئایینی ئیسلامە، هەروەك ئیمامی (الْبُوصيري)دەفەرموێ:

(وَمَنْ) هۆ ئەو پێغەمبەرەیﷺ (هُوَ الْآيَةُ الْكُبْرَى) بەخۆی گەورەترین نیشانەیە (لِمُعْتَبِرٍ) بۆ گشت ئەو کەسانەی بیر دەکەنەوەو بە دوای بەڵگەکانی ناسینی حەق‌و ناحەقدا دەگەڕێن، واتە: بە تەنها ناسینی پێغەمبەرﷺ، ئەوان دەزانن: ڕێبازەکەی ڕاستە، هەروەك خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾الشورى:٥٢،

سَرَيْتَ مِنْ حَرَمٍ لَيْلاً إلَى حَرَمٍ (١٠٧) كَمَا سَرَى الْبَدْرُ فِي دَاجٍ مِّنَ الظُّلَمِ
وَبِتَّ تَرْقَى إلَى أَنْ نِلْتَ مَنْزِلَةً (١٠٨) مِنْ قَابِ قَوْسَيْنِ لَمْ تُدْرَكْ وَلَمْ تُرَمِ

---

بەڕاستی تۆ -ئەی پێغەمبەرﷺ- ڕێنموونی خەڵك ئەكەی بۆ ڕێگایەكی ڕاست.
**(وَمَنْ)** هۆ ئەو پێغەمبەرەیﷺ **(هُوَ النِّعْمَةُ الْعُظْمَى)** بەخۆی گەورەترین نیعمەتە **(لِمُغْتَنِمِ)** بۆ گشت ئەو كەسانەی دەیانەوێ بەختەوەری وەدەست بێنن، جا بەختەوەری بەردەوامیش لەو ئیسلامەدایە: كە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إنَّ اللهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلا تَمُوتُنَّ إلاّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾البقرة: ٢٣١، خوای گەورە ئایینی ئیسلامی بۆ ئێوە هەڵبژاردوە، كەوابوو: نەكەن ئێوە بمرن، تەنها هەر بە موسوڵمانی دەمرن.
**جا بزانە:** (مُعْجِزَة)ی شەوڕۆیی و سەركەوتن بۆ ئاسمانەكان، تایبەتە بە پێغەمبەرﷺ، بۆیێ ئیمامی (الْبُوصِيري) -بە دواندن- بە پێغەمبەرﷺ دەڵێ:
**(سَرَيْتَ)** ئەی پێغەمبەرﷺ شەوڕێیت كرد **(مِنْ حَرَمٍ)** لە (حَرَم)ی (مَكَّة)وە **(لَيْلاً)** لە بەشێكی كەمی شەوێكدا **(إلَى حَرَمٍ)** بۆ (حَرَم)ی (بَيْت الْمُقَدَّس)=(الْمَسْجِد الأقْصَى)، **(كَمَا سَرَى الْبَدْرُ)** وەك شەوڕۆیی مانگی شەوی چواردە **(فِي دَاجٍ)** لە شەوی تاریكدا **(مِنَ الظُّلَمِ)** لە چەندەها تاریكی.
خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾الإسراء: ١، پاكو بێعەیبی بۆ ئەو خوایەی شەوڕۆیی كرد بە بەندەی خۆی -مُحَمَّدﷺ- لە بەشێكی شەویدا لە (اَلْمَسْجِدِالْحَرام)وە لە (مَكَّة)ی پیرۆز، بۆ (اَلْمَسْجِدالأَقْصَى)= (بَيْتالْمُقَدَّس) لە (فَلَسْطِين)، ئەو (اَلْمَسْجِدالأَقْصَى)ی پیتو بەرەكەتمان كردۆتە دەورەی، ئەو شەوڕۆییە بۆ ئەوە بوو هەندێك لە بەڵگەكانی توانای خۆمان نیشانی پێغەمبەرﷺ بدەین، بەڕاستی خوای گەورە بیسەر و بینەرە.
ئینجا كە پێغەمبەرﷺ گەیشتە (الْمَسْجِدالأقْصَى) لەوێ (مِعْراج)ی بۆ داندرا و بۆ ئاسمانەكان سەركەوت، هەروەك ئیمامی (الْبُوصِيري) دەفەرموێ:
**(وَبِتَّ)** هەر لەو شەوەدا -ئەی پێغەمبەرﷺ- دەستت پێكرد **(تَرْقَى)** بۆ هەر حەفت ئاسمانەكان سەر دەكەوتی، بە هاوڕێیەتی حەزرەتی (جُبْرائِيل)عليه السلام **(إلَى أنْ نِلْتَ مَنْزِلَةً)** تا لە ئاسمانەكان تێپەڕیی و گەیشتە پلەیەكی ئەوەندە بەرز **(مِنْ قَابِ**

قَوْسَيْنِ) كە لە نزیکیدا بە ئەندازەی قابی دوو کەوانان بوو (لَمْ تُدْرِكْ) ئەو پلەیە- لە پێش تۆدا- هیچ کەسێك نەیگەیوەتێو هەم (وَلَمْ تُرَمْ) داواش نەکراوە، چونکە ئەو پلەیە تایبەت بە تۆیە.

کەوابوو: لە دوای پێغەمبەریشﷺ هیچ کەسێك ناگاتە ئەو پلەیەو هیچ کەسێکیش داوای ناکا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ عُرِجَ بِي حَتَّى ظَهَرْتُ لِمُسْتَوًى أَسْمَعُ فِيهِ صَرِيفَ الْأَقْلامِ...قالﷺ: ثُمَّ انْطَلَقَ بِي جِبْرِيلُ حَتَّى نَأْتِي إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى...﴾الحديث بتمامه رواه البخاري ومسلم، ئینجا بۆ ئاسمانەکان سەرکەوتنم پێکرا، تا گەیشتمە ئەو ئاستەی گوێم لە سرەی پێنووسەکان بوو-کە (مَلائِكَة) بڕیارەکانی خوای گەورەیان دەنووسی-...ئینجا (جُبْرائِيل) لەگەڵ خۆیا بەرەو سەرەوەتر بردمی تا هاتینە لای درەختەکەی (سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى).

واتە: زانستی (مَلائكَة)و پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام- لە (سِدْرَةِالْمُنْتَهَى) کۆتایی دێ، بۆیێ حەزرەتی (جُبْرائيل)عليه السلام لەوێ لە پێغەمبەرﷺ جیا بۆوە.

لەم بارەیەوە (عاجز) فەرمویەتی:

**لە فەوقی ئەو خودایە بەس * ناگاتە جێی ئەو شاهە کەس**
**لە عالەمێ جودایە بەس * لوءلوئی گەوهەرداری من**

جا پێش سەرکەوتن بۆ ئاسمانەکان، لە (الْمَسْجِدالْأَقْصَى)دا پێغەمبەرﷺ پێشنوێژی بۆ پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام-کرد، هەروەك ئیمامی (الْبُوصِيرِي) دەفەرموێ:

(**وَقَدَّمَتْكَ**) ئەی پێغەمبەرﷺ ئەتۆیان- بۆ پێشنوێژی- وەپێش خۆیان خست (**جَمِيعُ الْأَنْبِياء**) هەموو پێغەمبەرەکان-عليهم الصلاة والسلام- (**بِها**) لە (الْمَسْجِدالْأَقْصَى)دا، لە هەمان شەوی شەوڕۆییدا (وَ) هەروەها (**الرُّسْلِ**) هەموو پێغەمبەرەکانی (مُرْسَل)یش بۆ پێشنوێژی تۆیان وەپێش خست (**تَقْدِيمَ مَخْدُومٍ**) وەك وەپێشخستنی گەورەیەکی خزمەتکراو (**عَلى خَدَمٍ**) لە سەر خزمەتکارەکانی.

پێغەمبەرﷺ لە حەدیسەکەی شەوڕۆییدا فەرموویەتی: ﴿...ثُمَّ مَضَيْنا حَتَّى أَتَيْنا بَيْتَ الْمُقَدَّسِ فَرَبَطْتُ الدَّابَّةَ بِالْحلقَة الَّتِي تَرْبِطُ بِها الْأَنْبِياءُ. ثُمَّ دَخَلْنا الْمَسْجِدَ فَنُشِرَتْ لِي الْأَنْبِياءُ مَنْ سَمَّى اللهُ وَمَنْ لَمْ يُسَمِّ، فَصَلَّيْتُ بِهِمْ﴾رواه الطبراني في الكبير بسند صحيح ورواه الإمام أحمد ومسلم وابن أبي حاتم بمعناه، ئینجا منو (جُبْرائِيل) ڕۆیشتین تا هاتینە (بَيْتَ الْمُقَدَّسِ)، جا

(الْبُراق)م بەستەوە لەو ئاڵقەیەی پێغەمبەرەکان وڵاغی خۆیان لێ‌دەبەستەوە، ئینجا چوینە ناو (الْمسْجِدالأَقْصَى)و پێغەمبەرەکانم بۆ کۆ کرانەوە: ئەوانەی خوا لە قورئانـدا باسـی کردونو ئەوانەی باسی نەکردون، جا من پێشنوێژیم بۆکردن.

**جا بزانە:** بۆیێ لە واتەی (فَنُشِرَتْ لِيَ الْأَنْبِيَاءُ) گوتمان: پێغەمبەرەکانم بۆ کۆ کرانەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿الأَنْبِيَاءُ أَحْيَاءٌ فِي قُبُورِهِمْ يُصَلُّونَ﴾حديث صحيح رواه أبويعلى، پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام-زیندوونە لە گۆڕەکانیاندا نوێژ دەکەن.

ئینجا لەوانەیە لێرەدا کەسانێك بپرسن: خۆ پێغەمبەرەکان-عليهم الصلاة والسلام-شوێنیان لە ئاسمانەکانە–هەروەك لە حەدیسی (صحیح)دا هاتووە–ئەی بۆچی لە (الْمَسْجِدِ الأَقْصَى)دا کۆ کرانەوە؟

**وەلام:** کۆکردنەوەی پێغەمبەرەکان-عليهم الصلاة والسلام- لە (الْمَسْجِدالأَقْصَى)دا بۆ ڕێزلێنانو پێشوازی لە پێغەمبەرﷺ بوو، ئینجا لە ئاسمانەکانیش پێغەمبەرﷺ بەلای هەندێکیان ڕابرد و سەلامی لێکردن، هەروەك ئیمامی(الْبُوصيري) دەفەرموێ:

**(وَأَنْتَ)** تۆ–ئەی پێغەمبەرﷺ–لە دوای پێشنوێژی بۆکردنیان **(تَخْتَرِقُ)** دەتبڕی **(السَّبْعَ الطِّبَاقَ)** هەر حەفت ئاسمانەکانی بەسەریەکتردا **(بِهِمْ)** لەو حاڵەتەی بە لای پێغەمبەرەکاندا-عليهم الصلاة والسلام- ڕادەبردی بۆ سەرەوەی ئاسمانەکان=ئەو شوێنەی خوا بۆی بڕیار دابووی.

واتە: ﴿پێغەمبەرﷺ لە ئاسمانی یەکەمدا باب (آدَم)یﷺ دیت، لە ئاسمانی دووەمدا حەزرەتی (یَحْیَی) پێغەمبەر و حەزرەتی (عِیسی) پێغەمبەری-صلى الله وسلم عليهما- دیتن، لە ئاسمانی سێیەمدا حەزرەتی (یُوسُف) پێغەمبەریﷺ دیتو لە ئاسمانی چوارەمدا حەزرەتی (إِدْرِیس) پێغەمبەریﷺ دیتو لە ئاسمانی پێنجەمدا حەزرەتی (هارُون) پێغەمبەریﷺ دیتو لە ئاسمانی شەشەمدا حەزرەتی (مُوسی) پێغەمبەریﷺ دیتو لە ئاسمانی حەفتەمدا حەزرەتی (إِبْراهِیم) پێغەمبەریﷺ دیت﴾.(البخاری)و (مسلم) گێڕاویەتیانەوە.

**(فِي مَوْكِبٍ)** لە حاڵەتی سەرکەوتندا لە کۆمەڵێکی شکۆداردا بووی کە کۆمەڵی (مَلَائِكَة) بوو **(كُنْتَ فِيهِ)** لەو کۆمەڵەشدا تۆ–ئەی پێغەمبەرﷺ– بویە **(صَاحِبَ الْعَلَمِ)** سەرقافڵەو خاوەنی ئاڵای ئەو کۆمەڵە.

واتە: هەر تۆ–ئەی پێغەمبەرﷺ–میوانە ڕێزدارەکەی ئەو میواندارییە بوی‌و

هەر تۆ مەبەستو ئامـاژە بـۆکراو بـوی، لـەو کاتـەی لـە هـەر ئاسمانێکـدا حـەزرەتی (جُبْرائِيل)ﷺ داوای دەکـرد دەرگـەی ئاسمـانی بـۆ بکرێتـەوەو نـاوی تـۆی دەهێنـا، یەکسەر دەرگـەیان دەکـردەوەو بـەخێرهاتنیان دەکـردی، هـەروەك لـە حەدیسـەکەی (الإسْراء وَالْمعْـراج)دا پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ﴿...فَانْطَلَقْتُ مَع جبْريل حَتَّى أَتَيْنَـا السَّمَاء الدُّنْيا، قِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: جبْرِيلُ. قِيلَ: مَنْ مَعكَ؟ قَالَ: مُحمَّدٌ. قِيـلَ: وَقَـدْ أُرْسلَ إلَيْه؟ قَالَ: نَعمْ. قِيلَ: مرْحَبًا به ولَنعْم الْمَجيءُ جَاءَ...﴾ الحديث، رواه البخاري ومسلم، جا لـەگەڵ حەزرەتی (جُبْرائِيـل)ﷺ بۆ ئاسمان سەرکەوتین تا گەیشتینە ئاسمـانی یەکـەم، جا حەزرەتی (جُبْرائِيل)ﷺ داوای کرد دەرگەی ئاسمانەکەیان بۆ بکرێتەوە، (مَلائِكَـة) فەرموویان: ئەوە کێیە؟ حەزرەتی (جُبْرائِيل)ﷺ فەرمووی: من (جُبْرائِيل)م. (مَلائِكَـة) فـەرموویان: کـێ لـەگەڵتدایـە؟ حـەزرەتی (جُبْرائِيـل)ﷺ فـەرمووی: (مُحَمَّـد)مﷺ لەگەڵدایە. (مَلائِكَـة) فەرموویان: لە لایەن خواوە داوا کراوە بێتـە ئاسمـان؟ حـەزرەتی (جُبْرائِيل)ﷺ فەرمووی: بەڵێ. (مَلائِكَة) فەرموویان: مەرحەبای لێبێ، باشـترین هـاتن هاتنی ئەوە...

ئینجا لە هەر ئاسمانێکدا وەك ئاسمانی یەکەم حەزرەتی (جُبْرائِيل)ﷺ داوای دەکرد دەرگەی ئاسمانەکە بکەنەوە، (مَلائِكَة)ش هەمان پرسیارەکانیان دەکردنو دەرگـەیان دەکردەوە.

ئینجا لەوانەیە کەسێك وا تێبگا: حەزرەتی (جُبْرائِيل)ﷺ هەر لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بووە تـا (قـابَ قَوسَـيْن). جـا ئیمـامی (الْبُوصـيرِي) ئـەو تێگەیشـتنە ڕەد دەکاتـەوەو دەفەرموێ:

(حَتَّى) ئەی پێغەمبەرﷺ بە ئەندازەیـەکی وەهـا تـۆ لـە ئاسمانـەکان تێپـەڕیی، تـا (إذا) گەیشتیە شوێنێکی وەها (لَمْ تَدَعْ) نەتهێشتەوە (شَأْواً) کۆتایی هـیچ بلنـدایێك (لِمُسْتَبِقٍ) بۆ ئەو کەسەی بیەوێ پێشبڕکێ بکا (مِنَ الدُّنُوِّ) لە نزیکی، چونکە تـەنها تۆ-ئەی پێغەمبەرﷺ-لە (سِدْرَةَالْمُنْتَهَى) تێپەڕیی، هیچ (مَلائكَة)و هیچ پێغەمبەرێك لەوێ تێنەپەڕیوە.

(وَ) هەروەها (لامَرْقىً) هـیچ پلەیـەکی بـەرزیت نەهێشـتەوە (لِمُسْتَنِمِ) بـۆ هـیچ پلـە بەرزێك: کە حەزرەتی (جُبْرائِيل)و فریشتەکانیتـری پایـە بـەرزن، چـونکە حـەزرەتی

(جُبْرائيل) لە (سدْرَةالْمُنْتَهى) لە پێغەمبەرﷺ جیا بۆوەو گوتی: ناتوانم لێرەوە بەرەو پێشتر بڕۆم ﴿وَما مِنَّا إِلاّ لَهُ مَقامٌ مَّعْلُومٌ﴾الصافات:١٦٤، هەر (مَلائِكَة)یەك لە ئێمە شوێنێكی زاندراوی هەیە.

واتە: لە ترسی خوا ناوێرن بەولاوەتر بڕۆن، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿مَرَرْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي بِالْمَلإِ الْأَعْلَى، وَجِبْرِيلُ كَالْحِلْسِ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ﴾رواه الطبراني في الاوسط بسند صحيح، لەو شەوەی شەورۆیم پێكرا، بە لای (مَلائِكَة)كانی پایە بەرزدا ڕابردم، لەو حاڵەتەدا (جُبْرائِيل) وەك جلێكی شڕیكۆن بوو لە ترسی خوا.

ئینجا كە ئیمامی (البُوصيري) لە(بَيْت)ی ڕابردوودا فەرمووی: هیچ پلەیەكی بەرزت نەهێشتەوە بۆ هیچ پلەبەرزێك. ئەم جارە ئەوەمان بۆ باس دەكا: كە پلەی پێغەمبەرﷺ -هەروەك لە پلەی (مَلائكَة) بەسەرەوەترە- لە پلەی پێغەمبەرەكانیش -عليهم الصلاة والسلام- بەسەرەوەترەو دەفەرموێ:

(**خَفَضْتَ**) ئەی پێغەمبەرﷺ لە شەوی (مِعْراج)دا لە پلەی خۆت نزمترت كرد (**كُلَّ مَقامٍ**) هەموو پلەیەكی پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام-، واتە: پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام- هەرچەند لە پێغەمبەرایەتی‌دا یەكسانن‌و هەموویان پلە بەرز و پایەدارن، بەلام (**بِالْإِضافَة**) بە نیسبەت پلەی پێغەمبەرﷺ، هەموویان لە ژێر پلەی پێغەمبەرنﷺ، جا ئەو ڕێزلێنانەش بە بڕیاری خوای گەورەیە، كە دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ البقرة:٢٥٣، ئەو پێغەمبەرانە هەندێكمان لە هەندێكیان گەورەتركردوە لە پلەو پایەدا.

(**إِذْ**) ئەی پێغەمبەرﷺ بۆیێ پلەو پایەت بەرزترە، چونكە (**نُودِيتَ**) لە لایەن خواوە بانگ كرای (**بِالرَّفْعِ**) بە پایە بەرزی تا بەرز بكرێیەوە بۆ ئاسمانەكان، یان واتە: خوای گەورە بە پلەیەكی بەرزی پێغەمبەرایەتی بانگی كردویو دەفەرموێ: ﴿يا أَيُّهاالنَّبِيُّ﴾و ﴿يا أَيُّهاالرَّسُولُ﴾ هۆ پێغەمبەر.

واتە: لەو حاڵەتەی خوای گەورە بانگت دەكا، وەك پێغەمبەرەكانی‌تر عليهم الصلاة والسلام- ناوت ناهێنی‌و نافەرموێ: (يا مُحَمَّد) هۆ مُحَمَّد. بەلام پێغەمبەرەكانی‌تر عليهم الصلاة والسلام- بە ناوی خۆیان بانگیان دەكا و دەفەرموێ: (يا نُوح)، (يا إبراهيم)، (يا مُوسى)، (يا عيسى)...هتد، ئەمەش نیشانەیەكی‌ترە كە پێغەمبەرﷺ لە هەموویان گەورەترە، هەروەك ئیمامی (البيهقي) لە (شُعب الإيمان)دا ڕوونی كردۆتەوە.

هەر بۆیێ خوای گەورە قەدەغەی کردوە: جگە لە ناوی پێغەمبەر، بە ناوێکیتر بانگی پێغەمبەرﷺ بکەین، یان ناوی بهێنین، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُمْ بَعْضًا﴾النور:٦٣، وا مەکەن: بانگی پێغەمبەرﷺ بکەن لە نێوان خۆتاندا بە ناوی خۆی، وەك هەندێکتان بانگی هەندێکتان دەکەن. واتە: بە پێغەمبەر ناوی بهێننو بانگی بکەن.

جا لەبارەی بانگکردنی پێغەمبەرﷺ ئیمامی (الْبُوصِيرِي) وێچواندنێکی (نَحْوِي) دەکاو دەفەرموێ: بانگکردنەکەت ئەی پێغەمبەرﷺ (مِثْلَ الْمُفْرَدِ الْعَلَمِ) وەك بانگکردنی (مُنادَى)ی (مُفْرَد)ی (مَعْرِفَة)یە.

واتە: هەروەك لە زانستی (نَحْو)دا ئەو جۆرە (مُنادَى)یە (مَبْنِي)یە لە سەر (ضَمَّة)، واتە: لە سەر ئەو نیشانەیەی پێی (مَرْفُوع) دەبێو بۆری دەدرێتێو دەگوترێ: (يا مُحَمَّدُ). ئەوهاش هەر یەك لە (النَّبِيُّ)و (الرَّسُولُ) بووەتە (مُنادَى)یەکی (مُعْرَب)و بۆری دراوەتێو (مَرْفُوع) بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی (مُعْرَب) لە (مَبْنِي) ڕەسەنترو بالاترە، ئەوهاش بانگکردن بە (النَّبِيُّ)و (الرَّسُولُ) –کە (مُنادَى)یەکی (مُعْرَب)ن– ڕێزدارترە لە (يا مُحَمَّدُ)، کە (مُنادَى)یەکی (مَبْنِي)یە، وَاللهُ أعْلَم.

ئینجا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) باسی ئەو ڕێزداریانە دەکا: کە پێغەمبەرﷺ لە (مِعْراج)دا وەدەستی هێناونو دەفەرموێ:

(كَيْما تَفُوزَ) ئەی پێغەمبەرﷺ ئەو سەرکەوتنەت بۆ سەرەوەی ئاسمانەکان بۆ ئەوە بوو: تاکو وەدەست بێنی (بِوَصْلٍ) بەیەکگەیشتنێك (أيِّ مُسْتَتِرٍ) ئەو بەیەکگەیشتنە تەواو داپۆشراو بوو (عَنِ الْعُيُونِ) لە چاوی هەموو خەڵك، مەبەست دیتنی خوای گەورەیە.

واتە: لە دونیادا هیچ کەسێك خوای گەورەی نەدیتووە، بەڵام بە فەرموودەی بەهێز لە لای زۆربەی زانایان لە شەوی (مِعْراج)دا پێغەمبەرﷺ بە هەردوو چاوی خۆی خوای گەورەی دیتووە، هەروەك ئیمامی (النَّوَاوِي) لە (شرح صحيح مسلم)دا فەرموویەتی، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما- أتَعْجَبُونَ أنْ تَكُونَ الْخُلَّةُ لإبْرَاهِيمَ وَالْكَلامُ لِمُوسَى وَالرُّؤْيَةُ لِمُحَمَّدٍﷺ؟﴾ أخرجه النسائي والحاكم بإسناد صحيح، ئایا پێتان سەیرە دۆستایەتی خوا بۆ (إبْراهِيم) پێغەمبەر بێﷺ، قسەکردنی خوا بۆ (مُوسَى) پێغەمبەر بێﷺ، دیتنی خوا بۆ (مُحَمَّد) بێﷺ؟.

(وَ) هەروەها سەرکەوتنەکەت بۆ ئەوە بوو: کە وەدەست بێنی (سِرٍّ) نهێنــیـەك (أيْ مُكْتَتَمٍ) ئەو نهێنــیـە تـەواو شـاراوەو پـەنهان بـوو لـە هـەموو خـەڵك، خـوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى﴾النجم:١٠، لە شەوی (مِعْراج)دا خوای گـەورە (وَحْي)ی نارد بۆ بەندەی خۆی-مُحَمَّدﷺ-، ئەو (وَحْي)یەی ناردی.

واتە: نهێنی ی ئەو (وَحْي)یە بۆ هیچ کەسێك ڕوون نەکراوەتەوە، چونکە لە حەدیسـەکەی (مِعْراج)دا پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: ﴿...فَأَوْحَى إِلَيَّ مَا شَاءَ أَنْ يُوحِيَ﴾ رواه الطبراني في الأوسط بسند صحيح، جا خوای گەورە (وَحْي)ی بـۆ نـاردم ئـەو (وَحْـي)یـەی بـەخۆی حەزی کرد بینێرێ.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لـە (بَيْـت)ی ڕابـردوودا باسـی کـرد: ئـەو نهێنــیـەی لـە شەوی (مِعْراج)دا لە نێوان خواو پێغەمبـەرداﷺ هـەبوو، هـیچ کەسـێك نـایزانێ. ئـەم جارە باسی بەرهەمەکانی شەوی (مِعْراج) دەکـا: کـە دەسـت ئوممـەتی پێغەمبـەرﷺ کەوتونو دەفەرموێ:

(فَحُزْتَ) ئەی پێغەمبەرﷺ لـە شـەوی (مِعْـراج)دا کـۆت کـردەوە (كُلَّ فَخارٍ) گشت شانازی‌یەك (غَيْرَ مُشْتَرَكٍ) هیچ کەسێك لەو شانازیانەدا هاوبەشـی تـۆ نـەبو، چـونکە تایبەت بە تۆ بون.

جا ئەو شانازیانەش: دیتنی خوای گەورەو ئەم سێ خەڵاتانەن: ﴿عَــنْ عَبْــدِاللهِ‌رضي الله عنه: ...فَأُعْطِيَ رَسُولُ اللهِﷺ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ، وَخَوَاتِيمَ الْبَقَرَةِ، وَغُفِرَ لِمَنْ لَمْ يُشْرِكْ بِاللهِ مِنْ أُمَّتِهِ شَيْئاً الْمُقْحِمَاتِ﴾رواه مسلم، لە شـەوی (مِعْـراج)دا پێغەمبـەرﷺ سـێ خـەڵاتی درانێ: پێنج نوێژەکان، ئایەتی ﴿آمَنَ الرَّسُولُ﴾ تا کۆتـایی سـورەتی (الْبَقَـرة)، خـوای گەورە بڕیاری دا-جگە لە کافربوون- لـە گوناهە گەورەکانی ئۆممەتی خۆش بـێو بـە یەکجاری لە دۆزەخدا نەمێنێتەوە.

(وَجُزْتَ) ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ ڕابردیو تێپەڕ بووی (كُلَّ مَقامٍ)لە گشت شوێنێكو لە گشت پلەیەك (غَيْرَ مُزْدَحَمٍ) هیچ کەسێك لەو شوێنەدا پاڵەپەستەی نەکردی.

واتە: لەو کاتـەی لـە (سِدْرَةُالْمُنْتَهى) تێپـەڕی‌ی، هـیچ خـەڵکێك هاوڕێیـەتی نـەکردی، هەروەك باسمان کرد.

جـا لـە بەرئـەوەی ئـەو پلەوپایـەی پێغەمبـەرﷺ لـە شـەوی (مِعْـراج)دا وەدەسـتی

وَجَــلَّ مِقْدارُ مَا وُلِّيتَ مِنْ رُتَبٍ (١١٥) وَعَزَّ إِدْراكُ مَا أُولِيتَ مِنْ نِعَــمٍ
بُشْرَى لَنَا مَعْشَرَ الْإِسْــلامِ إِنَّ لَنَا (١١٦) مِنَ الْعِنايَةِ رُكْناً غَــيْرَ مُنْهَــدِمٍ

هێناوە، نایەتە باس کردن، ئیمامی (البُوصِيرِي) بێتوانایی خۆی ئاشکرا دەکا و دەفەرموێ:

(وَجَلَّ) ئەوەندە گەورەیە، باسی ناکرێ (مِقْدارُ) ئەندازەی (مَا وُلِّيتَ) ئەوەی دراوەتە بەر دەستت (مِنْ رُتَبٍ) لە پلەو پایە بەرزەکان (وَعَزَّ) قەدەغەیەو ناگونجێ بۆ هیچ کەسێك (إِدْراكُ) گەیشتن و وەدەستهێنانی (مَا أُولِيتَ) ئەوەی دراوەتە تۆ لە لایەن خواوە (مِنْ نِعَمٍ) لە نیعمەت و چاکەکان.

واتە: نیعمەتەکانی خوا لەگەڵ پێغەمبەرﷺ ئەوەندە زۆر و گەورەنە: مەحاڵە هیچ کەسێك بیانگاتێ و وەدەستیان بێنێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلَ اللهُ عَلَيْــكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ اللهِ عَلَيْكَ عَظِيمًــا﴾النساء:١١٣، ئەی پێغەمبەرﷺ خوای گەورە بۆ تۆی ناردۆتە خوارەوە ئەم قورئانەو قسەی لەجێ- کە فەرموودەکانی جگە لە قورئانن- خوای گەورە تۆی فێرە زانستێکی وەها کردوە: کە پێشتر نەتدەزانی، نیعمەت و چاکەی خوا لەگەڵ تۆ زۆر گەورەیە. واتە: نیعمەتێك خوا بە گەورە ناوی بێنێ، چۆن بەندەی بێهێز دەتوانێ باسی بکا؟!.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصِيرِي) باسی ئەوەی کرد: بەرهەمەکانی (مِعْراج) سودی بۆ ئۆممەتی ئیسلام هەیە: ئەم جارە مژدەمان دەداتێ: ئەو بەرهەم و ڕێزداریانەی وەدەست ئۆممەتی ئیسلام کەوتون، بەردەوامن و (نَسْخ) نابنەوەو ناگۆڕێن، هەروەك دەفەرموێ:

(بُشْرَى لَنَا) مژدەیەکی زۆر خۆش بۆ ئێمەیە (مَعْشَرَ الْإِسْلامِ) هۆ گەلی ئیسلام، مژدەکەش ئەمەیە: (إِنَّ لَنَا) بە تایبەتی بۆ ئێمەی موسوڵمان هەیە -(مِنَ الْعِنايَةِ) بە هۆی بایەخ پێدانی خوا بە ئێمە- (رُكْناً) پاڵپشتی و شەریعەتێکی وەها: کە (غَيْرَ مُنْهَدِمٍ) ئەو پاڵپشتیە ناڕوخێ و ناگۆڕێ.

*- لە ناو لێناندا خوای گەورە پاڵپشتی کردوین و بایەخی پێداوین و دەفەرموێ: ﴿هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِنْ قَبْلُ وَفِي هذَا﴾ الحج:٧٨، خوا ناوی لە ئێوە ناوە موسوڵمان لە پێش هاتنی قورئان، وە لە قورئانیشدا ناوی ناون موسوڵمان.

*- هەم لە شەریعەتیشدا خوای گەورە پاڵپشتی کردوین و بایەخی پێداوین و

دەفەرموێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْـــلاَمَ دِيناً﴾ المائدة: ٣، ئەمڕۆ شەریعەتی‌ئیسلامم بۆ ئێوە تـەواو کـرد و نیعمـەتی‌خۆم بـە سـەر ئێوەدا تەواو کرد، ڕازی بوم ئیسلام ئایینی ئێوە بێ.

کەواتە: ئەگـەر خـوا بـە شتێك ڕازی بـێ، لـە ڕازی‌بـوونی خـۆی پەشیمان نابێتـەوە.

هەروەها تایبەتیەکی‌تریش ئەمەیە: خـوای گـەورە ئێمـەی کردۆتـە چاکترینی هـەموو ئوممەتەکان، هەروەك ئیمامی (الْبُوصِيرِي) دەفەرموێ:

(**لَمَّا**) لە بەرئـەوەی (**دَعَا الله**) خـوای گـەورە نـاوی نـاوە (**داعِينَا**) لـە پێغەمبـەری ئێمەﷺ-(**لِطاعَتِهِ**) کە بانگمان ئەکا بۆ عیبادەتو پەرستنی خوا- (**بِأَكْرَمِ الرُّسْلِ**) بە ڕێزدارترینی پێغەمبەران-عليهم الصلاة والسلام- ناوی هێناوە، کـە خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ أَكْـــرَمَكُمْ عِنْـــدَ اللهِ أَتْقَـــاكُمْ﴾الحجرات:١٣، ڕێزدارترتـان لـە لای خـوا، لـەخوا ترسترەکانتانن.

واتە: بێ‌گومان: پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام- لە هەموو کەسێك لەخواترسترن، پێغەمبەری ئێمـەش‌ﷺ لـەو لەخواترسـانەدا پێشـەوای هەموویانـە، کـەوابوو: لـە هـەمووانیان ڕێزدارترە، هەروەك پێغەمبەرﷺ بەخۆی فەرموویـەتی:﴿أَنَا قَائِدُ الْمُرْسَلِينَ وَلا فَخْرَ﴾ حديث حسن رواه الدارمي بسند موثوق، من پێشەوای پێغەمبەرانم، هیچ شانازیەکم مەبەست نیـە.

واتە: بەڵام بۆ زانینی ئێوە وا دەڵێم.

جا کە پێغەمبەری ئێمەﷺ ئەو ڕێزدارە بـێ، بێگومـان: (**كُنَّا**) ئێمـەش بوینـە (**أَكْرَمَ الْأُمَمِ**) ڕێزدارترینی ئوممەتان، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿كُنْتُمْ خَيْـــرَ أُمَّـــةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾آل عمران:١١٠، ئێوە- ئەی ئوممەتی (مُحَمَّد)ﷺ- چاکترین ئوممەتن کە بـۆ بەرژەوەندی خەڵك ئاشکرا کرابێ.

## ﴿ اَلْـفَـصْلُ الـثَّـامِـنْ: فِى جِـهـادِ الـنَّـبِـيِّﷺ ﴾

### ﴿ بەشی هەشتەم: لە باسی غەزای پێغەمبەرﷺ لە دژی کافرەکان ﴾

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) باسی کرد: پێغەمبەرﷺ لە سەرکەوتنی ئاسمانەکانـدا پلەی هەرە بەرزی وەدەست هێناوە. ئەم جارە باسی ئەوەمان بۆ دەکا: کە لـە سـەر زەمینـیش پێغەمبـەرﷺ لـە غەزایـەکانی‌دا سـەرکەوتنی وەدەسـت هێنـاوە بـە سـەر دوژمنانی ئیسلامدا، جا دەفەرموێ:

راعَتْ قُلُوبَ الْعِدَى أَنْبَاءُ بِعْثَتِه (١١٨) كَنَبْأَةٍ أَجْفَلَتْ غُفْلاً مِّنَ الْغَنَمِ
مَازَالَ يَلْقَاهُمُ فِي كُلِّ مُعْتَرَكٍ (١١٩) حَتَّى حَكَوْا بِالْقَنَا لَحْماً عَلَى وَضَمِ

---

(راعَتْ) ترساندی (قُلُوبَ الْعِدَى) دڵی دوژمنەکانی ئیسلام (أَنْبَاءُ بِعْثَتِه) هەواڵەکانی بوونی بە پێغەمبەرﷺ.

واتە: بڵاوبوونەوەی هەواڵی بوونی بە پێغەمبەرﷺ، دوژمنانی ئیسلامی ترساند، جا ئەو ترسەش یەکێکە لە تایبەتیەکانی پێغەمبەرﷺ کە فەرموویەتی: ﴿أُعْطِيتُ خَمْساً لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ...﴾الحديث رواه البخاري ومسلم، پێنج شتی تایبەتیم دراونێ، کە نەدراوەنە هیچ پێغەمبەرێکی پێش خۆم: سەرکەوتنم دراوەتێ بەوەی دوژمن لێم دەترسێ لە ئەندازەی دوری یەك مانگ.

جا ئەو ترسانەی دوژمنیش (كَنَبْأَةٍ) وەك نەڕەی شێر (أَجْفَلَتْ) ترساندبێتی‌و ڕەواندبێتیەوە (غُفْلاً) کۆمەڵێکی بێ‌ئاگا و گێلێ (مِنَ الْغَنَمِ) لە بزن‌و مەڕەکان.

واتە: هەروەك بزن‌و مەڕ لە دەنگی شێر دەڕەونەوەو هەڵدێن، ئەوهاش کافرەکانی گێل وازیان لە گوێڕایەڵی قورئان دەهێنا و لە پێغەمبەرﷺ دەڕەوینەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ * كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُسْتَنْفِرَةٌ * فَرَّتْ مِنْ قَسْوَرَةٍ﴾المدثر:٤٩-٥١، لە بەرچی کافرەکان واز لە قورئان دێنن‌و گوێی لێڕاناگرن، وەك بڵێی ئەوان کەرەکانی کێوین لە ترسی شێر ڕەوینەوەو هەڵاتون.

ئینجا کە کافرەکان سودیان لە قورئان وەرنەگرت‌و بانگەوازیەکەی پێغەمبەریانﷺ قبوڵ نەکرد، بەوەش نەوەستان، بەڵکو پێغەمبەروﷺ موسوڵمانەکانیان لە (مَكَّة)ی پیرۆز دەرکردنە دەرەوەو موڵك‌وماڵیشیان لێ‌داگیر کردن، بۆیێ ئەم جارە بە فەرمانی خوا: پێغەمبەرﷺ شمشێری لە کافرەکان بەکار هێنا و دەستی بە غەزا کرد لە دژی ئەوان، هەروەك ئیمامی (البُوصِيرِي) دەفەرموێ:

(مَازَالَ) بەردەوام (يَلْقَاهُمْ) پێغەمبەرﷺ لەگەڵ (صَحابَة)کانیﷺ بەرەنگاری کافرەکان دەبۆوەو جەنگی لەگەڵ دەکردن (فِي كُلِّ مُعْتَرَكٍ) لە گشت ئەو شوێنانەی دەبونە مەیدانی جەنگ.

واتە: هیچ کاتێك پێغەمبەرﷺ لە جەنگی کافرەکان نەترساوە، بەڵکو بەخودی خۆی لە (٢٧) غەزادا بەشداریی کردوەو بە (إِجْماع)ی موسوڵمانان: ئەگەر موسوڵمانەکانیش لە جەنگدا شکابن، پێغەمبەرﷺ بەخۆی نەبەزیوەو لە جەنگدا هەڵنەهاتووە، بەڵکو

هەر لە مەیدانی جەنگدا ماوەتەوەو بەرەو پێش هەڵمەتی بردوە. ئیمام (عَلي)ﷺ فەرمویەتی: ﴿كُنّا إذا حَمِيَ الْبَأْسُ وَلَقِيَ الْقَوْمُ الْقَوْمَ إتَّقَيْنا بِرَسُولِ اللهﷺ فَلاَ يَكُونُ أَحَدٌ مِنَّا أَدْنَى إلَى الْعَدُوِّ مِنْهُﷺ﴾ حديث صحيح رواه النسائي والحاكم، لەو کاتەی جەنگ گەرم دەبوو و کافر و موسوڵمان دەگەیشتنە یەکتری، ئێمە خۆمان بە پێغەمبەرﷺ دەپاراست، هیچ کەسێك لە ئێمە بۆ لای دوژمن نزیکتر نەبو لە پێغەمبەرﷺ.

جا پێغەمبەرﷺ بەردەوام جەنگی لەگەڵ کافرەکان دەکرد (حَتَّى) تا (حَكَوْا) کافرەکانی کوژراو وێدەچون (بِالْقَنَا) بە هۆی لێدانی رمی (صَحابَة)کانﷺ (لَحْماً) وەك گۆشتی پارچەکراو بون (عَلَى وَضَمٍ) لە سەر تەپلەی گۆشتفرۆش.

واتە: لاشەکانی کافرەکان بە پارچەکراوی لە مەیدانی جەنگدا بەجێ دەهێشتران، چونکە کافرەکان دەبەزین‌و کوژراوەکانی خۆیان نەدەناشت.

ئینجا ئیمامی (البُوصِيرِي) باسی ترسنۆکی کافرەکان دەکا و دەفەرموێ:

(وَدُّوا) کافرەکان دەیانخواست‌و پێیان خۆش بوو (الْفِرارَ) هەڵبێن‌و نەیەنە مەیدانی جەنگ، بەڵام هەلاتنیشیان دەست نەکەوت، بۆیێ (فَكادُوا) نزیك بوو کافرەکان لە ترسی پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)کانﷺ (يَغْبِطُونَ) خۆزگە بکەن‌و بخوازن -(بِهِ) بە هۆی ئەو هەلاتنە-(أَشْلاءَ) وەك ئەو پارچە گۆشتانە بن: کە (شالَتْ) بەرز دەبنەوە (مَعَ الْعِقْبانِ) لەگەڵ هەڵۆیەکان‌و هەم (وَالرَّخَمِ) لەگەڵ داڵەشەکان.

واتە: هەندێ جار کافرەکان نەیاندەتوانی لە مەیدانی‌جەنگ ڕابکەن، بۆیێ دەیانخواست وەك ئەو پارچە گۆشتانەیان لێهاتبا: کە هەڵۆ و داڵەش بە هەوادا بەرزیان دەکەنەوە، نەوەك بکەونە بەر شمشێر و ڕمی (صَحابَة)کانﷺ.

ئیمام(ابن اسحاق) لە غەزای (بَدْر) دەگێڕێتەوە: کە (عُمَيْر بن وَهْب) هاتو (صَحابَة)کانیﷺ بەسەر کردنەوەو گەڕاوە، گوتی:(يا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ اَلْبَلايا تَحْمِلُ الْمَنايا) وشترەکانی (مَدِينَة) مردنیان هەڵگرتووە...ئینجا (عُتْبَة)ش گوتی: (فَارْجِعُوا وَخَلُّوا بَيْنَ مُحَمَّدٍﷺ وَبَيْنَ سائِرِ الْعَرَبِ) کەوابوو: ئەم جەنگە مەکەن‌و بگەڕێنەوەو واز لە (مُحَمَّد)ﷺو عەرەکان بێنن.

جگە لەمەش: (أُمَيَّة)لعنه الله، لە گەرمەی جەنگدا بەخۆی تکای لە حەزرەتی (عَبْدالرَّحمن بن عَوْف)ﷺ کرد: تاکو بە دیل بیگرێ؟ نەوەك بە دەستی (صَحابَة)کانﷺ بکوژرێ،

بەڵام لە ئەنجامدا بە دەستی حەزرەتی (بِلال)و (صَحابَة)كانی‌تر‌رضي الله عنهم -هەر- كوژرا، هەروەك لە (البداية والنهاية)دا گێڕدراوەتەوە.

ئینجا كە لە(بَیْت)ی‌ڕابردوودا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) فەرمووی: كافرەكان لە جەنگدا خۆزگەی هەڵاتنیان دەكرد لە ترسی پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)كان‌رضي الله عنهم. ئەم جارە باسی ئەوەمان بۆ دەكا: كافرەكان لە ماڵەوەش لە ترسی پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)كان‌رضي الله عنهم شەو و ڕۆژیان لێ دەشێوا، هەروەك دەفەرمویێ:

(**تَمْضِي اللَّيَالِي**) شەوەكان‌و ڕۆژەكان دەڕۆیشتن (**وَلا يَدْرُون عِدَّتَها**) كافرەكان نەیاندەزانی ژمارەیان چەندە، چونكە لە ترسی پێغەمبەرﷺ (صَحابَة)كان‌رضي الله عنهم نە بە شەوی‌و نە بە ڕۆژیێ كافرەكان دڵنیا نەبون‌و بەردەوام بیریان لە هێرشی پێغەمبەرﷺ دەكردەوە (**مالَمْ تَكُنْ**) تا ئەو كاتەی ئەو شەوانە، نەدەبونە (**مِنْ لَيَالِي الْأَشْهُرِ الْحُرُمِ**) شەوەكانی (الْأَشْهُرِالْحُرُمِ)= چوار مانگەكەی حەڕام‌و ڕێزدار: كە (ذوالْقَعْدَة)و (ذُو الْحِجَّة)و (مُحَرَّم)و (رَجَب)ن.

واتە: لەو چوار مانگانەدا كافرەكان دڵنیا دەبون‌و هەستیان بە جیاوازی شەو و ڕۆژ دەكرد، چونكە لە سەرەتادا غەزاكردن لەو چوار مانگانەدا حەڕام بوو، هەروەك خوای گەورە دەفەرمویێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ﴾ البقرة:٢١٧، ئەی پێغەمبەرﷺ لەبارەی جەنگ لە (اَلشَّهْرُالْحَرام)دا پرسیارت لێ‌دەكەن؟ بڵێ: جەنگ لە (اَلشَّهْرُالْحَرام)دا گوناهێكی گەورەیە.

ئینجا لەمەودوا لەو چوار مانگانەشدا غەزا حەڵاڵ كرا، بەڵكو واجبیش كرا و تا دونیا وێران دەبێ واجبیەكەی غەزا هەر بەردەوامە، خوای گەورە دەفەرمویێ: ﴿فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ﴾التوبة:٥، هەر كاتێك (اَلأَشْهُرُالْحُرُم) تەواو بون، ئێوە كافرەكان بكوژن لە هەر كات‌و شوێنێكدا دەیانگەنێ، بیانگرن‌و گەمارۆیان بدەن‌و لە هەموو ڕێگایەك بۆیان لە بۆسە دانیشن.

ئینجا لەوانەیە كەسێك بڵێ: ئەوە زانیمان خوای گەورە فەرمانی كردوە: غەزا بكرێ، زانیمان دوژمنانی ئیسلام لە ترسی غەزا تۆقیون، بەڵام پێم بڵێ: سود و مەبەستی غەزا چیە؟ جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) وەڵام دەداتەوە: ئایینی ئیسلام وەك میوانێ

ڕێزدار دابەزیوەو داواكاریشی هەیە، واجبە: خاوەن ماڵ داواكاریەكەی جێبەجێ بكا و بەرگریی لێبكا و میوانداریشی بكا. جا (صَحابَة)كانیش ﷺ بە بێ‌گەردی میوانداری ئەو ئیسلامەیان كرد، هەروەك دەفەرموێ:

**(كَأَنَّما الدِّينُ)** وەك بڵێی: ئایینی ئیسلام **(ضَيْفٌ)** میوانێكە **(حَلَّ ساحَتَهُمْ)** دابەزیوەتە گۆڕەپانی ماڵی (صَحابَة)كان ﷺ **(بِكُلِّ قَرْمٍ)** لەگەڵ گشت جوامێرێكی ئازاو نەترس، جا ئەو میوانەش **(إِلَى لَحْمِ الْعِدا)** بۆ گۆشتی دوژمنانی ئیسلام **(قَرِمٍ)** تامەزرۆیەو حەزی لێیە.

واتە: ئایینی ئیسلام لە (مَكَّة)ی پیرۆزەوە هاتە (مَدِينَة)ی پیرۆز و بە هاوڕێیەتی پێغەمبەر ﷺ و (صَحابَة) ئازاو نەترسەكان ﷺ، جا عادەت ئەوهایە: خاوەن ماڵ لە میوان دەپرسێ: حەزت لە چییە بۆت ئامادە بكەین؟

جا ئەم میوانەش وەڵام دەداتەوە: من تامەزرۆی پارچە پارچەكردنی گۆشتی دوژمنانی ئیسلامم، تاكو بتوانم دادپەروەریی خوا لە سەر زەمینی خوا بچەسپێنم و ستەم نەهێڵم، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمْ لا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيّاً وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيراً﴾النساء:٧٥، ئەی ئیمانداران بۆچی ئێوە جەنگ ناكەن لە ڕێگای خوا و لە ڕێگای ڕزگاركردنی چەوساوەكان: لە پیاوانو ئافرەتانو منداڵان، كە لە بەردەستی كافرەكاندا هاوار ئەكەنو دەڵێن: خودایە دەربازمان بكە لەو دێیەی دانیشتووەكانی ستەمكارن، خودایە لە لای خۆتەوە سەرپەرشتكارێكمان بۆ دابنێو یارمەتیدەرێكمان بۆ دابنێ تاكو لەم تەنگانەیە ڕزگارمان بكا.

جا كە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە(بَيْت)ی ڕابردوودا فەرمووی: ئەو میوانە ڕێزدارە تامەزرۆی پارچەكردنی گۆشتی دوژمنانی ئیسلامە. ئەم جارە ئەوەمان بۆ باس دەكا: كە میوانەكەش لەگەڵ خاوەن ماڵ میوانداریەكە ئامادە دەكا و بەخودی خۆی لەگەڵ (صَحابَة)كانی دا ﷺ دەڕواتە جەنگی كافرەكان، واتە: نەك وەك سەركردەكانی تر لە ماڵەوە دابنیشێو خەڵكیش بنێرێتە بەرەی جەنگ، هەروەك ئیمامی (الْبُوصِيرِي) دەفەرموێ:

يَجُرُّ بَحْرَ خَمِيسٍ فَوْقَ سابحَةٍ (١٢٣) يَرْمِي بمَوْجٍ مِّنَ الأَبْطالِ مُلْتَطِمِ
مِنْ كُلِّ مُنْتَدِبٍ للَّهِ مُحْتَسِبٍ (١٢٤) يَسْطُو بمُسْتَأْصِلٍ لِلْكُفْرِ مُصْطَلِمِ

(يَجُرُّ) ئەو میوانە ئازاو ڕێزدارە-کە پێغەمبەرە ﷺ- بە دوای خۆیدا دەهێنێتە مەیدانی جەنگ (بَحْرَ خَمِيسٍ) لەشکرێکی ئەوەندە زۆر، کە وەك دەریا شەپۆل دەدا، جا ئەو لەشکرەش (فَوْقَ سابحَةٍ) لە سەر پشتی ئەو ئەسپانەیە: کە وەك مەلەوان بە سەر زەمیندا غار دەدەن (يَرْمِي) ئەو لەشکرە دەهاوێتە لای کافرەکان (بِمَوْجٍ) بە شەپۆلێکی کەرستەی جەنگ (مِنَ الأَبْطالِ) ئەو لێدانو هاویشتنەش لە لای پاڵەوانە ئازاو نەترسەکانەوەیە (مُلْتَطِمٍ) شەپۆلی لێدانەکەش یەك بە دوای یەکتریدا دێن.

جا ئەو سیفەتانەی ئیمامی (الْبُوصِيرِي) باسی کردن لە چەند ئایەتێکی قورئان وەرگیراون، بۆنموونە: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللهِ شَهِيدًا * مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ﴾ الفتح:٢٨و٢٩، خوای گەورە ئەو خوایەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردوە بە ڕێنموونیو ئاینی ڕاست، تاکو بە سەر هەموو ئاینێکدا سەرکەوتووی بکا، خوای گەورەش بەسە لە ڕووی شاهیدیەوە: کە شاهیدی دەدا (مُحَمَّد) پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەوانەی لەگەڵ (مُحَمَّد)ش دان-کە (صَحابَة)کانن ﷺ- لە دژی کافرەکان توندوتیژنو لە نێوان خۆیاندا بە بەزەیین.

ئینجا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) وەسفی پاڵەوانەکانی ئەو لەشکرە زۆرەی پێغەمبەر ﷺ دەکا و دەفەرموێ:

(مِنْ كُلِّ مُنْتَدِبٍ لِلَّهِ) پاڵەوانەکانی لەشکرەکە گشتیان لەو کەسانە بون: کە گوێڕایەڵی بانگەوازی خوا بونو وەڵامی بانگەوازیەکەی خودایان داوە بۆ غەزاکردن (مُحْتَسِبٍ) پاداشتی غەزایەکەیان لە خوا داوا دەکرد، چونکە هەموو کردەوەکانیان بە بێگەردی بۆ خوا بون (يَسْطُو) هەر پاڵەوانێك لەو پاڵەوانانە هەڵمەتی دەبردە سەر دوژمنانی ئیسلام (بِمُسْتَأْصِلٍ لِلْكُفْرِ) بە چەکێکی وەها: کە کوفری لە ڕەگو ڕیشەوە دەردەهێنا و (مُصْطَلِمِ) لە ناوی دەبرد، بە جۆرێکی وەها: هیچ ئاسەوارێکی کوفر نەدەما.

جا ئەوەش ئاماژەیە بۆ (صَحابَة)کانی غەزای (أُحُد) ﷺ: کە بە بریندداری لە

حَتَّى غَدَتْ مِلَّةُ الإِسْلامِ وَهْيَ بِهِمْ (١٢٥) مِنْ بَعْدِ غُرْبَتِها مَوْصُولَةَ الرَّحِمِ

مَكْفُولَةً أَبَداً مِنْهُمْ بِخَيْرِ أَبٍ (١٢٦) وَخَيْرِ بَعْلٍ فَلَمْ تَيْتَمْ وَلَمْ تَئِمِ

---

(حَمْراءالأسد) كافرەکانیان ڕاو نان‌و بەزاندنیان، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ اسْتَجابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِنْ بَعْدِ ما أَصابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ آل عمران: ١٧٢، ئەوانەی گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرﷺ بون بۆ غەزای (حَمْراءُالأَسَد)، لە دوای ئەوەی لە غەزای (أُحُد) بریندار بوون، ئەوانەی چاکەیان کرد و لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بۆ غەزایەکە ڕۆیشتن‌و لە خوا ترسان، ئەوانە پاداشتێکی گەورەیان هەیە لە لای خوا.

جا لەوانەیە کەسێك بپرسێ: ئایا غەزای ئەو پاڵەوانانە بەرهەمی هەبوو؟ جا ئیمامی (البُوصيري) وەڵام دەداتەوە:

بەڵێ، ئەو پاڵەوانانە بەردەوام لە هەڵمەتدا بون (**حَتَّى**) تا (**غَدَتْ**) وای لێهات (**مِلَّةُ الإِسْلامِ**) ئەم ئایینەی ئیسلام (**وَهْيَ بِهِمْ**) لەو حاڵەتەی ئایینەکە بە هاوڕێیەتی ئەو پاڵەوانانە سەرکەوتنی وەدەست هێنا و بڵاو بۆوە (**مِنْ بَعْدِ غُرْبَتِها**) پاش ئەوەی لە ناو خەڵکیدا ئایینێکی نامۆ و نەناسراو بوو، چونکە شوێنکەوتەکانی کەم بون، وای لێهات (**مَوْصُولَةَ الرَّحِمِ**) ئایینەکە پەیوەندی خزمایەتی پێگەیشت‌و بە ئاشکرایی خەڵك پەیوەندیی پێوە دەکرد.

ئەوەش ئاماژە بۆ ئەم حەدیسە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿بَدَأَ الإِسْلامُ غَرِيباً، وَسَيَعُودُ كَما بَدَأَ غَرِيباً، فَطُوبَى لِلْغُرَباءِ﴾رواه مسلم، سەرەتای ئایینی‌ئیسلام بە غەریبی دەستی پێکرد–واتە: لە ناو خەڵکیدا نامۆ و نەناسراو بوو و شوێنکەوتەکانی کەم بون– لە مەودواش دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی سەرەتایەکەی‌و شوێنکەوتەکانی کەم دەبنەوە، جا خۆشی بۆ ئەو کەسانەی لەوکاتدا دەست بە ئیسلامەوە دەگرن‌و خەڵك بە نامۆیان تێدەگەن.

ئینجا ئەم جارە ئیمامی (البُوصيري) ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: کە بە هۆی پێغەمبەرﷺو (صحابة)کانﷺ، ئایینی ئیسلام بەردەوام پارێزراو بوو و ترسی کافرەکان‌و ستەمی تێدا نەبو، هەروەك دەفەرموێ:

(**مَكْفُولَةً أَبَداً**) ئایینی ئیسلام بەردەوام سەرپەرشتکراو و پارێزراو بوو (**مِنْهُمْ**) لە کافرەکان (**بِخَيْرِ أَبٍ**) بە چاکترین باوك: کە پێغەمبەرەﷺ، واتە: پێغەمبەرﷺ وەك

باوك دڵسۆزەو بە بەزەییە لەگەڵ ئوممەتی ئیسلام، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿إِنَّما أَنَا لَكُمْ مِثْلُ الْوالِدِ لِوَلَدِهِ﴾ حديث صحيح رواه ابن ماجه والدارمي، من بۆ ئێوە، وەك باوكم بۆ رۆڵەی خۆی.

(وَ) هەروەها پارێزراو بوو بە (خَيْرِ بَعْلٍ) چاكترین مێرد: كە پێغەمبەرەﷺ، واتە: چاكترین مێرد بۆ ژنەكانی خۆی: كە ئەوانیش دایكی ئێمەنە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ﴾الأحزاب:٦، پێغەمبەرﷺ لەپێشترە بۆ ئیمانداران: لە گیانی خۆیان، ژنەكانی پێغەمبەریشﷺ دایكانی ئیماندارانن.

پێغەمبەریشﷺ فەروویەتی: ﴿أَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي﴾حديث صحيح رواه الترمذي وابن ماجة، من لە هەمووتان چاكترم بۆ خێزانەكانی خۆم.

بۆیێ (فَلَمْ تَيْتَمْ) ئایینی ئیسلام نەبووە یەتیم، چونكە پێغەمبەرﷺ وەك باشترین باوك سەرپەرشتیی دەكرد (وَلَمْ تَئِمِ) ئایینی ئیسلام نەبووە بێوەژن، چونكە پێغەمبەرﷺ وەك باشترین مێرد بەرێوەی دەبرد و بەرگریی لێدەكرد.

جا بە داخەوە ئێستا ئایینی ئیسلام وەك منداڵی یەتیمو بێوەژنی مێرد مردووی لێهاتووەو كەسێك نیە بەرگریی لێبكا، (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ راجِعُونَ).

ئینجا كە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)یڕابردوودا باسی كرد: ئایینی ئیسلام بە هۆی پێغەمبەرﷺو (صَحابَة)كانرضي الله عنهم پارێزراو بوو. ئەم جارەش باسی ئازایەتی پێغەمبەرﷺو (صَحابَة)كانرضي الله عنهم دەكا و دەفەرموێ:

(هُمُ) ئەو پاڵەوانانەی لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بون (الْجِبالُ) لە جەنگدا وەك چیایەكان بون: خۆ ڕاگر و بەهێز بونو نەدەبەزینو هەڵنەدەهاتن، چونكە خوای گەورە هەڵاتنی لە جەنگدا بە گوناهێكی گەورە داناوەو دەفەرموێ: ﴿يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفاً فَلا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبارَ * وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلاَّ مُتَحَرِّفاً لِقِتالٍ أَوْ مُتَحَيِّزاً إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾الأنفال: ١٥و١٦، هۆ ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە هەر كاتێك گەیشتنە كافرەكانو لە جەنگدا لێك نزیك بونەوە، نەكەن ببەزنو پشت بدەنە كافرەكان، هەر كەسێك لە كاتی جەنگدا پشت بداتە كافرەكانو ببەزێ –تەنها بۆ فێڵێكی جەنگ نەبێو بۆ لای كۆمەڵێكی فریاكەوتن

نەبێ- بێگومان ئەو هەڵاتووە بە غەزەبو تورەیی خواوە دەگەڕێتەوە، شوێنەکەشی جەهەننەمەو خراپترین شوێنە.

جا ئەگەر باوەڕ ناکەیو گومانت هەیە: کە لە ترسی هەڕەشەی ئەو ئایەتە (صَحابَة)کانﷺ خۆڕاگر و بەهێزبون، ئەوە (فسَلْ) پرسیار بکە (عنْهُمْ) لەبارەی (صَحابَة)کانﷺ (مُصَادمهُمْ) لەو کافرانەی ڕوبەڕویان دەبونەوە، واتە: پرسیار لە مێژوو نووسەکانیان بکە، چونکە ئەوان نەماون پرسیاریان لێبکەی، جا کە مێژووی ئەوانت خوێندەوە، ئەو کاتە دەزانی (مَاذا رَأى) دژومن چ بەهێزیەکی دیتووە (مِنْهُمْ) لەو پاڵەوانانە (فِي كُلِّ مُصْطَدَمٍ) لەگشت مەیدانێکی ڕوبەڕوبوونەوەدا: کە بۆ جەنگکردن دەگەیشتنە یەکتری.

ئینجا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) چەند شوێنێکی غەزای (صَحابَة)کانﷺ باس دەکا، تاکو پرسیاری پاڵەوانیەتی (صَحابَة)کانیان لێبکەینو دەفەرموێ:

(وَسَلْ حُنَيْناً) پرسیار لە غەزای (حُنَيْن) بکە.

(حُنَيْن): دۆڵێکە لە نێوان (مَكَّة)و (طائف)، ئەم غەزایە لە مانگی (شَوّال)ی ساڵی هەشتەمی کۆچی‌دا ڕووی دا و کافرەکان شکان.

(وَ) هەروەها (سَلْ بَدْراً) پرسیار لە غەزای (بَدْر) بکە.

(بَدْر): گوندێکە لە نێوان (مَكَّة)و (مَدِينَة)، دەکەوێتە ڕۆژئاوای باشوری (مَدِينَة)، ئەم غەزایە لە مانگی ڕەمەزان ساڵی دووەمی کۆچی‌دا ڕووی دا و کافرەکان شکانو حەفتا کەسیان لێ کوژرا و حەفتای‌تریش بە دیل گیران.

(وَ) هەروەها (سَلْ أُحُداً) پرسیار لە غەزای (أُحُد) بکە.

(أُحُد): کێوێکە لە باکوری ڕۆژهەڵاتی (مَدِينَة)ی پیرۆز، ئەم غەزایە لە مانگی (شَوّال) ساڵی سێیەمی کۆچی ڕووی دا، حەفتا (صَحابَة) شەهید بون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (صَحابَة)کانﷺ مەیدانی جەنگیان بەجێ نەهێشت تا کافرەکان بە ناچاری مەیدانەکەیان بەجێ هێشتو گەڕانەوە بۆ (مَكَّة)ی پیرۆز.

خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی ئازایەتی (صَحابَة)کانی (أُحُد) دەکا و دەفەرموێ:
﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُمْ بِإِذْنِهِ حَتَّى إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَا أَرَاكُمْ مَا تُحِبُّونَ مِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الْآخِرَةَ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ وَلَقَدْ عَفَا عَنْكُمْ وَاللهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾آل عمران: ١٥٢، بەڕاستی

خوای گەور وەعدەی خۆی هێنا جێ، کە سەرکەوتنی دانێ لەو کاتەی بە ئیزنی خوای گەورە کافرەکانتان دەکوشتن و بە شمشێرەکانتان ئەوانتان ڕادەماڵین، ئەو سەرکەوتنەش هەر بەردەوام بوو تا ئێوە ترسان و ململانەتان کرد لەبارەی مانەوە لە سەر چیایەکە، ئێوە لە فەرمانی پێغەمبەری سەرکردەﷺ دەرچون پاش ئەوەی خوای گەورە ئەو سەرکەوتنەی دابونێ کە پێتان خۆش بوو، هەندێك لە ئێوە دونیایان دەوێ بۆیە لە چیایەکە دابەزین، هەندێکیش قیامەتیان دەوێ -کە ئەو دە کەسانە بون لە سەر چیایەکە مانەوەو شەهید کران-، ئینجا بە هۆی ئەو تاوانە خوای گەورە ئێوەی لە کافرەکان گەڕاندەوەو کافرەکانی بە سەر ئێوەدا زاڵ کردن تا ئێوە تاقی بکاتەوە، بەڕاستی خوا ئێوەی عەفو کرد لەو تاوانە -ئەگەر نا: ئەو تاوانە شیاوی سزایەکی گەورەتر بوو- خوای گەورە خاوەنی نیعمەتە لە سەر ئیمانداران.

جا ئەم سێ غەزایانە (**فُصُولُ حَتْفٍ**) وەرزەکانی بەهیلاکچوون بون (**لَهُمْ**) بۆ کافرەکان (**أَدْهَى**) ئەو بەهیلاکچوونە کارەساتتر و موسیبەتتر بوو (**مِنَ الْوَخَمِ**) لە مردنێکی بە کۆمەڵ کە بە هۆی نەخۆشیەکی بڵاوبوویەوە بێ.

ئینجا ئیمامی (**الْبُوصِيرِي**) باسی جوامێری و لێزانیی (**صَحابَة**)کانﷺ دەکا لە بەکارهێنانی چەکدا، جا دەفەرموێ:

(**اَلْمُصْدِرِي**) ئەو پاڵەوانانە کشێنەرەوەن، واتە: دەگەڕێننەوە (**الْبِيضِ**) شمشێرە سپیەکانیان (**حُمْراً**) بە سۆرایەتی خوێنەوە دەیانگەڕێننەوە (**بَعْدَ ما وَرَدَتْ**) پاش ئەوەی شمشێرە سپیەکان ڕادەوەشێندران و دەگەیشتنە (**مِنَ الْعِدا**) لای دوژمنەکانیان (**كُلَّ مُسْوَدٍّ**) دەگەیشتنە گشت ڕەشایەتیەکان (**مِنَ اللِّمَمِ**) لەو بناگوێیانەی مووی ڕەشیان پێوەیە.

واتە: شمشێرە سپیەکانیان لە سەرکی کافرەکان دەدەن و بە خوێنی کافرەکان سۆر دەبن، ئینجا دەیکشێننەوەو تا کۆتایی جەنگ خوێنەکەی لێناسڕنەوە، چونکە ماوەیان نیەو هەر لە هەڵمەتبردندانە.

حەزرەتی (عَبْدالرَّحْمن بن عَوْفﷺ) لە باسی کوشتنی (أَبُوجَهْل)لعنه الله فەرموویەتی: ﴿...فَابْتَدَراهُ بِسَيْفَيْهِما فَضَرَباهُ حَتَّى قَتَلاهُ، فَقالَ النَّبِيُّﷺ: أَيُّكُما قَتَلَهُ؟ قالَ كُلٌّ مِنْهُما: أَنَا قَتَلْتُهُ. قالَﷺ: هَلْ مَسَحْتُما سَيْفَيْكُما؟ قالا: لا. فَنَظَرَ النَّبِيُّﷺ فِي السَّيْفَيْنِ، فَقالَ: كِلاكُما قَتَلَهُ...﴾رواه البخاري ومسلم، جا هەردوو کوڕە لاوەکان هەڵمەتیان بردە سەر

وَالْكَاتِبِينَ بِسُمْرِ الْخَطِّ ما تَرَكَتْ (١٣٠) أَقْلامُهُمْ حَرْفَ جِسْمٍ غَيْرَ مُنْعَجِمِ
شاكِي السِّلاحِ لَهُمْ سِيمَا تُمَيِّزُهُمْ (١٣١) وَالْوَرْدُ يَمْتَازُ بالسِّيما عَنِ السَّلَمِ

---

(أبوجَهْل) به شمشێرەكانیان لێیاندا و كوشتیان، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كامتان (أبوجَهْل)ی كوشتووە؟ هەردووكیان گوتیان: من كوشتومە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: شمشێرەكانتان سڕیوەتەوە؟ گوتیان: نا. جا پێغەمبەرﷺ تەماشای هەردوو شمشێرەكانی كرد و فەرمووی: هەردووكتان (أبوجَهْل)تان كوشتووە.

جا هەروەك (صَحابَة)كانy لە بەكارهێنانی شمشێردا لێزان بون، ئەوهاش لە بەكارهێنانی ڕمو تیردا لێزان بون، هەروەك ئیمامی (البُوصِيرِي) دەفەرموێ:

(وَالْكَاتِبِينَ) ئەو پاڵەوانانە نووسەرن (بِسُمْرِ الْخَطِّ) بەو سەرە ڕمە بۆرانەی لە شاری (خَطّ)، یان لە درەختی (خَط) دروست كراون.

واتە: هەروەك نووسەر پێنووسەكەی دادەنێتە سەر كاغەز و شوێنی نووسینەكەش دیارە، ئەوهاش (صَحابَة)كانy ڕمەكانیان دەچەقاندە ناو لاشەی كافرەكانو (ماتَرَكَتْ أَقْلامُهُمْ) پێنووسەكانیان= ڕمەكانیان هیچ شوێنێكیان نەهێشتەوە (حَرْفَ جِسْمٍ) لە هیچ لایەكی لاشەی كافرەكان (غَيْرَ مُنْعَجِمٍ) بە بێ نوختە دانان.

واتە: گشت شوێنێكی لاشەی كافرەكان ئاسەواری ڕمی (صَحابَة)كانیy پێوە دیار بوو. جا ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەم حەدیسە، كە پێغەمبەرﷺ لەبارەی ڕم فەرموویەتی: ﴿جُعِلَ رِزْقِي تَحْتَ ظِلِّ رُمْحِي، وَجُعِلَ الذِّلَّةُ والصَّغارُ عَلَى مَنْ خالَفَ أَمْرِي﴾ رواه البخاري، بژێوی من خراوەتە ژێر سێبەری ڕمی من، زەلیلیو سەرشۆڕیش خراوەتە سەر ئەو كەسەی دژایەتی فەرمانی من دەكا.

جا لە بەر ئەوەی ئیمامی (البُوصِيرِي) تەنها باسی شمشێر و ڕمی كرد، لەوانەیە كەسێك وا تێبگا: (صَحابَة)كانy چەكیتریان نەبوبێ. جا ئیمامی (البُوصِيرِي) ئەو تێنەگەیشتنە هەڵەیە ڕەد دەكاتەوەو دەفەرموێ:

(شاكِي السِّلاحِ) پڕچەكیی بەهێز= چەكی تەواو و بەهێز (لَهُمْ) بۆ (صَحابَة)كانy (سِيمَا) نیشانەیە (تُمَيِّزُهُمْ) ئەو نیشانەیە جیایان دەكاتەوە لە كافرەكان، چونكە خوای گەورە فەرمانی پێكردبون: خۆیان پڕچەك بكەنو خۆیان بۆ دوژمنانی ئیسلام بەهێز بكەن. هەروەك دەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لا تَعْلَمُونَهُمُ اللهُ يَعْلَمُهُمْ﴾الأنفال: ٦٠، ئامادە بكەن بۆ دژایەتی كافرەكان هەرچەندی لە تواناتاندا هەیە لە هێزی چەك

هاوێشتن‌و ڕاگرتنی وڵاغی جەنگی، تاکو بەو هێزە دوژمنی خوا و دوژمنی خۆتان بترسێنن، هەم هەندێك دوژمنی‌تری جگە لەوانیش بترسێنن کە ئێوە نازانن چ دوژمنێکن، هەر خوا ئەیانزانێ.

جا (صَحابَة)کانﷺ بەو نیشانەیە جیا دەکرێنەوە لە کافرەکان، هەروەك (وَالْوَرْدُ) درەختی گوڵەباغ (یَمْتازُ) جیا دەبێتەوە (بِالسِّیما) بە نیشانەی خۆی: کە گوڵەکەی ڕەنگی جوانەو بۆنی خۆشە (عَنِ السَّلَمِ) لە درەختی (سَلَمْ) جیا دەبێتەوە، چونکە کڵۆکی (سلَم) ڕەنگی زەردەو وەك گوڵەباغ بۆنی خۆش نیەو جوانیش نیە.

کەوابوو: (صَحابَة)کانﷺ گوڵەباغی باغەکانی غیرەت‌و ئازایەتین‌و بە نوری (جهاد)و خواپەرستی ڕوویان دەدرەوشێتەوە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿سِیمَاهُمْ فِی وُجُوهِهِمْ مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ﴾الفتح:٢٩، (صَحابَة)کانﷺ نیشانەی خۆیان لە ڕووی خۆیاندایە لە ئاسەواری سوجدەبردن بۆ خوای گەورە.

ئینجا ئیمامی (الْبُوصیرِی) باسی سەرکەوتنی (صَحابَة)کانﷺ دەکا و دەفەرموێ: (تُهْدِی إِلَیْكَ) بە دیاری بۆ تۆ دەنێرێ (رِیاحُ النَّصْرِ) بایەکانی سەرکەوتن (نَشْرَهُمُ) بۆنە خۆشەکەی هەواڵی سەرکەوتنی (صَحابَة)کانﷺ بە سەر دوژمنانی ئیسلامدا، واتە: بای سەرکەوتن، هەواڵی سەرکەوتنی (صَحابَة)کانﷺ بە دیاری بۆ تۆ دەنێرێ، مەبەستیش بە بای سەرکەوتن بای (صَبا)یە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿نُصِـرْتُ بِالصَّبا وَأُهْلِكَتْ عادٌ بِالدَّبُورِ﴾رواه البخاري ومسلم، بە بای (صَبا) سەرکەوتنم دراوەتێ، گەلی (عاد)ش بە ڕەشە با بە هیلاك درا.

جا کاتێ تەماشای (صَحابَة)کانﷺ دەکەی (فَتَحْسَبُ) وا گومان دەبەی‌و وا تێدەگەی (الزَّهْرَ فِی الْأَكْمَامِ) وەك خونچە کڵۆکی ناو بەرگەکانە (كُلَّ كَمِی) گشت ئازا و دلێرێکی (صَحابَة)کانﷺ، واتە: گشت (صَحابَة)یەك لە ناو زریێو چەکی خۆیدا وەکو خونچە کڵۆکی نەپشکفتووی ناو بەرگی‌خۆیەتی.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ حەدیسەکەی ئیمام (العَبّاس)ی مامی پێغەمبەرﷺ کە لە باسی غەزای (فَتْحِ مَكَّة)دا فەرموویەتی: ﴿...حَتَّی مَرَّ رَسُولُ اللهِﷺ فِی كَتِيبَتِهِ الْخَضْراءِ وَفِيهَا الْمُهاجِرُونَ وَالْأَنْصارُ، لا يُرَى مِنْهُمْ إِلاّ الْحَدَقُ مِنَ الْحَدِيدِ...﴾رواه الإمامان: ابن كثير والحلبي في سيرتيهما، تا پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هێزە تایبەتیە سەوزەکەی خۆی ڕابرد-کە لە

كَأَنَّهُمْ في ظُهُورِ الْخَيْلِ نَبْتُ رُبَا (١٣٣) مِنْ شِدَّةِ الْحَزْمِ لا مِنْ شَدَّةِ الْحُزُمِ
طارَتْ قُلُوبُ الْعِدا مِنْ بأْسِهِمْ فرَقَا (١٣٤) فَمَا تُفَرِّقُ بَيْنَ الْبَهْمِ وَالْبُهُمِ

(مُهاجِر)و (الأَنْصار)ەكان پێك هاتبوو، تەنها گلێنەی چاویان دیار بوو، چونكە بە چەكو زرێی ئاسن خۆیان پۆشیبوو.

ئینجا ئیمامی (الْبُوصیِري) باسی سوارچاكی‌ی (صَحابَة)كان ﷺ دەكا و دەفەرموێ:

(**كَأَنَّهُمْ**) وەك بڵێی (صَحابَة)كان ﷺ وێدەچن (**فی ظُهُورِ الْخَيْلِ**) لە سەر پشتی ئەسپەكانیان (**نَبْتُ رُباً**) وەك داربەڕووی سەر تەپۆڵكەكانن.

واتە: لە جەنگدا (صَحابَة)كان ﷺ لە سەر پشتی ئەسپەكانیان ناكەونە خوارەوە، هەروەك داربەڕووی سەر تەپۆڵكەكانیش با و لافاو كاری لێناكا.

جا ئەو سوارچاكیەی (صَحابَة)كانیش ﷺ (**مِنْ شِدَّةِ الْحَزْمِ**) بە هۆی بەهێزی خۆڕاگری‌ی خۆیان بوو (لا) نەك (**مِنْ شَدَّةِ الْحُزُمِ**) بە هۆی بەستنی تەنگە= پشتێنەكانی زینی ئەسپەكان.

ئیتر بۆ (صَحابَة)كان ﷺ ئەو شانازیە بەسە: كە خوای گەورە سورەتێكی قورئانی بە ناوی (الْعادِیات)= ئەسپەكانی (صَحابَة)كانو گشت (مُجاهِد)ەكانی‌تر ناردۆتە خوارەوە، لەو سورەتەدا خوای گەورە سوێند بەو ئەسپانە دەخوا كە ئەوان لە سەر پشتیان سوار دەبنو غەزا دەكەن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحاً﴾ سوێند دەخۆم بەو ئەسپانەی لە غەزادا غار دەدەنو دەنگی (ئوح ئوح) لە هەناسەیان دێتە دەرەوە ﴿فَالْمُورِياتِ قَدْحاً﴾ جا سوێند بەو ئەسپانەی بە هۆی غاردان پریشكە ئاگر لە بن سمەكانیان دەردەكەن ﴿فَالْمُغِيراتِ صُبْحاً﴾ جا سوێند بەو ئەسپانەی لە كاتی بەیاندا هێرش دەكەنە سەر دوژمنانی ئیسلام ﴿فَأَثَرْنَ بِهِ نَقْعاً﴾ جا ئەسپەكان بەو غاردانە تۆز و غوباریان لە زەمین پەیدا كرد ﴿فَوَسَطْنَ بِهِ جَمْعاً﴾ جا ئەسپەكان بەو غاردانە چونە ناو كۆمەڵی دوژمنانی ئیسلام.

جا كە ئەوە سیفەتی ئەسپەكان بێ، ئەبێ سیفەتی سوارئەسپەكان چۆن بێ؟!

ڕەحمەتی خوا لە ئیمامی (الْبُوصیِري)، زۆر چاكی پێكاوە.

ئینجا كە ئیمامی (الْبُوصیِري) باسی پڕچەكی‌و سوار چاكی‌ی (صَحابَة)كانی ﷺ كرد، ئەم جارە باسی بەرهەمو ئەنجامی ئەو سیفەتە چاكانە دەكا و دەفەرموێ:

(**طارَتْ**) فڕی، واتە: هاتە لەرزین (**قُلُوبُ الْعِدا**) دڵی دوژمنانی ئیسلام (**مِنْ بأْسِهِمْ**)

به هۆی بەهێزیو توندی (صَحابَة)کانﷺ له جەنگدا (فَرَقاً) له ترسی (صَحابَة)کانﷺ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَحْلِفُونَ بِاللهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ﴾التوبە:٥٦، کافرەکانی (مُنافِق) سوێند بە خوا دەخۆن: ئەوان لە چینی ئێوەی ئیماندارن. لە حاڵەتێکدا ئەوان لە چینی ئێوە نینو کافرن، بەڵام ئەوان گەلێکن لە ئێوەی ئیماندار دەترسێن، بۆیێ سوێندی به درۆ دەخۆن.

جا بە ئەندازەیەکی وەها دوژمنانی ئیسلام لە (صَحابَة)کانﷺ دەترسان: کە (فَمَا تُفَرِّقُ) دڵی ئەوان جیاوازی نەدەکرد (بَيْنَ الْبَهْمِ) لە نێوان بەرخەکانی ساوا و (وَالْبُهُمِ) له نێوان پاڵەوانەکانی ئازا.

جا وا تێمەگە: ئەو وێچواندنە زێدەڕۆیی تێدایە، چونکە خوای گەورە پشتگیری ی دەکا و دەفەرموێ: ﴿لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ اللهِ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لا يَفْقَهُونَ﴾ الحشر:١٣، بەڕاستی ئێوەی موسوڵمان ترستان بەهێزترە لە دڵی (مُنافِق)و جولەکاندا، لە ترسی خودا، واتە: ئەو کافرانە زیاتر لە ئێوە دەترسێن نەك لە خودا؟ چونکە ئەوان گەلێکن تێناگەنو نازانن گەورەییو هێزی خوا چەندە.

جا لەوانەیە کەسێك بپرسێ: خۆ ژمارەی کافرەکان لە (صَحابَة)کانﷺ زیاتر بوو، ئەی هۆی چی بوو هەر (صَحابَة)کانﷺ سەرکەوتوو بون، جا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) وەڵام دەداتەوە:

ئەو سەرکەوتنەی (صَحابَة)کانﷺ به هۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەرﷺ بوو، کەوابوو: (وَمَنْ تَكُنْ) هەر کەسێك ببێ (بِرَسُولِ اللهِ) بە هۆی پێغەمبەرﷺ (نُصْرَتُهُ) پشتیوانیی بکرێو سەرکەوتنی بدرێتێ، واتە: وەك (صَحابَة)کانﷺ بەرگری لە ڕێبازی پێغەمبەرﷺ بکا، ئەویش وەکو (صَحابَة)کانﷺ -بە بەرەکەتی پێغەمبەرﷺ- سەرکەوتنی بۆ دەبێ، به شێوەیەکی وەها: (إِنْ تَلْقَهُ الْأُسْدُ) ئەگەر کۆمەڵێ شێرەکان بیگەنێ (فِي آجَامِها) له ناو بیشەڵانی خۆیاندا، ئەوە لە بەر خاتری پێغەمبەرﷺ (تَجِمِ) شێرەکان بێدەنگ دەبنو ملکەچیی بۆدەکەن.

جا ئەمەش ئاماژەیە بۆ بەسەرهاتەکەی حەزرەتی (سَفِينَة)ﷺ-کە خزمەتکارێکی پێغەمبەرﷺ بوو- و فەرموویەتی: ﴿لە غەزای (رُوم) کەشتیەکمان شکا، جا من سواری تەختەیەکی کەشتیەکە بوم تا گەیشتمە دورگەیەکی ناو دەریاکە، لە ناکـ

شێرم لیێ پەیدا بوو، جا منیش بە شێرەکەم گوت: (إِنِّي سَفِينَةُ مَوْلَى رَسُولِ اللهِﷺ) من (سَفِينَة)م خزمەتکاری پێغەمبەرمﷺ. جا شێرەکە دەستی بە کلک تەکاندن کرد و هات لە تەنیشتم دەڕۆیشت تا ڕاستەڕێی کردم، جا شێرەکەش گەڕاوە ناو بێشەڵانەکەی خۆی﴾. ئیمام(عبدالرزاق)و ئیمامی (البیهقي) گێڕاویەتیانەوە.

جا کە ئیمامی (البُوصِيرِي) لە (بَيْت)یڕابردوودا فەرمووی: هەر کەسێك بە هۆی پێغەمبەرﷺ پشتیوانیی بکرێ، سەرکەوتوو دەبێ. ئەم جارە ئەوەمان بۆ باس دەکا: کە ئەو سەرکەوتنە شتێکی بەردەوامە، هەتا مرۆڤ یارمەتی ڕێبازی پێغەمبەرﷺ بدا، خودا یارمەتیی دەدا، جا دەفەرموێ:

**(وَلَنْ تَرَى)** بە تەئکید= بێگومان نابینی **(مِنْ وَلِيٍّ)** هیچ دۆستێکی پێغەمبەرﷺ **(غَيْرِ مُنْتَصِرٍ)** سەرکەوتوو نەبێ **(بِهِ)** بە پێغەمبەرﷺ.

واتە: هەر کەسێك دۆستایەتی پێغەمبەرﷺ بکا و بەرگری لە ڕێبازەکەی بکا، بێگومان بە بەرەکەتی پێغەمبەرﷺ سەرکەوتوو دەبێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَتَوَلَّ اللهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللهِ هُمُ الْغَالِبُونَ﴾المائدە:٥٦، هەر کەسێك دۆستایەتی خواو پێغەمبەرﷺو ئیمانداران بکا و یارمەتی ئایینی ئیسلام بدا، ئەوە بێگومان هەر گرۆهی خوا زاڵبوو و سەرکەوتووە.

**(وَلا)** هەروەها نابینی **(مِنْ عَدُوٍّ)** هیچ دوژمنێکی پێغەمبەرﷺ **(غَيْرِ مُنْقَصِمِ)** پارچەکراو و پشت شکاو نەبێ، واتە: بەڵام بەو مەرجەی موسوڵمانان بە بێگەردی بەرگری لە ئیسلام بکەن، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَنْصُرُوا اللهَ يَنْصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ * وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ﴾ محمدﷺ٧و٨، هۆ ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، ئەگەر ئێوە یارمەتی ئایینی خوا بدەن، خودا سەرکەوتنتان دەداتیۆ لە جەنگدا پێیەکانتان جێگیر دەکا، ئەوانەی کافر بوینە بەهیلاکچوون بۆ ئەوانەو خوای گەورە کردەوەکانیانی پوچەڵ کردوەو سودی لێنابینن.

جا لەوانەیە کەسێك بڵێ: ئەوە زانیمان: موسوڵمانان لە بەر خاتری پێغەمبەرﷺ لە دونیادا سەرکەوتنیان دەدرێتیۆ بە سەر کافرەکاندا زاڵ دەبن، ئایا لە قیامەتیش ئەو خاترەی پێغەمبەرﷺ ڕەچاو دەکرێو موسوڵمانان لە بەر خاتری وی ڕزگار دەبن؟

جا ئیمامی (البُوصِيرِي) وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

**(أَحَلَّ أُمَّتَهُ)** پێغەمبەرﷺ ئوممەتی خۆی دابەزاندووەو دایناوە **(فِي حِرْزِ مِلَّتِهِ)** لە ناو قەڵاتی ئایینی خۆی، واتە: ئوممەتی خۆی بە ئایینی خۆی پاراستووە، کە وەك قەڵاتێکی پارێزراوەو مەترسیی لە سەر نیە، چونکە ئەوها خوای گەورە گفتی پێداوە ﴿عَنْ عَبْدالله بن عَمْرو رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبيَّﷺ تلا قَوْلَهُ تَعالَى: (رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثيراً) الآيَة، وقَوْلَهُ تَعالَى: (إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبادُكَ) الآيَة، فَرَفعَﷺ يَدَيْه وَقال: اَللّهُمَّ أُمَّتي، أُمَّتي، وَبَكَى...فَقالَ اللهُ تَعالَى: ياجِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّد فَقُلْ: إنّا سَنُرْضِيكَ فِي أُمَّتِكَ وَلا نَسُوءُكَ﴾رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ ئەو دوو ئایەتانەی ڕابردووی خوێندنەوە، جا دەستەکانی بەرز کردنەوەو دوعای کرد و فەرمووی: خودایە ئوممەتی من، ئوممەتی من، واتە: ڕەحم بە ئوممەتی من بکە. جا پێغەمبەرﷺ گریا...جا خوای گەورە فەرمووی: (جُبْرائِيل) بڕۆ لای (مُحَمَّد)ﷺ پێی بڵێ: لەبارەی ئوممەتت ڕازیت دەکەین و دڵتەنگت ناکەین. واتە: ڕەحم بە هەموو ئوممەتت دەکەین.

ئیمامی (النّواوي) فەرموویەتی: ئەم حەدیسە موژدەیەکی گەورەی تێدایە بۆ ئەم ئۆممەتەی ئیسلام، بە هۆی ئەو وەعدەی خوا داویەتیێ، هەم ئومێدترینی حەدیسەکانە بۆ ئۆممەتی ئیسلام.

جا پێغەمبەرﷺ بە جۆرێکی وەها بە قەڵاتی ئایین ئۆممەتی خۆی پاراستووە: **(كَاللَّيْثِ)** وەکو شێر **(حَلَّ)** دابەزیبێ **(مَعَ الأَشْبالِ)** لەگەڵ بەچکەکانی **(فِي أَجَمٍ)** لە ناو بێشکەڵانێکدا.

واتە: هەروەکو ئەگەر شێر لەگەڵ بەچکەکانی لە ناو بێشکەڵانێکدا بێ، هیچ شتێك ناتوانێ زیانی لێبدا، ئەوهاش هەرکەسێك وەگەڵ پێغەمبەرﷺ بکەوێو بێتە ناو ئایینی ئیسلام، ئاگری کوفر زیانی لێنادا، هەروەك لە حەدیسێکی (قُدْسِي)ی بێ هێزدا هاتووە: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لا إِلهَ إِلاّ اللهُ حِصْنِي، فَمَنْ دَخَلَ حِصْنِي أَمِنَ مِنْ عَذابِي﴾أخرجه أبو نعيم فيالحلية وابنالنجار، وضعفه الحافظ العراقي في تخريج أحاديث الاحياء، (لآإِلهَ إِلاّاللهُ) قەڵاتی منە، هەرکەسێك بێتە ناو قەڵاتی من، لە عەزابی من ئەمین دەبێ.

جا لەوانەیە کەسێك بڵێ: ئەوەی لە ڕابردوودا گوترا، وا دەگەیەنێ: ئایینیئیسلام تەنها بە هێزی چەك سەرکەوتنی وەدەست هێناوە. جا ئیمامی (البُوصِيرِي) ئەو بۆچوونە بەوە ڕەد دەکاتەوە: کە بەکارهێنانی چەك -لە ڕاستیدا- بۆ پاراستنی

كَمْ جَدَّلَتْ كَلماتُ اللهِ مِنْ جَدلٍ (١٣٨) فيهِ وَكَمْ خَصَمَ الْبُرْهانُ مِنْ خَصِمِ
كَفاكَ بِالْعِلْمِ فِي الأُمِّيِّ مُعْجِـزَةً (١٣٩) فِي الْجاهِلِيَّةِ وَالتَّأْديبِ فِي الْيُـتُمِ

---

ئايين بوو، چونکه به هۆی قورئانی پیرۆز و (مُعْجِزَة)کانیتری پێغەمبەرﷺ زۆرتر خەڵك موسوڵمان بووه. جا دەفەرموێ:

(كَمْ جَدَّلَتْ) زۆر کەسی دەمکوت کردون (كَلماتُ اللهِ) قورئانی پیرۆز (مِنْ جَدلٍ) لەو کەسەی زۆر ململانەو مشتو مڕی دەکرد (فيهِ) لەبارەی ئایینی ئیسلام، کە زۆر پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ دەکردن و گومانیان لە ئیسلامدا پەیدا دەکردن، جا خوای گەورە بۆ دەمکوتکردنی ئەوان یەکسەر ئایەتەکانی قورئانی بۆ پێغەمبەرﷺ دەناردنە خوارەوە.

بۆ نمونە: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ الاسراء:٨٥، ئەی پێغەمبەرﷺ کافرەکان لەبارەی ڕوح=گیان پرسیارت لێدەکەن؟ لە وەڵامدا بڵێ: ڕوح نهێنیەکی شاراوەی خودایەو جگە لە خوا هیچ کەسێك نایزانێ، ئێوەش تەنها بەشێکی کەم زانستان دراوەتێ.

(وَكَمْ خَصَمَ الْبُرْهانُ) زۆر جار بەڵگەو (مُعْجِزَة)ی پێغەمبەرﷺ زاڵ بووەو لای بردوه (مِنْ خَصِمِ) کێشەی ئەو کەسەی زۆر کێشە دەکا لەبارەی ئیسلام ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه سَأَلَ أَهْلُ مَكَّةَ النَّبِيَّ ﷺ آيَةً؟ فَانْشَقَّ الْقَمَرُ بِمَكَّةَ، فَنَزَلَتْ (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ)﴾ رواه الشيخان، دانیشتووانی (مَكَّة) داوای (مُعْجِزَة)یەکیان لە پێغەمبەرﷺ کرد؟ جا لە (مَكَّة)دا مانگ دوو لەت بوو، جا خوای گەورە ئایەتی (اِقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ)ی ناردە خوارەوە، واتە: دونیا وێران بوون نزیك بووەو مانگ دوو لەت بوو.

جا کە ئیمامی (الْبُوصيري) باسی ئەوەی کرد: (مُعْجِزَة)کانی پێغەمبەرﷺ کێشەچیی دەمکوت کردوە. ئەم جارە باسی ئەوەمان بۆ دەکا: کە زانایی و دانایی پێغەمبەرﷺ لە خۆیدا (مُعْجِزَة)یەو دەفەرموێ:

(كَفاكَ) بۆ تۆ بەسە (بِالْعِلْمِ) ئەو زانستە زۆرەی (فِي الأُمِّيِّ) لەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەدا هەیەﷺ (مُعْجِزَةً) لە ڕووی (مُعْجِزَة)وە (فِي الْجاهِلِيَّةِ) لە سەردەمی نەفامی و بێزانستیدا. واتە: ئەو (مُعْجِزَة)یە بەسە: کە ئەو هەموو زانستە زۆرە خوای گەورە لە سەردەمێکی بێزانستدا داویەتیە ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەی نازانێ بنووسێ و بخوێنێتەوەﷺ.

خَدَمْتُهُ بِمَدِيحٍ أَسْتَقِـيلُ بِه (١٤٠) ذُنُوبَ عُمْرٍ مَضَى فِي الشِّعْرِ وَالْخِدَم

بەڵگە لە سەر نەخوێندەواریی پێغەمبەرﷺ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿الَّـذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِى يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِى التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيـلِ)...تـا (أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾الاعراف:١٥٧، رەحمەتی خوا لەو کەسانەی شوێن ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە دەکەون-کە ناوی (مُحَمَّد)ەﷺ- سیفەتی ئەو پێغەمبەرەیان دەست دەکەوێ لە لایەن خۆیان نووسراوە لە (تَوْرَاة)و لە (إِنْجِيل)دا...ئەوانە براوەی بەختەوەرن لە دونیا و لە قیامەت.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿قُولُوا﴾ لە سەلەوات لێداندا بڵێن: ﴿أَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ﴾حديث صحيح رواه الدارقُطني والبيهقي.

(وَ) هەروەها ئەو (مُعْجِزَة)یە بۆ تۆ بەسە: **(التَّأْدِيب)** ئەو ئەدەبو رەوشتە جوانەی **(فِي الْيُتْم)** لە یەتیمدا هەیە، کە پێغەمبەرەﷺ، چونکە تەمەنی پێغەمبەرﷺ لە ناو زگی دایکیدا دوو مانگ بوو، باوکی وەفاتی کرد، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيماً فَآوَى﴾الضحى:٦، ئەی پێغەمبەرﷺ ئەدی تۆ کاتی خۆی یەتیم نەبوی، خوای گەورە تۆی حاواندەوە؟ واتە: بە باپیرەتو مامت بەخێوی کردی.

**لەمە گەورەتر (مُعْجِزَة) کامە * (يَتِيم) بە ئەدەب (أُمِّي) عەللامە**

## ﴿الْـفَـصْلُ التَاسِـعُ فِـى الـتَّوَسُّلِ بِالـنَّـبِـيِّ ﷺ﴾

### ﴿ بەشی نۆیەم: لە باسی پاڕانەوە لە خوا بە خاتری پێغەمبەرﷺ ﴾

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) مەدحی پێغەمبەریﷺ کرد و باسی (مُعْجِزَة)و (مِعْرَاج)و غەزایەکانی پێغەمبەریﷺ کرد، هەستی کرد: بەم کارە باشە لە پێغەمبەرﷺ نزیك بۆتەوە، بۆیێ بە خاتری ئەم کارە باشەو بە خاتری پێغەمبەرﷺ لە خوا دەپاڕێتەوە: تاکو لە گوناهەکانی خۆش ببیو ببیورێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَابْتَغُوا إِلَيْهِ الْوَسِـيلَةَ﴾المائدة:٣٥، ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، لە خوا بترسنو هەوڵ بدەن لە خوا نزیك ببنەوە بە خاتری کردەوە چاکەکانتان.

بۆیێ ئیمامی (الْبُوصِيرِي) دەفەرموێ:

**(خَدَمْتُهُ)** خزمەتی پێغەمبەرمﷺ کرد **(بِمَدِيحٍ)** بە ستایشکردنێك، واتە: بەم

قەسیدەیە مەدحی پێغەمبەرم ﷺ کرد (أَسْتَقِيلُ) تکای لێبوردن لە خوا دەکەم (بِهِ) بە خاتری ئەو ستایشکردنەم (ذُنُوب عُمْرٍ) تاکو لە گوناهەکانی ئەو تەمەنەم خۆش ببێ: کە (مَضَى) ڕۆیشتو بەسەرم برد (فِي الشِّعْرِ) لە شیعر گۆتنی دونیا و هەم (وَالْخِدَمِ) لە خزمەتکردنی پیاوانی دونیا بەو شیعرانەم.

ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەو سەردەمەی کە پێشتر ئیمامی (البُوصِيرِي) پەیوەندیی لەگەڵ کاربەدەستانی دونیا هەبوو و شیعری پێدا هەڵدەگۆتن، جا لە بەر ئەوەی لەو ڕەفتارەی پەشیمانەو هەست ئەکا ئەوەندە تەمەنەی بەفیڕۆ داوە، بۆیێ بە خاتری ئەم قەسیدەیە -کە لە مەدحی پێغەمبەر ﷺ دایناوە- تکا لە خوا دەکا: لە بەفیڕۆدانی ئەوەندە تەمەنەی خۆش ببێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ﴾هود:١١٤، بەڕاستی چاکەکان خراپەکان لادەبەن.

هەم پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ﴿...وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا﴾حديث حسن رواه الترمذي، بە دوای هەر خراپەیەکدا چاکەیەك بکە، تاکو چاکەکە خراپەکە بسڕێتەوە.

جا لەوانەیە کەسێك بپرسێ: ئایا شیعر گۆتن بە سەر پیاوانی دونیادا و خزمەتکردنی پیاوانی دونیا، مرۆڤ توشی گوناهـ دەکا و پێویستی بە تکای لێبوردن هەیە؟ جا ئیمامی (البُوصِيرِي) وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

بەڵێ، بۆیێ تکای لێبوردن دەکەم (إِذْ قَلَّدانِي) چونکە شیعرگۆتنەکەمو خزمەتکردنی پیاوانی دونیا بەو شیعرانەم، وەك پەتی ئاژەڵ خستیانە ئەستۆی من (مَا) چەند تاوانێکی وەها: کە (تُخْشَى) ترس هەبوو (عَواقِبُهُ) لە دەرەنجامی ئەو تاوانانە: کە سزای خوای گەورەیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ زەمی شیعری دونیایی کردووەو فەرموویەتی: ﴿لَأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحاً خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْراً﴾رواه البخاري ومسلم، واتە: ناو هەناوی یەکێکتان پڕ کێم ببێ، بۆی باشترە لەوەی پڕ شیعری ناهەق ببێ. واتە: بەردەوام شیعری دونیایی بڵێ.

جا بە جۆرێکی وەها شیعر و خزمەتی پیاوانی دونیا، پەتی تاوانیان خستە ئەستۆی من (كَأَنَّنِي) وەك بڵێی: من (بِهِمَا) بە هۆی تاوانی ئەو شیعر و خزمەتە (هَدْيٌ) دیاریی پەت لەملکراوم (مِنَ النَّعَمِ) لەو بزنو مەڕ و وشتر و مانگایەی پەتی لە مل دەکرێو ڕادەکێشرێو بە دیاری بۆ (مَكَّة) دەنێردرێ.

أَطَعْتُ غَيَّ الصِّبَا فِي الْحالَتَيْنِ وَما (١٤٢) حَصَلْتُ إلاّ عَلَى الآثامِ وَالنَّدَمِ
فَيا خَسَارَةَ نَفْسٍ فِي تِجارَتِها (١٤٣) لَمْ تَشْتَرِ الدِّينَ بِالدُّنْيَا وَلَمْ تَسُمِ

---

واته: هەروەك ئەو جۆرە ئاژەڵانەی دیاری ئەنجامەکەی سەربڕینە، ئەوها منیش بەهۆی ئەو شیعر و خزمەتەم ترسام ئەنجامەکەم بەهیلاکچوون بێ‌و تووشی سزای خوا ببم، بۆیێ تکای لێبوردن لە خوا دەکەم.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە هەردوو (بَيْت)ی‌ڕابردوودا ئەوەی باس کرد: کە لە بەشێکی تەمەنی‌دا سەرقاڵی شیعر و خزمەتی پیاوانی دونیا بووە. ئەم جارە باسی هۆکارەکەو ئەنجامە بێ‌سودەکەیان دەکا و دەفەرموێ:

**(أَطَعْتُ)** گوێڕایەڵ بوم **(غَيَّ الصِّبَا)** بۆ گومڕایی تەمەنی هەرزەکاریم‌و تازە لاویم، واته: شوێن هەواو هەوەسی سەرەتای تەمەنم کەوتم **(فِي الْحالَتَيْنِ)** لە هەردوو حاڵەتی شیعر گۆتن‌و خزمەتی پیاوانی دونیا بە شیعرەکانم، بەڵام **(وَما حَصَلْتُ)** بەو شوێنەکەوتنەم هیچم وەدەست نەهێنا **(إلاّ)** تەنها **(عَلَى الآثامِ)** کەوتمە سەر تاوانەکان‌و **(وَالنَّدَمِ)** پەشیمانیم لە کارەکانی‌ڕابردووم، چونکە ئەو کارانەم بۆ خوا نەبوەو تەمەنی گەنجایەتیم بەفیڕۆ داوە.

واته: دەبوا هەر لە سەرەتای تەمەنمدا خواپەرستیم کردبا، تاکو هاتبامە ریزی ئەو حەفت کەسانەی لە مەیدانی مەحشەردا گەرما و دڵتەنگی نابینن، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لا ظِلَّ إِلاّ ظِلُّهُ...وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبادَةِ رَبِّهِ﴾ رواه الشيخان، حەفت جۆرە کەس هەنە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت لە سێبەری (عَرْش)ی خۆی دایاندەنێ کە جگە لە سێبەری وی هیچ سێبەرێکی‌تر نیە...یەکێك لەو حەفت کەسانە: گەنجێکە لە خواپەرستی‌دا پێگەیشتبێ‌و گەنجایەتی‌خۆی لە خواپەرستی‌دا بەسەر بردبێ.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە(بَيْت)ی‌ڕابردوودا پەشیمانی خۆی ئاشکرا کرد: لە هەردوو کردەوەکانی تەمەنی‌ڕابردووی. ئەم جارە خەفەتباری خۆی ئاشکرا دەکا لەو زەرەرەی بەو کردەوانە کردویەتی‌و دەفەرموێ:

**(فَيا خَسارَةَ نَفْسٍ)** ئای لەو زەرەرە گەورەی نەفسی من کردویەتی! **(فِي تِجارَتِها)** لە کاتی بازرگانیەکەی‌دا، واته: لەو تەمەنەی‌ڕابردووی‌دا، کە لە هەواو هەوەسی دونیادا بەسەری برد و هیچی بۆ قیامەت نەکرد، جا بۆیێ نەفسی من زەرەری کرد:

وَمَنْ يَبِعْ آجِــلاً مِــنْهُ بِعَاجِــلِه (١٤٤) يَبِنْ لَهُ الْغَبْنُ فِي بَيْعٍ وَفِي سَلَمٍ
إنْ آتِ ذَنْباً فَمَا عَهْدِي بِمُنْتَقِضٍ (١٤٥) مِنَ النَّبِيِّ وَلا حَبْلِي بِمُنْصَــرِمِ

چونكه (لَمْ تَشْتَرِ الدِّينَ) به تەواوی ئایینی نەكڕی (بِالدُّنْيَا) به دونیا، واتـه: ئـایینی بە سەر دونیادا هەڵنەبژارد، هەم (وَلَمْ تَسُمِ) مامڵەتی كڕینیشی نەكرد و گوێی نـەدا بانگەوازیەكەی خوا، كه دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُـمْ عَلَـى تِجَـارَةٍ تُنْجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ * تُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِـي سَـبِيلِ اللهِ بِـأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾الصف:١٠و١١، هۆ ئەو كەسانەی باوەڕتـان بـه خواو پێغەمبەرﷺ هەیە، ئایا شارەزاتان بكەم لە بازرگانیەكی به قـازانج، بازرگانیەكـە ڕزگارتان بكا لە عەزابێكی به ئازار؟ بازرگانیەكە ئەمەیە: بەڕاستیو بێ گەردی باوەڕتان بە خواو پێغەمبەرﷺ هەبێو لە ڕێگەی خوا بە ماڵتـانو بـە گیانتـان (جِهـاد) بكـەنو تێكۆشن بۆ بەرزكردنەوەی ئایینی ئیسلام، ئەو بازرگانیە-كە باوەڕ و (جِهاد)كردنە بۆ ئێوە باشترە، ئەگەر ئێوە بزانن.

جا بۆ بەهێزكردنی (بَيْت)یڕابردوو ئیمامی (الْبُوصِيرِي) دەفەرموێ:

(وَمَنْ) هەر كەسێك (يَبِعْ) بفرۆشێ (آجِلاً مِنْهُ) دواڕۆژی خۆی، واتـه: قیامـەتی خـۆی بفرۆشێ (بِعَاجِلِه) بە دونیای خۆی، واته: لە جیـاتی قیامـەت دونیـا وەربگـرێ، ئـەوە (يَبِنْ لَهُ) بـۆی ئاشـكرا دەبـێ (الْغَبْنُ) تێشـكانو زەرەرێكـی تـەواو (فِـي بَيْـعٍ) لـە فرۆشتنی حازر و (وَفِي سَلَمٍ) لە فرۆشتنی بە قەرز، واته: لە هیچێكیان قازانج ناكـا و بە ئاشكرایی زەرەر دەكا، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ اشْــتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَى فَمَا رَبِحَتْ تِجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ﴾البقرە:١٦، ئەوانە ئەو كەسـانەن: كە گومڕابوونیان كڕیوە بە ئیمانهێنان، واته: لـە جیاتی ئیمان كافربوونیان وەرگرتـووە، بۆیێ بازرگانیەكەیان قازانجی نەدا و ئەوانیش هەستیان بـەو زەرەرە نـەكرد: كـە بوینـە زەرەرمەندی دونیا و قیامەت، چونكە ڕێگەی ڕاستیان نەگرتووە.

ئینجا كە لە چەند(بَيْت)ێكیڕابردوودا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) زۆر دابەزیـە سـەر نەفسـی خـۆیو بەزەرەرمەنـدی دانـا، لـەوە ترسـا: نەفسـەكەی بـێ ئـومێـد بـبێ لـە لێبـوردنی گوناهەكانی تەمەنیڕابردووی، بۆیێ ئـەم جـارە دەسـت بـە دڵدانـەوەی نەفسـی خـۆی دەكا و ئومێدی شەفاعەتی پێغەمبەریﷺ دەداتیو دەفەرموێ:

(إِنْ آتِ ذَنْباً) ئەگـەر لـە دوای تۆبـەكـردنم لـە گوناهـەكانـیڕابـردووم، ئـەم جـارەش

گوناهێکیتر بکەم، هێشتا (فَمَا عَهْدِي بِمُنْتَقِضٍ) بەو گوناهە پەیمانی من–کە ئیمانداریمە– هەڵوەشاوە نیە (مِنَ النَّبِيِّ ﷺ) لە پێغەمبەرﷺ.

(وَ) هەروەها بەو گوناهە (لا حَبْلِي) پەیوەندیشم لەگەڵ پێغەمبەرﷺ–کە ئوممەتی ویم–(بِمُنْصَرِمٍ) پچڕاو نیە، چونکە من هەر ئیماندارمو هیچ کوفرێکشم نەکردوەو بە گوناهکردنیش لە ئوممەتی پێغەمبەرﷺ ناچمە دەرەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ثَلاثٌ مِنْ أَصْلِ الْإِيمانِ: اَلْكَفُّ عَمَّنْ قالَ: لاإِلَهَ إِلاَّاللهُ، وَلا نُكَفِّرُهُ بِذَنْبٍ وَلاَ نُخْرِجُهُ مِنَ الإِسْلاَمِ بِعَمَلٍ...﴾الحديث، رواه أبوداود بسند صحيح، سێ شت لە بنچینەی ئیمانن، یەکێکیان: وازهێنانە لەو کەسەی شادەی هێناوە، بە هیچ گوناهێك کافری نەکەینو بە هیچ کردەوەیەك لە جوغزی ئیسلام دەری نەکەین.

ئینجا کە لە(بَيْت)ی ڕابردوودا ئیمامی (الْبُوصِيرِي) فەرمووی: پەیوەندیم لەگەڵ پێغەمبەرﷺ نەپچڕاوە. ئەم جارە زیاتر باسی پەیوەندیەکەی دەکا و دەفەرموێ:

(فَإِنَّ لِي ذِمَّةً) بەڕاستی من پەیمانێکی دڵنیاییم هەیە (مِنْهُ) لە پێغەمبەرﷺ (بِتَسْمِيَتِي) بە هۆی ناولێنانم بە (مُحَمَّداً) وەك ناوی پێغەمبەرﷺ.

واتە: کە ناوی (مُحَمَّد)م لێندراوە، دیارە پێغەمبەرمﷺ خۆش دەوێو بەو ناوەشم خۆشحاڵم، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿سَمُّوا بِاسْمِي وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي﴾ رواه البخاري ومسلم، ناوی من لە منداڵەکانتان بنێن، بەڵام (كُنْيَة)ی من بۆ خۆتان دامەنێن.

واتە: ناسناوی (أَبُوالْقاسم) بۆ خۆتان دامنێن.

(وَهُوَ) پێغەمبەرﷺ (أَوْفَى الْخَلْقِ) لە هەموو خەڵکێك وەفادارترە (بِالذِّمَمِ) بۆ بەجێهێنانی پەیمانەکان، واتە: پێغەمبەرﷺ بەخۆی فەرموویەتی: ﴿الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ﴾ رواه البخاري ومسلم، مرۆڤ لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە لە دونیادا خۆشی ویستووە.

کەواتە: منیش پێغەمبەرمﷺ خۆش دەوێو دڵنیام: لەڕۆژی قیامەت بە هۆی ئەو خۆشویستنە شەفاعەتم بۆ دەکاو ڕزگار دەبم.

جا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی ڕابردوودا فەرمووی: پێغەمبەرﷺ لە هەموو کەسێك وەفادارترە بۆ بەجێهێنانی پەیمانەکان. ئەم جارە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: کە ئەویش وەکو موسوڵمانەکانیتر چاوەڕوانی بەجێهێنانی ئەو پەیمانە دەکا، چونکە زۆر پێویستی بە شەفاعەت هەیەو دەفەرموێ:

إنْ لَمْ يَكُنْ فِي مَعادِي آخِذاً بِيَدِي (١٤٧) فَضْلاً وَّإلاَّ فَقُلْ يَا زَلَّةَ الْقَـــدَمِ
حَاشَاهُ أَنْ يُحْرِمَ الرَّاجِي مَكارِمَـــهُ (١٤٨) أَوْ يَرْجِعَ الْجارُ مِنْهُ غَيْرَ مُحْتَرَمِ

**(إنْ لَمْ يَكُنْ)** ئەگەر ئەوە نەبێ **(فِي مَعادِي)** لە زیندووبوونەوەی قیامەتم **(آخِذاً بِيَدِي)** پێغەمبەرﷺ دەستم نەگرێو شەفاعەتم بۆ نەکا **(فَضْلاً)** لە گەورەیی و چاکەی خۆی، هەم **(وَإلاَّ)** لە بەر ئەو پەیمانەی لەگەڵ ئەویم هەیە: کە ئیماندارمو ئوممەتی ویم، ئەویش پەیمانی داوەو فەرموویەتی: ﴿لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ مُسْتَجَابَةٌ، فَتَعَجَّلَ كُلُّ نَبِيٍّ دَعْوَتَهُ، وَإِنِّي إِخْتَبَأْتُ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لِأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيامَةِ، فَهِيَ نَائِلَةٌ-إِنْ شَاءَ اللهُ- مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لاَ يُشْرِكُ بِاللهِ شَيْئاً﴾ رواهُ البُخاری ومُسلم، هەر پێغەمبەرێك دوعایەکی قبوڵکراوی هەیەو لە دونیادا دوعایەکەی خۆی کردوە، منیش دوعایەکەی خۆم هێشتۆتەوە تاکو ببێتە شەفاعەت بۆ ئوممەتم لە ڕۆژی قیامەت، ئەم شەفاعەتەی من-إنْ شاءَ اللهُ- گشت کەسێك لە ئوممەتم ئەگرێتەوە بەو مەرجەی بە ئیمانەوە مردبێ و هاوبەشی بۆ خوا دانەنابێ.

جا ئەگەر پێغەمبەرﷺ شەفاعەتم بۆ نەکا، ئەو کاتە **(فَقُلْ)** هاواری بەدبەختی بکەو بڵێ: **(يَا زَلَّةَ الْقَدَمِ)** ئای هاوار لە بەر هەڵخلیسکانی پێیەکانم لە سەر پردی جەهەننەمو کەوتنە خوارەوەم بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.

جا کە ئیمامی **(الْبُوصِيرِي)** لە **(بَيْت)**ی ڕابردوودا فەرمووی: ئەگەر پێغەمبەرﷺ شەفاعەتم بۆ نەکا، دەبێ هاواری بەدبەختی بکەم. ئەم جارە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: کە ئەو ئەگەرە لە پێغەمبەرﷺ چاوەڕوان ناکرێو دەفەرموێ:

**(حَاشَاهُ)** پێغەمبەرﷺ پاكو بەرییە لەوەی **(أَنْ يُحْرِمَ)** بێبەش بکا **(الرَّاجِي)** ئەو کەسەی تکای لێدەکا **(مَكارِمَهُ)** ڕێزی لێبنێو شەفاعەتی بۆ بکا **(أَوْ)** یان **(يَرْجِعَ)** بگەڕێتەوە **(الْجارُ)** ئەو کەسەی تکای پاراستنی لێدەکا **(مِنْهُ)** لە لای پێغەمبەرەوەﷺ **(غَيْرَ مُحْتَرَمٍ)** بە بێ ڕێزلێنان.

واتە: پێغەمبەرﷺ ئەوەندە گەورەو ڕێزدارە: پاکە لەو عەیبەی تکای تکاکار ڕەد بکاتەوەو ڕێز لەو کەسە نەنێ: کە تکای پاراستنی لێدەکا ﴿عَنْ جابِرٍ رضي الله عنه: مَا سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ شَيْءٍ قَطُّ فَقالَ: لاَ﴾ رواه البخاري ومسلم، پێغەمبەرﷺ هەرشتێکی لێ داوا کرابا، هەرگیز نەیدەفەرموو: نا.

جا کە پێغەمبەرﷺ خاوەنی ئەو ڕەوشتە جوانەو ئەو شەفاعەتە زۆرە بێ، دڵنیام ئێمەش بە دڵشکاوی ناگەڕێندرێینەوە.

وَمُنْذُ أَلْزَمْتُ أَفْكارِى مَدائحَــهُ (١٤٩) وَجَــدْتُهُ لخَــلاصى خَيْرَ مُــلْتَزِمٍ
وَلَنْ يَفُوتَ الْغنى منْهُ يَداً تَرِبَتْ (١٥٠) إنَّ الْحَــيَا يُنْبتُ الأَزْهارَ فِى الأَكَمِ

---

جا لەوانەیە کەسێك لە ئیمامی (البُوصِيرِي) بپرسێ: تۆ-بەخۆت-هیچت لە پێغەمبەرﷺ داوا کردوە، ئەویش بۆی جێبەجێ کردبێ؟ جا ئیمامی (البُوصِيرِي) وەڵام دەداتەوە:

بەڵێ، (وَمُنْذُ) لەو کاتەوە (أَلْزَمْتُ أَفْكارِى) بە پێویستم داناوە لە سەر بیر و ئەندێشەکانی خۆم (مَدائِحَهُ) مەدحو ستایشەکانی پێغەمبەرﷺ، لەو کاتەوە (وَجَدْتُهُ) پێغەمبەرمﷺ دیتووەو دەستم کەوتووە (لِخَلاصِى) بۆ ڕزگاربوونم لە گشت بەلایەك (خَيْرَ مُلْتَزِمٍ) چاکترین بەجێهێنەر و وەفادار بووە.

واتە: لەو ڕۆژەوە کە دەستم بە مەدحی پێغەمبەرﷺ کردوە، پێغەمبەرﷺ بۆ ڕزگارکردنی من، چاکترین وەفادار و فریاکەوتە بووە.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ تووشبوونی بە دەردی ئیفلیجیو دانانی ئەم قەسیدەیە: کە پێغەمبەرﷺ لە خەوندا پەشتەماڵەکەی خۆی لێوەرپێچا و خوای گەورە شیفای بۆ نارد، هەروەك لە سەرەتادا باسم کرد.

جا ئەم جارە ئیمامی (البُوصِيرِي) باسی ئەوەمان بۆ دەکا: کە شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ ئەوەندە زۆرە: بەشی هەموو کەسێکی موسوڵمان دەکا، هەروەك دەفەرموێ:

(وَلَنْ يَفُوتَ الْغِنَى) نافەوتێو لەدەست ناچێ دەوڵەمەندبوون (مِنْهُ) بە شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ (يَداً تَرِبَتْ) لە دەست ئەو کەسەی زۆر زۆر پێویستەو کردەوەی باشی کەمە، چونکە شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ گشت موسوڵمانێك دەگرێتەوە، هەروەك (إِنَّ الْحَيَا) بارانی سودبەخش (يُنْبِتُ الأَزْهارَ) کڵۆکان دەڕوێنێ (فِى الأَكَمِ) لە سەر تەپۆڵکەکان، هەرچەند ئاویشیان لە سەر ڕاناوەستێ.

واتە: گشت موسوڵمانێك لە ڕۆژی قیامەت بە شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ دەوڵەمەند دەبێ، هەرچەند کردەوەی باشیشی کەم بێ، چونکە شەفاعەتەکەی گشتییە، هەروەك بارانی گشتی سودی بۆ کڵۆکەکانی سەر تەپۆڵکەکانیش هەیە، هەرچەند ئاویشیان لێڕاناوەستێ. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنِّي لَأَشْفَعُ يَوْمَ الْقِيامَة لـأَكْثَرَ مِمّا عَلَى وَجْه الأَرْضِ مِنْ شَجَرٍ وَحَجَرٍ وَمَـدَرٍ﴾حديث حسن رواه الإمام أحمد، لە ڕۆژی

وَلَمْ أُرِدْ زَهْرَةَ الدُّنْيا الّتي اقْتَطَفَتْ (١٥١) يَدا زُهَـيْرٍ بِمَا أَثْنَى عَـلَى هَـرِمِ

﴿ الْفَصْلُ الْعاشِرُ: فِي الْمُناجاةِ وَعَرْضِ الْحاجاتِ ﴾

يا أَكْرَمَ الْخَلْقِ مَالي مَنْ أَلُوذُ بِهِ (١٥٢) سِواكَ عِنْدَ حُلُولِ الْحادِثِ الْعَمِمِ

---

قیامەت من شەفاعەت دەکەم بۆ خەڵکێکی زۆرتر لەو درەختو بەرد و گڵمەتەی لە سەر ڕووی زەمینە.

جا لەوانەیە کەسێك لە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) بپرسێ: ئایا تۆ بۆ وەدەستهێنانی کەلوپەلو پاداشتی دونیا مەدحی پێغەمبەرتﷺ کردوە، یان بۆ پاداشتی قیامەت؟

ئەویش وەڵام دەداتەوە:

من بۆ پاداشتی قیامەت مەدحی پێغەمبەرمﷺ کردوەو (وَلَمْ أُرِدْ) بەو مەدحەم نەمویستووە (زَهْرَةَ الدُّنْيا) کڵۆکی دونیا، واتە: نەمویستووە جوانیو خۆشی دونیام دەست بکەوێ (الّتي) ئەو کڵۆکەی (اقْتَطَفَتْ) کە جنیتیو وەریگرتووە (يَدا زُهَيْرٍ) هەردوو دەستەکانی (زُهَيْر)ی شاعیر، کە زۆر پارەو کەلوپەلی دونیای وەرگرت (بِما أَثْنَى) لە بەرامبەر ئەو مەدحەی کردبوی (عَلَى هَرِمٍ) لە سەر (هَرِم بن سنان) کە دەوڵەمەندێکی عەرەبی سەردەمی خۆی بوو، (زُهَيْر)ی شاعیریش مەدحی دەکرد، ئەویش لە بەرامبەر مەدحکردنەکە پارەی دەدایێ.

مەبەستی ئیمامی (الْبُوصِيرِي) ئەوەیە: من وەك ئەو شاعیرە کەلوپەلی دونیام مەبەست نیە، بەڵکو بۆ پاداشتی قیامەت مەدحی پێغەمبەرمﷺ کردوە.

## ﴿ اَلْفَصْلُ الْعاشِرُ: فِي الْمُناجاةِ وَعَرْضِ الْحاجاتِ ﴾

## ﴿ بەشی دەیەم: لە باسی پاڕانەوەو دەرخستنی پێویستیەکان ﴾

ئینجا کە ئەم قەسیدەیە نزیکی کۆتایی بوو، دووبارە ئیمامی (الْبُوصِيرِي)—بە دواندنی ڕووبەڕوو— تکای شەفاعەت لە پێغەمبەرﷺ دەکا و دەفەرموێ:

(يا أَكْرَمَ الْخَلْقِ) هۆ ڕێزدارترینی دروستکراوی خوا، واتە: هۆ پێغەمبەرﷺ چونکە بە (إِجْماع)ی هەموو زانایانی ئیسلام: پێغەمبەرﷺ لە هەموو دروستکراوێکی خوا ڕێزدارترە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَنا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيامَةِ﴾رواه البخاري ومسلم، من گەورەی هەموو خەڵکم لە ڕۆژی قیامەتدا.

*—حەدیسەکەی ڕابردووی ﴿أَبي مُوسَى الأَشْعَري رضي الله عنه في قِصَّة سَفَرِهِ ﷺ مَعَ عَمِّهِ إِلَى الشَّامِ...فَأَخَذَ الرَّاهِبُ بِيَدِهِ ﷺ وَقالَ: هذا سَيِّدُ الْعالَمِينَ هذا رَسُولُ رَبِّ الْعالَمِينَ...﴾

الحديث، حسن رواه الترمذي والبيهقي، وقال الحاكم: حديث صحيح، كه پێغەمبەرﷺ لەگەڵ مامی خۆی بە سەفەر چووە (شام)، ڕاهیبەکە دەستی پێغەمبەریﷺ گرت و گوتی: ئەمە گەورەی هەموو عالەمە، ئەمە پێغەمبەری پەروەردگاری عالەمە.

*-هەم ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاس رضي الله عنهما: أنَّ رَجُلاً ذَكَرَ أبَا الْعَبَّاس فنالَ مِنْهُ فَلَطَمَهُ الْعَبَّاسُ فَاجْتَمَعُوا فَقالُوا: وَالله لَنَلْطمنَّ الْعبَّاس كَما لَطَمَهُ. فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللهﷺ فَخَطَبَ فَقالَ: (مَنْ أكْرَمُ النَّاسِ؟ فَقالُوا: أنْتَ يَا رَسُولَ الله)...﴾الحديث، صحيح رواه الإمام أحمد والنسائي والحاكم، پیاوێك بە خراپە باسی باوكی ئیمام (العَبّاس)ی كرد-كە دەكاتە باپیری پێغەمبەرﷺ- جا ئیمام (العَبّاس)ﷺ لەپەدەستێكی لە دەمو لوتی پیاوەكە دا، جا خزمەكانی لێدراوەكە ویستیان لە ئیمام (العَبّاس)ﷺ بدەن، جا پێغەمبەرﷺ وتارێكی دا و فەرمووی: (كێ لە هەموو كەسێك ڕێزدارترە؟ گوتیان: تۆ-ئەی پێغەمبەری خوا- لە هەموو كەسێك ڕێزدارتری)...تا كۆتایی حەدیسەكە.

**جا بزانە:** دروستە-بە دواندنی ڕووبەڕوو- لە دوای وەفاتیش بانگی پێغەمبەرﷺ بكرێ، بە بەڵگەی حەدیسەكەیڕابردووی (مالك الدَّار) كە فەرموی: ﴿أصابَ النَّاسَ قَحْطٌ في زَمنِ عُمرﷺ، فجاءَ رَجُلٌ-وهُوَ بلاَلُ بنِ الْحَرْثِ الْمُزنيُّ الصَّحابيُّﷺ- إلَى قَبْرِ النَّبيِّﷺ فَقالَ: يَا رَسُولَ الله إسْتَسْقِ لأُمَّتكَ فَإنَّهُمْ قَدْ هَلَكُوا...﴾الحديث، صحيح رواه البيهقي وابن أبي‌شيبة بإسناد صحيح، وذكره الحافظ العسقلاني في (فتح الباري، باب الإستسقاء)، والحافظ ابن كثير في (البداية والنهاية، عام الرّمادة)، لە سەردەمی ئیمام (عُمَر)ﷺ لە (عام الرَّمادَة)دا قاتیو بێبارانی توشی خەڵك بوو، (صَحابَة)یەك-كە (بِلاَل بنِ الْحَرْثِ الْمُزَنِيُّ) بووﷺ- هاتە سەر گۆڕی پێغەمبەروﷺ گوتی: (يَا رَسُولَ الله) دوعای باران بۆ ئوممەتت بكە، چونكە بە هیلاك چون...تا كۆتایی حەدیسەكە.

(**مَالي مَنْ**) هیچ كەسێكم نیە (**ألُوذُ بِه**) پەنای بۆ ببەم تكای پاراستنی لێبكەم (**سِواكَ**) جگە لە تۆ-ئەی پێغەمبەرﷺ- (**عِنْدَ حُلُولِ الْحادِثِ**) لە كاتی هاتنی ڕووداوەكەی (**الْعَمِمِ**) گشتیی قیامەت، كە هەموو كەسێك دەگرێتەوە.

واتە: لە كاتی هاتنی وەستانی مەیدانی (مَحْشَر)، كە موسوڵمان و كافر گشتیان وێكڕا لەو مەیدانە ڕادەگیرێن، جگە لە تۆ-ئەی پێغەمبەرﷺ- هیچ كەسێكیترم دەست ناكەوێ پەنای بۆ ببەم: تاكو شەفاعەتم بۆ بكا، چونكە پێغەمبەرەكانیتریش ناوێرن لە مەیدانی (مَحْشَر)دا شەفاعەت بكەن.

جا ئەمەش ئاماژەيە بۆ ئـەم حەديسـە: ﴿عَنْ أنس بن مَالكٍ رضي الله عنه: عَن النَّبي ﷺ: يَجْمَعُ اللهُ النَّاس يوْمَ الْقيامة، فَيَهْتَمُّون لذلكَ فَيقُولُون: لو اسْتَشْفَعْنَا إلى رَبِّنا حَتَّى يُريحَنا مِـــنْ مَكَانِنَا هذَا. قَالَ: فَيأْتُونَ آدَمَ. ثُمَّ نُوحًا. ثُمَّ إبْراهيم. ثُمَّ مُوسَى. ثُـــمَّ عيسَـــى عليهم الصلاة والسلام...وكُلُّ واحد منْهُم يَقُولُ: لسْتُ هُناكُمْ. قال النَّبيُّ ﷺ: فَيأْتُوني فَأَسْـــتَأْذِنُ رَبِّـــي فَيُؤْذَنُ لي...﴾ الحديث بتمامه رواهُ البخاري ومُسْلم، خـواى گـەورە ئـەم خەڵكـە لـە مەيـدانى (مَحْشَر) كۆ ئەكاتەوە، جا هەوڵ ئەدەنو ئەڵێن: وا باشـە داواى تكـا بكـەين لـە لاى خوا، تاكو لەم ڕاوەستانە بمانحەسێنێتەوە. جا ئەچنە لاى حەزرەتى باب (آدَم)و (نُـوح)و (إبْراهِيم)و (مُوسَى)و (عِيسَى)عليهم الصلاة والسلام، تاكو لـە لاى خوا تكايان بۆ بكەن، جا هـەر يەكەيان ئەڵێ: من لەو پلەيە نيم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: ئينجا دێنـە لاى مـن، منـيش ئيزن لـە خوا وەرئەگرمو خوا ئيزنم ئەدا. واتە: تكايان بۆ ئەكەمو خـواى گـەورە تكـام وەرئەگرێو دادگاى (مَحْشَر) دەست پێ‌ئەكا.

ئينجا ئيمامى (الْبُوصيري) درێژە بە تكاى خۆى دەدا و دەفەرموێ:

**(وَلَنْ يَّضيقَ)** بەرتەسك نـابێ ـ**(رَسُولَ الله)** هـۆ پێغەمبـەرى خـوا ﷺ ـ **(جاهُكَ)** ڕێزدارىو پلەو پايە بەرزى تۆ **(بِي)** لە من، واتە: ڕێزدارىو پلەوپايـەى پێغەمبـەر ﷺ بەرتەسك نيە، بەڵكو بەرفراوانـەو بەشـى منـيش دەكـا: تـاكو شـەفاعەتم بـۆ بكـا **(إذا الْكَرِيمُ)** لەو كاتەى لە ڕۆژى قيامەت، خواى گەورە **(تَحلّى)** ناو لە خۆى دەنێ **(بِاسْمِ مُنْتَقِمِ)** بە ناوى تۆڵەسێن=سزادەر.

واتە: لـەو كاتـەى لـە ڕۆژى قيامـەت، خـواى گـەورە دەيـەوێ سـزاى تاوانبـاران بـدا و دەفەرموێ: ﴿...أنا الْمَلكُ أنَا الدَّيَّانُ﴾ رواه البخاري، زاد الإمام أحمد بإسناد حسن: ﴿وَلا يَنْبغي لأحَدٍ منْ أَهْلِ النَّارِ أنْ يَدْخُلَ النَّارَ ولَهُ عنْدَ أحَد منْ أَهْلِ الْجنَّة حَقٌّ، حَتَّى أُقِصَّهُ منْهُ...﴾ الحديث، من مەليكم من تۆڵەسێنم، نابێ هيچ كەسێك لە دۆزەخيان بچـێتە دۆزەخ، لــەو حاڵەتەى مافێكى لـە سەر كەسێكى بەهەشتى هەبێ، تا تۆڵەى مافەكەى بۆ دەسـێنم لــە بەهەشتيەكە...

جا ئەگەر مرۆڤ مافى خەڵكيشى لە سەر نەبێ، لەو كاتەدا زۆر پێويستى بە شـەفاعەت هەيە: كە خواى گەورە فەرمان بە باب (آدم) ﷺ دەكـا و دەفەرمـوێ: ﴿أخْرِج بَعْــثَ النَّارِ: منْ كُلِّ أَلْفٍ تسْعَمِأَة وَتسْعَةً وتسْعِينَ. فَذاكَ حينَ يَشيبُ الصَّغيرُ (وَتَضَعُ كُلُّ ذَات

حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللهِ شَدِيدٌ)الحج: ٢...﴾ رواه البخاري ومسلم، كۆمەڵی دۆزەخیان لە ناو نەتەوەكەی خۆت دەركە دەرەوە: لە هەر هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆ كەس دەركە دەرەوە بۆ دۆزەخ. جا لەم ڕۆژەدا منداڵ مووی سەری سپی دەبێو گشت گیانلەبەرێكی ئاوس بەر داوێو دەبینی خەڵك سەرخۆشن، لە ڕاستیدا سەرخۆش نین، بەڵام عەزابی خوا زۆر بەهێزە.

ئینجا كە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) باسی ڕێزداریو گەورەیی پێغەمبەریﷺ كرد: كە هەر ئەو تاكە هیوا و ئومێدی ڕۆژی قیامەتە. ئەم جارە باسی ئەوەمان بۆ دەكا: كە ئێمەی موسوڵمان لە بەر خاتری پێغەمبەرﷺ بەختەوەر دەبین: هەم لە دونیا و هەم لە قیامەت. جا دەفەرموێ:

**(فَإِنَّ مِنْ جُودِكَ)** بەڕاستی-ئەی پێغەمبەرﷺ- بەشێكی خاتری تۆیە **(الدُّنْيَا)** چاكەی دونیا و هەم **(وَضَرَّتَها)** چاكەی هەوێی دونیا كە قیامەتە.

واتە: ئەو چاكەو نیعمەتانەی خوای گەورە لە دونیادا داویەتیە ئێمەی موسوڵمانو هەم ئەو چاكەیەش كە لە قیامەت پێمان دەبەخشێ، هەردووكیان لە بەر خاتری پێغەمبەرەﷺ، چونكە لە دونیادا و لە قیامەتدا پێغەمبەرﷺ بۆ ئوممەتی خۆی پاڕاوەتەوەو خوای گەورە پاڕانەوەی قبوڵ كردوە:

**١-لە دونیادا:** ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّﷺ تلا قَوْلَهُ تعالَى: (رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيراً...)الآيَةَ، وقَوْلَهُ تعالَى: (إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبادُكَ...)الآيَة، فَرَفَعَﷺ يَدَيْهِ وَقالَ: اللَّهُمَّ أُمَّتِي، أُمَّتِي. وَبَكَى...فَقالَ اللهُ تعالَى: يا جِبْرِيلُ اذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ فَقُلْ: إِنَّا سَنُرْضِيكَ فِي أُمَّتِكَ وَلا نَسُوءُكَ﴾رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ ئەو دوو ئایەتانەیڕابردووی خوێندنەوە، جا دەستەكانی بەرز كردنەوەو دوعای كرد و فەرمووی: خودایە ئوممەتی من، ئوممەتی من. واتە: ڕەحم بە ئوممەتی من بكە. جا پێغەمبەرﷺ گریا...جا خوای گەورە فەرمووی: (جِبْرائِيل) برۆ لای (مُحَمَّد)ﷺ پێی بڵێ: لەبارەی ئوممەتت ڕازیت دەكەینو دڵتەنگت ناكەین. واتە: ڕەحم بە هەموو ئوممەتت دەكەین.

**٢-لە قیامەتدا:** لە دوای قبوڵبوونی شەفاعەتە گەورەكەی مەیدانی (مَحْشَر)، پێغەمبەرﷺ بە تایبەتی بۆ ئوممەتی خۆی دەپاڕێتەوەو فەرموویەتی: ﴿...فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَقُولُ: يا رَبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي. فَيُقالُ: يا مُحَمَّدُ أَدْخِلِ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِكَ مَنْ لا حِسـاب

عَلَيْه مِنَ الْبَابِ الأَيْمَنِ مِنْ أَبْوابِ الْجَنَّة، وَهُمْ شُركاءُ النَّاسِ فِي ماسِوَى ذَلِكَ مِنَ الْأَبْوابِ...﴾ الحديث، رواه البخاري ومسلم، جا سەری خۆم بەرز دەکەمەوەو دەڵێم: هۆ خودای من، ئوممەتی من، ئوممەتی من. واتە: ڕەحم بە ئوممەتی من بکە. جا پێم دەگوترێ: هۆ (مُحَمَّد) ئەوانەی لە ئوممەتی تۆ لێپێچانەوەیان لە سەر نیە، لە دەرگای ڕاستەی بەهەشتەوە بیانبە ناو بەهەشت، ئەوان جگە لەو دەرگایەش هاوبەشی خەڵکن لە دەرگاکانی تری بەهەشت.

(وَ) هەروەها-ئەی پێغەمبەرﷺ-(مِنْ عُلُومِكَ) بەشێکی زانستەکانی تۆیە (عِلْمُ اللَّوْحِ وَالْقَلَمِ) ئەو زانستەی قەڵەم لە (اللَّوْحِ الْمَحْفُوظِ)دا نووسیویەتی.

واتە: پێغەمبەرﷺو (اللَّوْحِ) هەردووکیان دروستکراوی خودان، بەڵام پێغەمبەرﷺ لە (اَللَّوْحِ)و (الْقَلَمِ) گەورەترە، هەم ئەو زانستەی خوا بە (وَحْي) داویەتیە ئەم دروستکراوە-کە پێغەمبەرەﷺ- زیاترە لەو زانستەی بە فەرمانی خوا (الْقَلَمِ) لە (اللَّوْحِ)دا نووسیویەتی؟ چونکە زانستی (اللَّوْحِ) زانستێکی دونیاییەو بە کۆتایی دونیا زانستەکەی (اللَّوْحِ) کۆتایی دێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَوَّلُ مَا خَلَقَ اللهُ-تبارك وتعالى-اَلْقَلَمُ، فَقَالَ لَهُ أُكْتُبْ. قَالَ: يارَبِّ وَمَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: أُكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ﴾ حديث صحيح رواه أبوداود، یەکەم شت کە خوا دروستی کرد، (قَلَمْ)= پێنووس بوو، جا پێی فەرموو: بنووسە. (قَلَمْ) گوتی: خوایە چی بنووسم؟ فەرمووی: ئەندازەی هەموو شتێك بنووسە تا دونیا وێران ئەبێ.

بەڵام زانستی پێغەمبەرﷺ دونیاییو قیامەتییەو بە کۆتایی دونیا کۆتایی نایێ، بە بەڵگەی ئەم حەدیسانە:

١-﴿عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه: قامَ فِينا النَّبِيُّﷺ مَقاماً فَأَخْبَرنا عَنْ بَدْإِ الْخَلْقِ حَتَّى دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ مَنازِلَهُمْ وأَهْلُ النَّارِ مَنازِلَهُمْ﴾رواه البخاري، ئیمام (عُمَر)رضي الله عنه فەرمووی: پێغەمبەرﷺ لە ناوماندا هەڵسا ڕاوەستا وتاری بۆ داین، جا لە سەرەتای دروستکردنی بوونەوەرەوە بۆی باس کردین، تا بەهەشتیەکان چوونە شوێنی خۆیان، دۆزەخیش چوونە شوێنی خۆیان. واتە: پێغەمبەرﷺدوای دونیا وێرانبوونیشی بۆ(صحابَة)کان باس کردوە.

٢- لە حەدیسە درێژەکەی (الْمَلأُ الأَعْلَى)دا پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: خوای گەورە لێی پرسیم: ﴿فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: لا أَدْرِي رَبِّ. قَالَهَا ثَلاثًا، قَالَﷺ:

فَرَأَيْتُهُ وَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ أنَامله بَيْنَ ثَدْيَيَّ فَتَجَلَّى لِي كُلُّ شَيْءٍ وَعَرَفْتُ...﴾ رواه الترمذي وقال: حديثٌ حسنٌ صحيحٌ، لە چیدا (مَلائِکَة)ی پایە بەرز کێشە دەکەن؟ گوتم: نازانم خودای من. سێ جار وەهای فەرموو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: جا دیتم خوای گەورە دەستی خۆی لە نێوان هەردوو شانەکانم دانا، تا هەستم بە ساردایی پەنجەکانی کرد لە نێوان هەردوو مەمکەکانم، (واتە: خوای گەورە زانستی خۆی خستەناو دڵی من، تا هەستم بە ئاسەواری زانستەکە کرد لە ناو دڵمدا)، جا هەموو شتێکم بۆ ئاشکرا بوو و هەموو شتێکم زانی.

٣-پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أُوتِيتُ مَفَاتِيحَ كُلِّ شَيْءٍ إلاَّ الْخَمْسَ: (إنَّ اللهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَداً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إنَّ اللهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) لقمان:٣٤﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد والطبراني وأبويعلى، کلیلەکانی زانستی هەموو شتێکم دراونێ، تەنها پێنج (غَیب)= پەنهانەکان نەبێ، کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی کردون: (زانستی کاتی دونیا وێرانبوون لە لای خوایە، هەر خوا بارانی سودبەخش ئەبارێنێ، هەر خوا ئەزانێ چی لە ناو منداڵدانەکاندایە-واتە چاکی و خراپی و هەبوونی و...هتد- وە هیچ کەسێك نازانێ سبەینێ چی ئەکا، وە هیچ کەسێك نازانێ لە کوێ ئەمرێ.

٤- هەرچەند قورئان لە (اللَّوْح)دا نووسراوە، بەڵام پێغەمبەرﷺ قورئانو زیاتریش لە قورئان، فەرموودەیتری بە (وَحْي) بۆ هاتون، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَلا وَإنِّي أُوتِيتُ الْقُرْآنَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ﴾ حديث صحيح رواه الإمام أحمد وأبوداود، ئاگادار بن: من قورئانم دراوەتێو وێنەی قورئانیش زانستیترم لەگەڵ قورئان دراوەتێ.

واتە: ئەو زانستانەی جگە لە قورئان خوای گەورە بە (وَحْي) بۆ پێغەمبەریﷺ ناردونو پێیان دەگوترێ: (الْحَدِيث)=فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ.

ئینجا کە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) تکای شەفاعەتی لە پێغەمبەرﷺ کرد، ئەم جارە دڵی خۆی دەداتەوە: تاکو لە ڕەحمەتی خوا بێئومێد نەبێو دەفەرموێ:

(يَا نَفْسُ) ئەی (نَفس)ی من (لا تَقْنَطِي) بێئومێد مەبە لە ڕەحمەتی خوا (مِنْ زَلَّةٍ) بە هۆی گوناهێك، هەرچەند (عَظُمَتْ) گوناهەکەش گەورە بێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهِ إنَّ اللهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾الزمر:٥٣، ئەی

بەندەكانی من بێئومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، چونكە خوای گەورە لە هەموو گوناهەكان خۆش دەبێ.

جا كە خوای گەورە لە هەموو گوناهەكان خۆش ببێ، ئەو كاتە (**إِنَّ الْكَبائِرَ**) بەڕاستی گوناهە گەورەكان (**فِي الْغُفْرانِ**) لە بەرامبەر لێخۆشبوونی خوادا (**كَاللَّمَمِ**) وەكو گوناهە بچوكەكانن، بەو مەرجەی گوناهەكە كافربوون نەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَــــاءُ﴾ النساء:٤٨، خوا لەوە خۆش نابێ كە هاوبەشی بۆ دابندرێ، وە لە گوناهەكانی لە (كُفْر) بەرەو خوارتر خۆش ئەبێ، ئەگەر بە خۆی حەز بكا لە كەسێك خۆش ببێ.

ئینجا كە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) دڵی خۆی داوەو فەرمووی: بێئومێد مەبە لە ڕەحمەتی خوا. لەوانەیە بیركردنەوەیەكی بڵێ: بێئومێد نابم، بەڵام دەترسم ڕەحمەتی خوا هەموو گوناهەكانم نەگرێتەوە؟ جا وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

(**لَعَلَّ رَحْمَةَ رَبِّي**) تكام وایە: ڕەحمەتی خودای من (**حِينَ يَقْسِمُها**) لەو كاتەی لە ڕۆژی قیامەت بە سەر گوناهباراندا بەشی دەكا (**تَأْتِي**) ڕەحمەتەكە بۆ من بێ (**عَلَى حَسَبِ الْعِصْيانِ**) بەگوێرەی زۆری گوناهەكانم (**فِي الْقِسَمِ**) لە بەشكردنەكاندا.

واتە: بە ئەندازەی زۆری گوناهەكانم ڕەحمەتێكی زۆرم بەر بكەوێو گوناهەكانی گەورەو بچوكم بگرێتەوە.

جا بۆیێ ئەو تكایە دەكەم، چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ﴾الأعراف:١٥٦، ڕەحمەتی من بەرفراوانەو بەشی هەموو شتێك دەكا.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿جَعَلَ اللهُ الرَّحْمَةَ مِأَةَ جُزْءٍ، فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ جُزْءً وَأَنْزَلَ فِي الْأَرْضِ جُزْءً واحِداً، فَمِنْ ذَلِكَ الْجُزْءِ يَتَــراحَمُ الْخَلائِــقُ﴾رواه البخاري ومسلم، خوای گەورە ڕەحمەتی خۆی كردۆتە سەد بەش، جا نەوەدو نۆ بەشی لە لای خۆی هێشتۆتەوەو تەنها یەك بەشی دابەزاندۆتە سەر زەمین، جا بەو بەشە خەڵك ڕەحم بە یەكتری دەكەن.

واتە: بە نەوەدو نۆ بەشەكەی‌تریش لە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە ڕەحم بە بەندەكانی خۆی دەكا، إن شاء الله ئێمەش بێبەش نابین لەو ڕەحمەتە زۆرانە.

ئینجا كە ئیمامی (الْبُوصِيرِي) لە (بَيْت)ی‌ڕابردوودا تكای كرد: ڕەحمەتی خوا

يا رَبِّ وَاجْعَلْ رجائي غَيْرَ مُنْعَكِسٍ (١٥٧) لَدَيْكَ وَاجْعَلْ حسابي غَيْرَ مُنْخَرِمِ
وَالْطُفْ بِعَبْدِكَ في الدّارَيْنِ إنّ لَهُ (١٥٨) صَبْراً مَتَى تَدْعُهُ الْأَهْوالُ يَنْهَزِمِ

بە ئەندازەی زۆری گوناهەکان بێ. ئەم جارە لە خوا دەپاڕێتەوە: ئەو تکایەی وەربگرێو سەرشۆڕی نەکا. جا دەفەرموێ:

(**يا رَبِّ**) هۆ خودای من (**واجْعَلْ رجائي**) تکای من بۆ ڕەحمەتی تۆ، وا لێبکە (**غَيْرَ مُنْعَكِسٍ**) بە پێچەوانەی ئومێدی من نەبێ (**لَدَيْكَ**) لە لای تۆ، بەڵکو بەگوێرەی ئومێدو بۆچوونی من بێ بەرامبەر ڕەحمەتی تۆ، کە هیوادارم لێم خۆش ببی.

(و) هەروەها خودای من (**اجْعَلْ حسابِي**) بیروباوەڕی من بە لێبوردنی تۆ وا لێبکە (**غَيْرَ مُنْخَرِمٍ**) نەپچڕاو بێ بە بەردەوامی. واتە: بەردەوام بیروباوەڕم ئەوها بێ: تۆ خوایەکی بە ڕەحمیو لێم دەبوری، چونکە -ئەی خوایە- بەخۆت لە حەدیسی (قُدْسی)دا دەفەرموی: ﴿أنا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدي بي﴾رواه البخاري ومسلم، من لە لای بیرو بۆچوونی بەندەی خۆمم بەرامبەر بە من.

واتە: ئەگەر باوەڕی وا بێ: لەگەڵی بە ڕەحم دەبم. ئەوە ڕەحمی پێدەکەم، ئەگەر باوەڕیشی وا بێ: ڕەحمی پێناکەم. ئەوە ڕەحمی پێناکەم.

بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لا يمُوتُ أحدُكُمْ إلاّ وهُوَ يُحْسِنُ الظّنَّ باللهِ تَعالَى﴾ حديث صحيح رواه ابوداود، کەستان نەمرێ، تا بیرو بۆچوونی خۆی بەرامبەر بە خوا جوان دەکا. واتە: باوەڕی وابێ: خوا ڕەحمی پێدەکا و لێی خۆش دەبێ.

ئینجا ئیمامی (البُوصيري) کۆتایی بە دوعایەکانی خۆی دێنی و دەفەرموێ:

(**والْطُفْ**) خودایە بە سۆزیو میهرەبانی بە کار بێنە (**بِعَبْدِكَ**) لەگەڵ بەندەی خۆت: (مُحَمَّد البُوصيري)ی دانەری ئەم قەسیدەیە.

هەروەها خودایە بەسۆزیو میهرەبانی بە کار بێنە لەگەڵ بەندەی خۆت (عَبْدالله هەرتەلی)ی ڕوونکەرەوەی ئەم قەسیدەیە.

جا ئەی خودایە بە سۆزیو میهرەبانی بە کار بێنە لەگەڵ بەندەی خۆت (**في الدّارَيْنَ**) لە دونیاو لە قیامەت، چونکە (**إنّ لَهُ صَبْراً**) بەندەی تۆ ئارامیو خۆڕاگریەکی ئەوەندە بێهێزی هەیە (**مَتَى تَدْعُهُ الْأَهْوالُ**) هەر کاتێك بەڵاو ڕووداوە گەورەو بە ترسەکان داوای بکەنو توشی بێن (**يَنْهَزِمِ**) خۆڕاگریەکەی نامێنیو هەڵدێ.

بۆیێ زۆر پێویستیم بە یارمەتیو چاکەی تۆ هەیە ئەی خوای گەورەو میهرەبان، لێت

وأْذَنْ لسُحْبِ صَلاة مِّنْكَ دائمَة (١٥٩) عَلَى النَّبِــيِّ بِمُنْهَــلٍ وَمُنْسَــجمِ
مَا رَنَّحَتْ عَذَبَات الْبَانِ رِيحُ صَبا (١٦٠) وَأَطْرَبَ الْعِيسَ حَادي الْعِيسِ بِالنَّغَمِ

دەپاڕێمەوە بەم دوعایەی سبەینانو ئێواران، کە پێغەمبەرﷺ دەیکرد: ﴿اللَّهُمَّ إنِّى أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعافِيَةَ فِى الدُّنْيا وَالْآخرَة، اَللَّهُمَّ إنِّى أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعافِيَةَ فِــى دِينــى وَدُنْيايَ وَأَهْلِى وَمالِى، اَللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْراتِى وَآمِنْ رَوْعاتِى، اَللَّهُمَّ احْفَظْنِى مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِى، وَعَنْ يَمِينِى، وَعَنْ شِمَالِى، وَمِنْ فَوْقِى، وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِــكَ أَنْ أُغْتَــالَ مِــنْ تَحْتِى﴾ رواهُ أبوداود بسند صحيح، خودایە: من تکای لێبوردنو بێ بەلاّیت لێدەکەم لە دونیا و لە قیامەت، خودایە: تکای لێبوردنو بێبەلاّییت لێدەکەم لە ئاینم، لە دونیام لە خێزانو منداڵەکانم، لە ماڵم، خوادیە: عەیبەکانم داپۆشەو لە ترسەکان ئەمینو دڵنیام بکە، خوایە بمپارێزە: لە لای (پێشەوەم)، لە لای (پشتەوەم)، لە لای (ڕاستەم)، لە لای (چەپەم)، لە لای (سەرەوەم)، بە گەورەیی‌تۆ خۆم ئەپارێزم نەوەکو لە لای (خوارەوەم) بە فێڵ بکوژرێم.

ئینجا کە ئیمامی (البُوصِيرِي) کۆتایی بە دوعایەکانی خۆی هێنا، ئەم جارە دەستی بە سەلەوات لێدان کرد لە سەر پێغەمبەرﷺ، چونکە مەرجی قبوڵبوونی دوعا: سەلەوات لێدانە، هەروەك ئیمام (علي)ﷺ فەرموویەتی: ﴿كُلُّ دُعاء مَحْجُوبٌ حَتَّــى يُصَلِّيَ عَلَى مُحَمَّد وَآل مُحَمَّدﷺ﴾رواه الطبراني فى الأوسط، ورجاله ثقات، ﴿وَيُرْوَى مِثْلُهُ عَــنْ عُمَرﷺ﴾، گشت دوعایەك قەدەغەکراوە لە قبوڵبوون، تا دوعاخوێنەکە سەلەوات لێدەدا: لە سەر پێغەمبەرﷺو (آل)ی پێغەمبەرﷺ.

جا ئیمامی (البُوصِيرِي) سەلەوات لێدەدا و دەفەرموێ:

(وَأْذَنْ) خودایە فەرمان بکە (لِسُحْبِ صَلاةٍ) بە هەوری سەلاتو سەلام (مِنْكَ) ئەو سەلاتو سەلامە لە لای تۆوە بڕژێنە خوارەوە (دائمَةٍ) بە بەردەوامی (عَلَى النَّبِـيِّ) بۆ سەر پێغەمبەرەکەی خۆت (مُحَمَّدالْمُصْطَفَى)ﷺ، جا ئەو هەورە سەلاتو سەلام ببارێنێ بۆ سەر پێغەمبەرﷺ (بِمُنْهَلٍ) بە ڕێژنەو هەم (وَمُنْسَجِمٍ) بە نەرمی.

جا ئەو سەلاتو سەلامانە هەر بەردەوام بن (مَا) بە بەردەوامی ئەو ماوەیەی: کە (رَنَّحَتْ) دەجولێنێ (عَذَبَات الْبانِ) لقەکانی درەختی (بان)ی بۆنخۆش (رِيحُ صَبا) بای (صَبا)ی ڕۆژهەلاّت. واتە: تا دونیا ماوەو بای ڕۆژهەلاّت لقی درەختەکان دەجولێنێ، سەلاتو سەلام هەر لە سەر پێغەمبەرﷺ بن.

ثُمَّ الرِّضَا عَـنْ أَبِي بَكْرٍ وَعَـنْ عُمَرٍ * وَعَـنْ عَلِيٍّ وَعَـنْ عُثْمانَ ذِي الْكَرَمِ
وَالآلِ وَالصَّحْـبِ ثُمَّ التَّابِعِـينَ فَهُمْ * أَهْلُ التُّقَى وَالنَّقَى وَالْحِـلْمِ وَالْكَـرَمِ

جا ئیمامی (الْبُوصیري) ئاماژە بۆ ئەوە دەكا: كە پێویستە ئەم قەسیدەیە بە سەدا و ئاوازێكی خۆش بخوێندرێتەوەو دەفەرموێ:

(وَ) هەروەها سەلاتو سەلام بەردەوام بن: تا (أَطْرَبَ الْعِيسَ) وشترەكان دەهێنێتە جۆش‌و خرۆش (حَادِي الْعِيس) لێخوڕی وشترەكان (بِالنَّغَمِ) بە ئاواز و دەنگە خۆشەكەی. واتە: چونكە تەبیعەتی وشتر ئەوهایە: ئەگەر بە دەنگێكی خۆش سرودی بۆ بگوترێ، دێتە جۆش‌و خرۆش‌و خێراتر دەڕوا و هەست بە ماندووبوون ناكا ﴿عَـنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ في سَفَرٍ، وَكانَ مَعَهُ غُلامٌ أَسْوَدُ يُقالُ لَهُ: أَنْجَشَةُ يَحْـدُو، فَقالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَيْحَكَ يا أَنْجَشَةُ رُوَيْـدَكَ بِـالْقَوارِيرِ﴾رواه البخاري ومسلم، لـە سەفەرێكدا پێغەمبەر ﷺ كۆیلەیەكی ڕەشی لەگەڵدا بوو، پـێی دەگـوترا: (أَنْجَشَـة)، ئەم كۆیلەیە سرودی بۆ وشترەكان دەگوت، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ماڵوێران ئەی (أَنْجَشَةَ) مۆڵەتێك بدە وشترەكانو ئاگاداری شوشەكان بە.

واتە: ئەو ئافرەتانەی لە سەر پشتی وشترەكان سـوار بوینـە، وەكـو شوشـە ناسـكن، ئەگەر وشترەكان خێراتر بڕۆن، زیانیان پێ‌دەگا.

**جا بزانە:** لێرەدا قەسیدەی (الْبُرْدَة)ی ئیمـامی (الْبُوصـیري) كۆتـایی هـات، بـەڵام كەسێكی ڕێزدار چەند (بَیْت)ێكی لە سـەر زیـاد كـردون، ئێمـەش بـە كـورتی ئـەوانیش ڕوون دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى:

(ثُـمَّ) ئینجـا لـە دوای سـەلاتو سـەلام (الرِّضَـا) خودایـە ڕازی ببـە (عَـنْ) لـە ئیمـام (أَبِي بَكْـرٍ)و (وَعَـنْ) لـە ئیمـام (عُمَـرٍ)و (وَعَـنْ) لـە ئیمـام(عَلِـيّ) و (وَعَـنْ) لـە ئیمـام (عُثْمـان)ی (ذِي الْكَرَمِ) خـاوەن بەخشـین؟ چـونكە لـە دابینكردنـی پێویسـتیەكانی لەشكری (تَبُوك) لە هەموو (صَحابَة)كان باڵا دەستتربوو، كە پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: ﴿...مَنْ جَهَّزَ جَيْشَ الْعُسْرَةِ فَلَهُ الْجَنَّةُ. فَجَهَّزَهُ عُثْمـانُ رضي الله عنه﴾رواه البخاري في الوقف، هـەر كەسێك پێویستیەكانی (جَيْشُ الْعُسْرة)=لەشكری (تَبُوك) پێك بێنێ، بەهەشتی بۆ دەبـێ؟ جا ئیمام (عُثْمان) رضي الله عنه پێویستیەكانی لەشكرەكەی پێك هێنا.

(وَ) هـەروەها خودایـە ڕازی ببـە لـە (الآلِ) خزمـە موسـوڵمانەكانی پێغەمبـەر ﷺ (وَالصَّحْبِ) لە سـەحابەكانی پێغەمبـەر ﷺ (ثُـمَّ التَّـابِعِينَ) ئینجـا لـەو موسـوڵمانەی

بە دوای (صَحابَة)كاندا هاتون تا سێ سەدەی كۆچی تەواو دەبن، كە پێیان دەگوترێ: (السَّلَفُ الصّالِح) پێشینە باشەكان (فَهُمْ) چونكە ئەوانەیڕابردوو (أَهْلُ التُّقى) خاوەنی دڵێكی لەخواترسن (وَالنُّقى) خاوەنی دڵێكی پاكو بژاردەن (وَالْحِلْم) خاوەنی میهرەبانین (وَالْكَرَم) خاوەنی بەخشندەیین، كەواتە: ئەوانە بژاردەی ئۆممەتی پێغەمبەرنﷺ.

(يارَبِّ) هۆ خودای من (بِالْمُصْطَفى) بە خاتری (مُحَمَّد الْمُصْطَفى)ی پێغەمبەری خۆتﷺ (بَلِّغْ مَقاصِدَنا) بمانگەینە مەبەستەكانی خۆمان، واتە: ئاواتەكانمان، هەم لە دونیا و هەم لە قیامەت (وَاْغفِرْ لَنا) هەر بە خاتری پێغەمبەرﷺ لێمان خۆش ببە (مامَضى) لە گوناهەكانیڕابردوومان (يا واسِعَ الْكَرَمِ) هۆ ئەو خوایەی بەخشندەییو میهرەبانیت بەرفراوانە بۆ هەموو خەڵك.

**جا بزانە:** (تَوَسُّل)= پاڕانەوە لە خوا بە خاتری پێغەمبەرﷺ دروستە، چونكە (صَحابَة)كانﷺ كردویانە: هەم لە ژیانی پێغەمبەرداﷺ، هەم لە دوای وەفاتیشی:

١-(تَوَسُّل) لە ژیانی پێغەمبەرداﷺ: ﴿عَنْ عُثْمانَ بن حُنَيْفٍ﵁: أَنَّ رَجُلاً ضَرِيرَ الْبَصَرِ أَتَى النَّبِيَّﷺ، فَقالَ: أُدْعُ اللهَ أَنْ يُعافِيَنِي. قالَﷺ: إِنْ شِئْتَ دَعَوْتُ، وَإِنْ شِئْتَ صَبَرْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ. قالَ: فَادْعُهُ. فَأَمَرَهُﷺ: أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ وُضُوءَهُ، وَيَدْعُوَ بِهَذا الدُّعاءِ: (أَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍﷺ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ، يا مُحَمَّدُ إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى لِي، اَللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ)﴾حديث صحيح رواه ابن ماجه والترمذی، پیاوێكی كوێر گوتیە پێغەمبەرﷺ: دوعام بۆ بكە خوا چاوەكانم چاك بكاتەوە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر حەز دەكەی دوعات بۆ دەكەم، وە ئەگەر سەبر بگری باشترە. گوتی: دوعام بۆ بكە. ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێ كرد: دەستنوێژ بشوا و ئەم دوعایە بكا: (خوایە من لێت ئەپاڕێمەوەو ڕوو ئەكەمە لای تۆ بە خاتری پێغەمبەرەكەت (مُحَمَّدْ)ﷺ كە پێغەمبەرێكی ڕەحمەتە، (يا مُحَمَّدْ)ﷺ من بە خاتری تۆ ڕووم كردە لای خوا تاكو خوا ئەم كارەم بۆ بكا-چاوم چاك بكاتەوە- خوایە: خاتری پێغەمبەرﷺ وەربگرە لە كارەكەی مندا).

٢-(تَوَسُّل) لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ: ﴿وَعَنْ أَسْماءَ رضی الله عنها: هَذِهِ جُبَّةُ رَسُولِ اللهِﷺ كانَ يَلْبَسُها، فَنَحْنُ نَغْسِلُها لِلْمَرْضَى يُسْتَشْفَى بِها﴾رواه مسلم في اللباس، (أَسْماء) فەرمووی: ئەمە (جُبَّة)=كەوایەكەی پێغەمبەرەﷺ كاتی خۆی ئەیكردە بەر، ئێستاش

وَاغْفِرْ إلَهِي لِكُلِّ الْمُسْلِمِينَ بِمَا * يَتْلُونَ فِي الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى وَفِي الْحَرَمِ
بِجَاهِ مَنْ بَيْتُهُ فِي طَيْبَةَ حَرَمٌ * وَإسْمُهُ قَسَمٌ مِنْ أَعْظَمِ الْقَسَمِ

---

ئێمه بۆ نەخۆشەكان ئەیشۆین، تاكو بە ئاوشۆرەكەی شیفایان بۆ بێ‌و چاك ببنەوە.

هەم: ﴿عَن مالك الدَّار: أَصابَ النَّاسَ قَحطٌ في زَمَن عُمَر رضي الله عنه، فَجاءَ رَجُلٌ -وَهُوَ بِلالُ بن الْحَرْث الْمُزَنِيُّ الصَّحابيُّ ﷺ- إلَى قَبْرِ النَّبيِّ ﷺ فَقال: يَا رَسُولَ الله إسْتَسْقِ لأُمَّتِكَ فَإنَّهُمْ قَدْ هَلَكُوا...﴾ الحديث، رواه البيهقي وابن أبي‌شيبة بإسناد صحيح، وذكره الحافظ العسقلاني في (فتح الباري، باب الإستسقاء)، والحافظ ابن كثير في (البداية والنهاية، عام الرّمادة)، لە سەردەمی ئیمام (عُمَر رضي الله عنه) لە (عام الرَّمادَة)دا قاتی‌و بێبارانی توشی خەڵك بوو، (صَحابَة)یەك -كە (بِلاَلُ بنِ الْحَرْثِ الْمُزَنِيُّ) بوو ﷺ- هاتە سەر گۆڕی پێغەمبەر ﷺ گوتی: (یَا رَسُولَ الله) دوعای باران بۆ ئوممەتت بكە، چونكە بە هیلاك چون.

(وَاغْفِرْ إلَهِي) ئەی خودای من خۆش ببە (لِكُلِّ الْمُسْلِمِينَ) لە هەموو موسوڵمانان (بِمَا) بە خاتری ئەو قورئانەی (يَتْلُونَ) موسوڵمانەكان دەیخوێنن (فِي) لە (الْمَسْجِدِ الأَقْصَى)= (بَيْت الْمُقَدَّس) لە (فَلَسْطِين)، هەم (وَفِي الْحَرَمِ) لە (حَرَم)ی (مَكَّة)ی پیرۆزیش دەیخوێنن.

(بِجَاهِ مَنْ) بە خاتری شكۆمەندی ئەو پێغەمبەرەی ﷺ (بَيْتُهُ) ماڵەكەی وی= مزگەوتەكەی (فِي طَيْبَةٍ) لە (مَدينَة)ی پیرۆزدا (حَرَمٌ) حەرامكراو و ڕیزدارە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إنَّ إبْراهيمَ ﷺ حَرَّمَ مَكَّةَ وَدَعَا لأَهْلِهَا، وَإنِّي حَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ كَما حَرَّمَ إبْراهيمُ مَكَّةَ...﴾ رواه مسلم، (إبْراهيم) پێغەمبەر ﷺ (مَكَّة)ی حەرام كردوە= ڕێزی لێناوەو دوعای بۆ دانیشتووەكانی كردوە: ئەمین بن‌و خوا ڕزقیان بداتێ. منیش (مَدِينَة)م حەرام كردوە= ڕێزم لێناوە، هەروەك (إبْراهِيم) ﷺ (مَكّة)ی حەرام كردوە.

**ئێنجا بزانە:** خوای گەورە ناوی لە (مَدينَة)ی پیرۆز ناوە (طابَة)، پێغەمبەریش ﷺ ناوی ناوە (طَيْبَة)، هەروەك لە (صحيح مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

جا بۆیش لێرەدا باسی ئەو سێ جێیانەی كرد، چونكە لە هەموو شوێنێكی سەرزەمین ڕێزدارترن، هەریەكەیان بە پلەی خۆی، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿صَلاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلاة فِيما سِواهُ إلاّ الْمَسْجِدَ الْحَرامَ﴾ رواه البخاري ومسلم، زاد ابن ماجه والبزار: ﴿وَصَلاَةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ مِأَة أَلْفِ صَلاَة فِيمَا سِوَاهُ﴾

والبيهقي والبزار: ﴿وَفِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَمْسُمِأَة صَلاَةٍ﴾ يەك نوێژ لـە نـاو مزگـەوتی منـدا خێری زیاترە لە هەزار نوێژ لە ناو مزگەوتـەکانـیتـردا جگـە لـە (اَلْمَسْـجِدُالْحَرام)ی (مَكَّة)، چونکە یەك نوێژ لە (اَلْمَسْجِدُالْحَرام)دا خێرتـرە لـە سـەد هـەزار نوێـژی لـە مزگەوتەکانیتردا، هەم یـەك نوێـژ لـە (بَيْـتِ الْمُقَـدَّسِ)= (مَسْجِدُاْلأَقْصَـى)دا خێـری بە پێنجسەد نوێژە.

(وَ) هـەروەها (اِسْمُهُ) نـاوی ئـەو پێغەمبـەرەﷺ (قَسَمٌ) سـوێندە، واتـە: سـوێند پێخوراوە (مِنْ أَعْظَمِ الْقَسَمِ) لە گەورەترین سـوێندە، چـونکە سـوێندخۆرەکە خـوای گەورەیەو لـە هـەموو شـتێك گـەورەترە، سـوێند پێخوراوەکـەش پێغەمبـەرەﷺو لـە هەموو خەڵك گـەورەترە ﴿عَنِ ابْنِ عَبّاسٍ رضي الله عنهما: ماخَلَقَ اللهُ تَعالَى نَفْساً أَكْرَمَ عَلَيْهِ مِنْ مُحَمَّدٍﷺ وَما حَلَفَ اللهُ تَعالَى بِحَيَاةِ أَحَدٍ قَطُّ إلاّ بِحَيَاةِ مُحَمَّدٍﷺ، قالَ تَعالَى: (لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ)الحجر:٧٢﴾رواه أبويعلى وابن مردويه والبيهقي وابونعيم، خوای گـەورە هیچ کەسێکی دروست نەکردوە: کە لە لای خـۆی ڕێزدارتـر بـێ لـە پێغەمبـەرﷺ، خوای گەورە بە ژیانی هیچ کەسێك سوێندی نەخواردوە تەنها بـە ژیـانی پێغەمبـەرﷺ نەبێ، خوای گەورە لە سوێندەکەیدا دەفەرموێ: (بە ژیانی تۆ- ئەی مُحَمَّدﷺ- ئـەو کافرانە لە گومڕاییخۆیاندا دەجولێنەوە).

﴿ئاگاداری﴾ ئەوەی ڕابردوو سوێندخواردنی خوای گەورە بوو بە دروستکراویخـۆی، هەروەك لە چەند ئایەتێکیتری قورئاندا خوای گەورە سوێندی بـە دروسـتکراویخـۆی خـواردوەو دەفـەرموێ: (وَالْفَجْرِ)، (وَاللَّيْلِ)، (وَالنَّهارِ)، (وَالشَّمْسِ)، (وَالْقَمَرِ)...هتـد، بەڵام بۆ ئێمـە دروسـت نیـە سـوێند بـە دروسـتکراوی خـوا بخۆین: وەك سـوێندم بـە پێغەمبەرﷺ، یان بە فلانە پیاوچاکە، یان بـە قـەبری پێغەمبـەرﷺ، یـان بـە قـەبری فلانە پیاوچاکە، یان بە سەری باوکم، یان بە قەبری باوکم.

کەواتە: ئەو جۆرە سوێندانە ناپەسندن، بەڵکو ئیمامی (الشافعي)و چەند زانایـەکیتـر بە گوناهیان داناوەو سوێندخۆرەکە گوناهبار دەبێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿أَلاَ إِنَّ اللهَ-عَزَّ وَجَـلَّ- يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ تَعَالَى﴾ رواه الشيخان، ئاگادار بن خوای گەورە ئێوە قەدەغە دەکـا: سـوێند بـە سـەری باوکتـان بخۆن، جا هەر کەسێك سوێند دەخوا با سوێند بە خوای گەورە بخوا.

**جا بزانە:** ئەگەر سوێندخۆرەکە مەبەستی ئەوە بێ: سوێند پێخوراوەکە وەکو خوا

وَهَـــذِهِ بُرْدَةُ الْمُخْــتارِ قَدْ خُــتِمَتْ * وَالْحَمْدُ لِلَّـــهِ فِـــي بَدْءٍ وَفِي خَـــتَمِ
أَبْياتُهَا قَـــدْ أَتَتْ سِــتِّينَ مَـــعْ مِـــأَةٍ * فَـــرِّجْ بِها كَرْبَنَا يا واسِـــعَ الْكَـــرَمِ

به گەورە دابنێ، ئەو کاتە کافر دەبێ، هەروەك لە کتێبەکانی مەزهەبی (الشافعي)دا فەرمویانە؟ چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ أَشْــرَكَ﴾ رواه أبوداود وغيره بسند حسن، هەر کەسێك سوێند بخوا بە شتێکی جگە لە خوا، ئەوە هاوبەشی بۆ خوا داناوەو کافر دەبێ.

(وَهَذِهِ) ئەم قەسیدەیە (بُرْدَةُ الْمُخْتارِ) ناوی (بُرْدَة)ی پێغەمبەری بژاردەیەﷺ، چونکە لە خەوندا پەشتەماڵەکەی خۆی لە ئیمامی (الْبُوصيري) وەرپێچا، هەروەك لە پێشەکیدا باسمان کرد (قَدْ خُتِمَتْ) قەسیدەکە تەواو کرا (وَالْحَمْدُ لِلَّهِ) حەمد و سوپاس بۆ خوا (فِي بَدْءٍ) لە دەستپێکردنیدا، هەم (وَفِي خَتْمٍ) لە تەواو کردنیدا. (أَبْياتُهَا) هۆنراوەکانی ئەم قەسیدەیە (قَدْ أَتَتْ سِتِّينَ مَعْ مِأَةٍ) گەیشتە سەدو شەست (بَيْت) * (فَرِّجْ بِها كَرْبَنَا) بەم قەسیدەیە خەمو خەفەتمان بروێنە (يَا واسِعَ الْكَرَمِ) هۆ ئەو خوایەی بەخشندەیی‌و میهرەبانیت بەرفراوانە بۆ هەموو خەڵك...کۆتایی.

اَلْحَمْدُ لله، [مانگی شەوی چواردە * ڕوونکردنەوەی قەسیدەی (الْبُرْدَة)] تەواو بوو، لە ماڵی خۆم لە شاری هەولێر، لە شەوی سێشەممە(١٧) حەفدەی مانگی مەولودی پێغەمبەرﷺ ساڵی (١٤٣٤) هەزارو چوار سەدو سی وچواری کۆچی، بەرامبەر(٩)ی ڕێبەندان، ساڵی (٢٧١٢)ی کوردیو (٢٩)ی کانونی دووەمی ساڵی (٢٠١٣)ی زایینی.

منیش بەندەی گوناهبار و بێدەسەڵات: (عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی)م، خودا لە خۆمو دایکمو باوکمو خۆشەویستەکانم خۆش ببێو بەر شەفاعەتی پێغەمبەرمانﷺ بێخیو بە بەهەشت شادمان بکا، آمین، وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدنا مُحَمَّد وَآله وَصَحْبه أَجْمَعِــينَ، وَالْحَمْدُ للَّه رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ، سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِه سُبْحانَ اللهِ الْعَظِيمِ.

هەولێر – کوردستان

(١٧)ی ربيع الاول – (١٤٣٤)ی کـــۆچی

(٩)ی ڕێبـــەندان – (٢٧١٢)ی کـــوردی

(٢٩)ی کانون الثاني – (٢٠١٣)ی زایینی

# الْقَصِيدَةُ الْمُضَرِيَّةُ فِى الصَّلاةِ عَلَى خَيْرِ الْبَرِيَّةِ سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ ﷺ

## للإمام مُحَمَّد الْبُوصيرِي

يا رَبِّ صَلِّ عَلَى الْمُخْتارِ مِنْ مُضَرٍ * وَالأَنْبِيا وَجَمِيعِ الرُّسْلِ مَا ذُكِرُوا

وَصَلِّ رَبِّ عَلَى الْهَادِى وَشِيعَتِهِ * وَصَحْبِهِ مَنْ لِطَيِّ الدِّينِ قَدْ نَشَرُوا

وَجَاهَدُوا مَعَهُ فِى اللهِ وَاجْتَهَدُوا * وَهَاجَرُوا وَلَهُ آوَوْا وَقَدْ نَصَرُوا

وَبَيَّنُوا الْفَرْضَ وَالْمَسْنُونَ وَاعْتَصَبُوا * لِلَّهِ وَاعْتَصَمُوا بِاللهِ فَانْتَصَرُوا

أَزْكَى صَلاةٍ وَأَنْمَاهَا وَأَشْرَفَهَا * يُعَطِّرُ الْكَوْنَ رَيًّا نَشْرِهَا الْعَطِرُ

مَعْبُوقَةً بِعَبِيقِ الْمِسْكِ زَاكِيَةً * مِن طِيبِهَا أَرَجُ الرِّضْوَانِ يَنْتَشِرُ

عَدَّ الْحَصَى وَالثَّرَى وَالرَّمْلِ يَتْبَعُهَا * نَجْمُ السَّمَا وَنَبَاتُ الأَرْضِ وَالْمَدَرُ

وعَدَّ وَزْنِ مَثَاقِيلِ الْجِبَالِ كَمَا * يَلِيهِ قَطْرُ جَمِيعِ الْمَاءِ وَالْمَطَرُ

وَعَدَّ مَا حَوَتِ الْأَشْجَارُ مِنْ وَرَقٍ * وَكُلِّ حَرْفٍ غَدَا يُتْلَى وَيُسْتَطَرُ

وَالْوَحْشِ وَالطَّيْرِ وَالأَسْمَاكِ مَعْ نَعَمٍ * يَلِيهِمُ الْجِنُّ وَالْأَمْلاكُ وَالْبَشَرُ

وَالذَّرُّ وَالنَّمْلُ مَعْ جَمْعِ الْحُبُوبِ كَذا * وَالشَّعْرُ وَالصُّوفُ وَالأَرْيَاشُ وَالْوَبَرُ

وَمَا أَحَاطَ بِهِ الْعِلْمُ الْمُحِيطُ وَمَا * جَرَى بِهِ الْقَلَمُ الْمَأْمُورُ وَالْقَدَرُ

وَعَدَّ نَعْمَائِكَ اللَّاتِي مَنَنْتَ بِهَا * عَلَى الْخَلائِقِ مُذْ كَانُوا وَمُذْ حُشِرُوا

وَعَدَّ مِقْدَارِهِ السَّامِي الَّذِى شَرُفَتْ * بِهِ النَّبِيُّونَ وَالأَمْلاكُ وَافْتَخَرُوا

وَعَدَّ مَا كَانَ فِي الْأَكْوَانِ يَا سَنَدِى * وَمَا يَكُونُ إِلَى أَنْ تُبْعَثَ الصُّوَرُ

فِي كُلِّ طَرْفَةِ عَيْنٍ يَطْرِفُونَ بِهَا * أَهْلُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِينَ أَوْ يَذَرُوا

مِلْءَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِينَ مَعْ جَبَلٍ * وَالْفَرْشِ وَالْعَرْشِ وَالْكُرْسِى وَمَا حَصَرُوا

مَا أَوْجَدَ اللهُ مَعْدُوماً وَأَعْدَمَهُ * بَعْدَ الْوُجُودِ صَلاةً لَيْسَ تَنْحَصِرُ

تَسْتَغْرِقُ الْعَدَّ مَعْ جَمْعِ الدُّهُورِ كَمَا * تُحِيطُ بِالْحَدِّ لا تُبْقِى وَلا تَذَرُ

لا غَايَةً وَانْتِهَاءً يَا عَظِيمُ لَهَا * وَلا لَهَا أَمَدٌ يُقْضَى فَيُعْتَبَرُ

وَعَدَّ أَضْعَـاف ما قَـدْ مَرَّ مِنْ عَـدَد * مَعْ ضعْف أَضْعافه يَا مَنْ لَـهُ الْقَـدَرُ
كَمَا تُحِبُّ وَتَرْضَى سَـيِّدى وَكَمَـا * أَمَرْتَنـا أَنْ نُصَـلِّى أَنْـتَ مُقْتَـدِرُ
مَـعَ السَّـلامِ كَمَا قَـدْ مَرَّ مِنْ عَدَدٍ * رَبِّ وَضاعِفْهُمَا وَالْفَضْـلُ مُنْتَشِـرُ
وَكُلُّ ذَلِكَ مَـضْرُوبٌ بِحَـقِّكَ فِـى * أَنْفاسِ خَلْقِكَ إِنْ قَلُّـوا وَإِنْ كَثُـرُوا
يا رَبِّ وَاغْـفِرْ لِقارِيهَا وَسَـامِعِـهَا * وَالْمُسْلِمِينَ جَمِيعاً أَيْنَمَـا حَضَـرُوا
وَوالِـدِينـا وَأَهْـلِينـا وَجِـيرَتِنـا * وَكُلُّنَـا سَـيِّدى لِلْعَفْـوِ مُفْتَقِـرُ
وَقَـدْ أَتَيْتُ ذُنُوباً لا عِـدادَ لَهـا * لَكِـنَّ عَفْـوَكَ لا يُبْقِـى وَلا يَـذَرُ
وَالْهَـمُّ عَنْ كُلِّ مَا أَبْغِـيهِ أَشْـغَلَنِى * وقَدْ أَتَى خاضِعاً وَالْقَلْـبُ مُنْكَسِـرُ
أَرْجُـوكَ يا رَبِّ فِي الدَّارَيْنِ تَرْحَـمُنا * بِجاهِ مَنْ فِي يَدَيْـهِ سَـبَّحَ الْحَجَـرُ
يا رَبِّ أَعْـظِمْ لَنا أَجْـراً ومَغْفِـرَةً * فَإِنَّ جُـودَكَ بَحْـرٌ لَـيْسَ يَنْحَصِـرُ
وَاقْـضِ دُيُوناً لَها الْأَخْلاقُ ضَـائِقَةٌ * وَفَرِّجِ الْكَرْبَ عَنَّـا أَنْـتَ مُقْتَـدِرُ
وَكُـنْ لَطِـيفاً بِنَا فِـى كُلِّ نازِلَـةٍ * لُطْفَاً جَمِيلاً بِـهِ الْأَهْـوالُ تَنْحَسِـرُ
بِالْمُصْطَفَى الْمُجْتَبَى خَـيْرِ الأَنامِ ومَنْ * جَلالَةً نَزَلَتْ فِـى مَدْحِـهِ السُّـوَرُ
ثُمَّ الصَّـلاةُ عَلَى الْمُخْـتارِ ما طَلَعَتْ * شَمْسُ النَّهارِ وَما قَدْ شَعْشَعَ الْقَمَـرُ
ثُمَّ الرِّضَـا عَـنْ أَبِى بَكْرٍ خَلِيفَـتِهِ * مَنْ قامَ مِنْ بَعْـدِهِ لِلـدِّينِ يَنْتَصِـرُ
وَعَنْ أَبِى حَفْصٍ الْفَـارُوقِ صاحِـبِهِ * مَنْ قَوْلُهُ الْفَصْلُ فِى أَحْكامِـهِ عُمَـرُ
وَجُدْ لِعُثْمانَ ذى النُّورَيْنِ مَنْ كَمُلَتْ * لَهُ الْمَحاسِنُ فِي الـدَّارَيْنِ وَالظَّفَـرُ
كَذَا عَـلِيٌّ مَـعَ ابْنَيْـهِ وَأُمِّـهِمـا * أَهْلُ الْعَباءِ كَمَا قَـدْ جاءَنـا الْخَبَـرُ
سَـعْدٌ سَعِيدُ ابْنُ عَوْفٍ طَـلْحَةٌ وَأَبُو * عُبَيْدَةَ وزُبَيْـرٌ سَـادَةٌ غُـرَرُ
وَحَـمْزَةٌ وَكَذَا الْعَبَّـاسُ سَـيِّدُنَـا * وَنَجْلُهُ الْحَبْرُ مَنْ زَالَتْ بِـهِ الْغِيَـرُ
وَالْآلُ وَالصَّـحْبُ وَالْأَتْبَاعُ قاطِـبَةً * ما جَـنَّ لَيْلُ الدَّياجِى أَوْ بَدا السَّـحَرُ

* * *

مُحَمَّدٌ أَشْرَفُ الأَعْرَابِ وَالْعَجَمِ * مُحَمَّدٌ خَيْرُ مَنْ يَمْشِي عَلَى قَدَمِ
مُحَمَّدٌ بَاسِطُ الْمَعْرُوفِ جَامِعُهُ * مُحَمَّدٌ صَاحِبُ الإِحْسَانِ وَالْكَرَمِ
مُحَمَّدٌ تَاجُ رُسْلِ اللهِ قَاطِبَةً * مُحَمَّدٌ صَادِقُ الأَقْوَالِ وَالْكَلِمِ
مُحَمَّدٌ ثَابِتُ الْمِيثَاقِ حَافِظُهُ * مُحَمَّدٌ طَيِّبُ الأَخْلَاقِ وَالشِّيَمِ
مُحَمَّدٌ رُوِيَتْ بِالنُّورِ طِينَتُهُ * مُحَمَّدٌ لَمْ يَزَلْ نُوراً مِنَ الْقِدَمِ
مُحَمَّدٌ حَاكِمٌ بِالْعَدْلِ ذُو شَرَفٍ * مُحَمَّدٌ مَعْدِنُ الإِنْعَامِ وَالْحِكَمِ
مُحَمَّدٌ خَيْرُ خَلْقِ اللهِ مِنْ مُضَرٍ * مُحَمَّدٌ خَيْرُ رُسْلِ اللهِ كُلِّهِمِ
مُحَمَّدٌ دِينُهُ حَقٌّ نَدِينُ بِهِ * مُحَمَّدٌ مُجْمِلاً حَقّاً عَلَى عَلَمِ
مُحَمَّدٌ ذِكْرُهُ رُوحٌ لأَنْفُسِنَا * مُحَمَّدٌ شُكْرُهُ فَرْضٌ عَلَى الأُمَمِ
مُحَمَّدٌ زِينَةُ الدُّنْيَا وَبَهْجَتُهَا * مُحَمَّدٌ كَاشِفُ الغُمَّاتِ وَالظُّلَمِ
مُحَمَّدٌ سَيِّدٌ طَابَتْ مَنَاقِبُهُ * مُحَمَّدٌ صَاغَهُ الرَّحْمَنُ بِالنِّعَمِ
مُحَمَّدٌ صَفْوَةُ الْبَارِى وَخِيرَتُهُ * مُحَمَّدٌ طَاهِرٌ مِنْ سَائِرِ التُّهَمِ
مُحَمَّدٌ ضَاحِكٌ لِلضَّيْفِ مُكْرِمُهُ * مُحَمَّدٌ جَارُهُ وَاللهِ لَمْ يُضَمِ
مُحَمَّدٌ طَابَتِ الدُّنْيَا بِبِعْثَتِه * مُحَمَّدٌ جَاءَ بِالآيَاتِ وَالْحِكَمِ
مُحَمَّدٌ يَوْمَ بَعْثِ النَّاسِ شَافِعُنَا * مُحَمَّدٌ نُورُهُ الْهَادِى مِنَ الظُّلَمِ
مُحَمَّدٌ قَائِمٌ لِلَّهِ ذُو هِمَمٍ * مُحَمَّدٌ خَاتِمٌ لِلرُّسْلِ كُلِّهِمِ

* * *

# ناوەڕۆکی ڕوونکردنەوەی (قَصِيدَةُ الْبُرْدَة)

شاعیری پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی (حسّان بن ثابت رضي الله عنه) فەرمویەتی:

وَضَمَّ الإِلَهُ اسْمَ النَّبِيِّ ﷺ إِلَى اسْمِهِ
إِذْ قالَ فِي الْخَمْسِ الْمُؤَذِّنُ: أَشْهَدُ
وَشَقَّ لَهُ مِنْ اسْمِهِ لِيُجِلَّهُ
فَذُو الْعَرْشِ مَحْمُودٌ وَهَذا مُحَمَّدُ ﷺ

خوای گەورە ناوی پێغەمبەری ﷺ وەگەڵ ناوی خۆی داوە، ئەو کاتەی بانگدەر لە هەر پێنج نوێژەکاندا دەڵێ: (أشْهَدُ أَنْ لاَّ اِلَهَ اِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ).
خوای گەورە بۆ پێغەمبەر ﷺ ناوێکی لە ناوی خۆی دەرهێناوە، چونکە خودای خاوەن (عَرْش) سوپاسکراوە، پێغەمبەریش ﷺ سوپاسکراوە.

نرخی: (٢٥٠٠) دینار

بۆ فرۆشتنی ئەم کتابە بە کۆ پەیوەندی بکە بە: ٠٧٥٠٣٤٧١١٩٣

چاپخانەی رۆژهەڵات/هەولێر